

دوکتۆر مارف خەزنەدار

# مێژووی ئەدەبی کوردی

بەرگی یەکەم

لە سەرەتاوە تا سەدەی چواردەم



ئەم بەرهەمە هێنانەدی پرۆژەی نووسینەوەی
مێژووی ئەدەبی کوردییە لە سەرەتاوە
تا ناوەڕاستی سەدەی بیستەم



# مێژووی ئەدەبی کوردی

ئەم بەرهەمە هێنانەدی پڕۆژەی نووسینەوەی
مێژووی ئەدەبی کوردی‌یە لە سەرەتاوە
تا ناوەڕاستی سەدەی بیستەم

بەرگی یەکەم

لەسەرەتاوە تا سەدەی چواردەم

**دوکتۆر مارف خەزنەدار**

دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی
**ئاراس**

زنجیرەی رۆشنبیری

**خاوەنی ئیمتیاز: شەوکەت شێخ یەزدین**

**سەرنووسەر: بەدران ئەحمەد حەبیب**

* * *

کتێب: مێژووی ئەدەبی کوردی - بەرگی یەکەم
دانانی: د. مارف خەزنەدار
بڵاوکراوەی ئاراس- ژمارە: ٥٤
بەرگ: شکار عەفان نەقشبەندی
دەرهێنانی هونەری: دلاوەر صادق ئەمین
نووسینی بەرگ: خۆشنووس محمەد زادە
پیت لێدان: نسار عەبدوڵڵا حەسەن
چاپی یەکەم - چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە
هەولێر- ٢٠٠١
لە کتێبخانەی بەرێوەبەرایەتیی گشتیی رۆشنبیری و هونەر
ژمارە (١٤٤)ی ساڵی ٢٠٠١ دراوەتێ

* * *

# پێشەکی

بیرکردنەوەم لە «مێژووی ئەدەبی کوردی» دەگەڕێتەوە سەردەمی منداڵی، هەر لەوساوە گیرۆدەی شیعر بووم، شیعر بە لامەوە لە ئاسمان دەهاتە خوارەوە، شاعیریش نێرراوی خودا بوو لەسەر زەوی. دیوانی شاعیرانی کورد، چاپی کوردی - مەریوانی و هی تر لە سی‌یەکان دا لە دەلاقەکانی ماڵماندا بوون. لەوەش گرنگتر کۆبوونەوەکانی شەوانی هەینی‌ی زستانی درێژ بوو: غەزەلێکم بۆ بخوێنەوە! غەزەلی چاکە! مخابن نالی کورد بوو، ئەگەر کورد نەبوایە ناوو ناوبانگی هەر چوار ئیقلیمی دەگرتەوە، لە هەموویان شاعیرترە، بە ئانقەست شیعری بە کوردی ووتوە، بڕیاری دابوو شار بەجێ بێڵێ، ویستی میراتی بەزمانی کوردی بێ چونکە خەڵکی سلێمانی زمانی تریان نەدەزانی. حاجی کەرامەتی هەبوو، باسی شەمەندەفەری کردووە، لە بورجی ئیفێل دوواوە، گەلێ پرسی تریش.

لەدوا پلەی خوێندنی سەرەتایی (پۆلی شەشەم) کە هێشتا منداڵ بووم شیعری کوردیم گۆڕی‌یە سەر زمانی عەرەبی (لەخەو هەڵسن درەنگە...). لەدوا پلەی خوێندنی ناوەندی (پۆلی پێنجەم) بەرکوڵی «مێژووی ئەدەبی کوردی»م بەزنجیرە ووتارێک لە بابەت ژیان و بەرهەمی شاعیرانی کورد بە زمانی عەرەبی لە ڕۆژنامەی «هەولێر - أربيل» (١٩٥٠ – ١٩٥٣) بڵاوکردەوە. لەو سەردەمەوە تا ئێستا خەریکی هێنانەدی ئەم کارەم ئەوەی ئێستا لەبەر دەستی خوێندەواری کورد دایە.

هەموو بڵاوکراوەکانم لە بابەت مێژووی ئەدەبی کوردی‌یەوە لە کتێب و باس و ووتار بە پرۆژە و کەرەستە و سەرچاوە دادەنێم بۆ ئەم کارە، تەنانەت «مێژووی ئەدەبی کوردی تازە»شم (١٩٦٧) کە بە زمانی رووسی لە مۆسکۆ بڵاو کراوەتەوە، ئەم زانیاری‌یانەی ڕاستەوخۆ یا ناڕاستەوخۆ چوونەتە ناو ئەم کتێبەوە و لەناوی‌دا تواونەتەوە، بەڵام کارەکان وەکو بەرهەمێکی زانستی لەناو بیبلیوگرافیای ئەدەبی کوردی هەر ماونەتەوە.

ماوەی ١٩٦٨ – ١٩٨١ لە کۆلێجی ئەدەبیاتی زانستگای بەغدا، سەردەمی کۆکردنەوەی کەرەستە بوو بۆ ئەم کارە، نەک نووسینەوەی. بەڵام ماوەی ١٩٨٣ – ١٩٨٨ لە ئامۆژگای زمان و ئەدەبی عەرەبی لە زانستگای عەننابەی جەزائیر سەردەمی بیرکردنەوەو نووسینەوە بوو.

کۆمەڵێکی هێمن و لەسەرخۆ بوو، ژیانی زانستگا ئازاد و سەربەست بوو، ساڵی هەشت مانگ لە زانستگا لەگەڵ ئەدەبی کوردی، چووار مانگیش لە نامەخانەو مۆزە هەرە

گەورەکانی هەموو ئەوروپا. پێنج ساڵی ژیانی سەرووی ئەفەریقا و ئەوروپا نەبووایە ئەم «مێژووی ئەدەبی کوردی»یەم بۆ تەواو نەدەکرا.

کارێکی بەجێ دەبوو ئەگەر بە کورتی مێژووی مێژووی ئەدەبی کوردی، واتە پیشان دان و شیکردنەوەی سەرچاوەو کەرەستەکان بخرانایە ڕوو، بەڵام بەبێ ئەوەش ئەم کتێبە کارێکی بەجێیە. ئەوەی ڕێگەی لێگرتین و ئەم کارەمان بۆ هەڵنەسووڕا ئەم هۆیانەی خووارەوە بوون:

١- بەشێک لەو کارانەی بوون بەسەرچاوەو کەرەستە بۆ نووسینەوەی مێژووی ئەدەبی کوردی لەسەر بنج و بناوانی مێتۆدێکی دیاری کراو دانەمەزراوون.

٢- بەشێکی تر لەسەر مێتۆدێک دامەزراوون کە پیاو ناتوانێ گیانی ڕاستەقینەی ئەدەبی کوردی پێ بکێشێ، چونکە ئەدەبی کوردی یا لە دەرەوەی ئەو مێتۆدەیە، یا هەندێ لێی نزیک بۆتەوە، بەڵام بە تەواوی لەناوی دا نی‌یە.

٣- هەندێکی دیکە ڕووداوی دروست کراوە، شیعر دانراوە خاوەنی نی‌یە، بە هەوای سێ چوار دیالێکتی زمانی کوردی ڕێک خراوە! ئەمە ڕەسەن نی‌یە و دروست کراوە بۆیە وەرناگیرێ چونکە زمان ڕووداوێکی کۆمەڵایەتی‌یە، نە بە فەرمان دروست دەکرێ و نە لەکارخانەش دادەڕێژرێ.

٤- لە کۆمەڵێکی تردا، شاعیر دروست کراوە، ناوی لێنراوەو شیعری بۆ دانراوە، گۆیا شیعرەکە کوردی‌یە و گوڕڕاوەتە سەر زمانێکی تر، کەچی تێکستە کوردی‌یەکە نەماوە. ڕەنگە یەکێک بڵێ: پێویستە لەبەر ڕۆشنایی ئەو شیعرە بڕیار لەسەر ئەو لایەنەی ئەدەبی کوردی بدەین بە شێوەیێکی وەختی، با تێکستە کوردی‌یەکەش جارێ لەبەر دەستمان دا نەبێ. بەڵام ئێمە دەڵێین ڕاستتر ئەوەیە با جارێ ئەو شیعرە بخەینە لاوە چونکە تێکستە کوردی‌یەکە لەبەر دەستدا نی‌یە، هەر کاتێکی ئەگەر تێکستە کوردی‌یەکە بدۆزرێتەوە، ئیتر بە بەرگی ڕەسەنی خۆی دێتە ناو ئەدەبەوە، لە هەموو بارێکیشدا ئێمە مێژووی ئەو بەرهەمە دەنوسینەوە کە بە کوردی نوسراوە.

٥ - بەشێکی تر ئەنجامی بیروڕایان لە بنەڕەت دا لەگەڵ بیروڕای ئێمە ڕێک ناکەوێ چونکە یەکێتی‌ی بیر لە نووسینەکانیان دا بەدی ناکرێ.

٦- هەندێکی تر تێبینی و قسەی سەر پێ‌یی و ئەم لاو ئەولایی‌یە و لەزانست و داهێنان‌دا بێ‌بەشە.

٧- بەشێکی تر زانیاریی وەرگیراوەو لەمەو پێش چەند جارێک ووتراوە و هیچی تازەی تێدا نییە، بە تایبەتی ئەو شتانەی لە زمانانی ئەوروپاییەوە وەرگیراوون و زۆربەی خوێندەواری کوردی ئاگای لێیان نییە. ئەگەر ئێمە بەڕاستی و زانستیانە بچووینایە ناو هەڵسەنگاندنی هەموو ئەو سەرچاوە و کەرەستانەی بۆ ئەم کارە بەکار هاتوون دەبوو ئەم بەرگانەی کە ناومان ناوون «مێژووی ئەدەبی کوردی» ناویان بنێین «مێژووی مێژووی ئەدەبی کوردی» یا «هەڵسەنگاندنی سەرچاوە و کەرەستەی مێژووی ئەدەبی کوردی» لەبەر ئەوە خۆمان لەمە لادا.

ئینجا ناڵێین هەرچی لە بابەت ئەدەبی کوردییەوە هەیە چاومان بەهەموویان کەوتووە، بەڵام ئەوە دەڵێین کە زۆربەی هەرە زۆری بینراوە، ئەم زۆربەی هەرە زۆرییەش دیارە کارە نایاب و گەورەو دیارەکان دەگرێتە خۆی.

ئیتر ئێمە لەبەر تیشکی ئەم تێبینییانەی لای خووارەوە تەماشای سەرچاوەو کەرەستەکانمان کردووە:

١- هەر بیروڕاو بڕیارێکی کە بە هەڵەمان داناوە پشت گوێ خراوە، چونکە مەبەس نووسینەوەی مێژووی ئەدەبە نەک ڕەخنە و تیۆرییەکانی و بەراووردکاری و ئەدگارەکانی.

٢- هەوڵمان نەداوە ڕووداوی دروست کراو ڕەت بکەینەوە، چونکە ڕاستی لەوە دایە پشت گوێ بخرێ.

٣ - بەگشتی خۆمان بە بیروڕای زانایانی ئەدەبی کوردییەوە خەریک نەکردووە لە بارەی لە دایک بوون و سەردەمی ژیان و کۆچی دووایی شاعیر و نووسەرانەوە، لەسەر ئەم باسە نەڕۆیشتووین و بیروڕای جیاوازمان نەخستۆتە ڕوو، بەڵکو ئەوەی بەلامانەوە ڕاست بووە، هەر ئەوەمان وەرگرتووە. دەبێ ئەوەش بڵێین کە خۆشمان دەورمان بووە لە ساغ کردنەوەی سەردەمی ژیانی هەندێ لە شاعیرانی کورد.

هەموو ئەو بەرهەمە ئەدەبییانەی لەم کتێبەدا خراونەتە ڕوو و بە نموونە هێنراونەتەوە بەلای ئێمەوە بەرزترین «قسەی جووانی زمانی کوردی»ن، دیارە مەبەسی ئەم کتێبەش نووسینەوەی مێژووی ئەو بەرهەمەیە بە پیشان دانی جووانترین نموونەی ئەو ئەدەبە ئەمەش ئەوە ناگەیێنێ کە بەڵگەکانی ناو ئەم کتێبە «قسەی جووانی» بەرهەمی ئەدەبی هەموو ئەدەبی کوردین.

ئێمە هەرگیز بەلای ئەو نموونانەوە نەچووین کە پێمان جوان نەبوون، چونکە خستنە رووی ئەو بەرهەمانەی کاریان لە هەست و نەستی ئێمە نەکردووە دەبێ بەچاوی ڕەخنەوە لێیان بکۆڵینەوە و بیانخەینە ڕوو و بەڵگەش بە دەستەوە بدەین بۆچ جوان نەبوون! و بۆچ نەچوونە دڵمانەوە! ئیتر ئەم مەسەلەیە لە چوار چێوەی مێژووی ئەدەب دەچێتە دەرەوەو دەبێ بە ڕەخنە یا مێژووی ڕەخنە، دیارە ئەمەش جێگەی تری خۆی هەیە.

لەم «مێژووی ئەدەبی کوردی»یەدا رەچاوی هەر سێ جەوهەرەکە کراوە کە دەبنە بەردی بناغەی نووسینەوە بەرهەمی جوان، بۆ پیشان دانی مێژووی قسەی جوانی کوردی هەڵسوکەوتمان لەگەڵ هەر سێ جەوهەرەکە بەم جۆرە بوو:

١- جەوهەری یەکەم قسەی جوان خۆی، وەکو سەرچاوەییێک بۆ پیشان دانی نرخی ئیستێتیکی خۆی، ئەمەیان بایەخێکی زۆری پێ دراوە چونکە بەلای ئێمەوە هونەری بەرز وەکو خەزینە وایە نهێنییەکانی دەبێ لە ناو خۆی دا بدۆزرێتەوە لەبەر ئەوە لە لای ئێمە هەر خۆشی بووە بە سەرچاوەی بنچینەیی. جار ناجار هەوڵ دراوە زانیاری لە بارەی بەرهەمێکەوە لەبیر ببرێتەوە و لەناو تێکستی بەرهەم دا زانیاری و ڕاستی بدۆزرێتەوە واتە لە پێش تیشکی رەخنەی ناوەوە تەماشای بەرهەمەکە کراوە وەکو سەرچاوەییێک بۆ دۆزینەوەی حەقیقەتی بەرهەمەکە خۆی.

٢- جەوهەری دووەم تاقی کردنەوەی تایبەتیی خاوەنی ئەم کتێبە، واتە هەوڵ دراوە زیاتر بیروڕای خۆی دەرببڕێ لەوەی پەنا بەرێتە بەر خەڵکی، چونکە لە بنج دا مەبەسی ئەوەیە تاقی کردنەوە و بینین و بیروباوەڕی کەسی چوار چێوەی ئەم «مێژووی ئەدەبی کوردی»یە بکێشێ، هەر لەبەر ئەوەشە لەناو هەموو میللەتێک دا زیاتر لەیەک و دووان «مێژووی ئەدەبی»ی ئەو میللەتە دەنووسنەوە.

٣- جەوهەری سێیەم تاقی کردنەوەی خەڵکی، ئەمەیان زیاتر لە نرخی خۆی بایەخی پێ نەدراوە، لێرەدا ئێمە ناچار نەبووین هەموو شتێکی لەسەر شاعیرێک یا نووسەرێک یا ڕووداوێکی ئەدەبی نووسرا بێ وەری بگرین، چونکە بەشێکی زۆری ئەو نووسینانە دەڵەمەن و لە قالب دا نەمەیبوون و پێویستی یان بە ڕاست کردنەوە هەیە، گەلێ بیروڕاش هەیە وەکو شتێکی بەجێ خۆیان دەنوێنن چونکە داهێنانیان تێدایە بەڵام لە ڕاستی دا لە خەڵکی بێگانە وەرگیراوون، لەبەر ئەوەیە بێگومان ئەو خوێندەوارانەی بەرهەمی ئەدەبی کوردییان بڵاو کردۆتەوە بۆ ئەم کارە کەڵکیان زیاتر بووە لە وانەی کە

لە مێژووی ئەدەب دوواوون.

سەرچاوەی جەوهەری سێیەم هەموو ئەو تێبینی و لێکۆڵینەوەو باسانەن کە لە بابەت ئەدەبی کوردی‌یەوە کەوتوونەتە ناوەوە، ئێمە ئەوەی بەر دەستمان کەوتبێ خوێندوومانەتەوە، ئەم کەرەستەو سەرچاوانە کەڵکی خۆیان هەیە، هەر یەکەی جێگەو شوێنی خۆی هەیە، بەگشتی لەم خاسیەتانەی خووارەوە ناچێتە دەرەوە:

١- زانیاری ڕاستیان تێدایە، تێبینی و بۆچوونی داهێنەرانەیان خستۆتە ڕوو، لەبەر ئەوە لەگەڵ ڕێڕەوو مەفکوورەی ئێمە گونجاوون.

٢- زانیاری‌ی هەڵەیان تێدایە، بەوەی سەرچاوەی دەرەوە بەسەر ناوەوە زاڵ بووە، بۆیە خوێنەر چەواشە دەکەن بە بۆچوونی دۆگماتیزمی، ئەوەش زیاتر لەبەر ئەوەیە چونکە بیروڕای ئامادە کراو بە زۆر سەپێنراوەتە سەر دیاردەیێکی ئەدەبی دیاری کراو، ئێمە خۆمان لەم جۆرە زانیاری‌یانە لاداوە با بە ڕووکەش و سەر پێ‌ییش وەکو شتێکی ماقووڵ بێنە پێش چاو، چونکە ناوەڕۆکیان پووچ و چرووکە.

٣- هەندێ لەڕووی دڵسۆزی‌یەوە ساویلکانە شتیان لەسەر ئەدەبی کوردی نووسیوە، بە تایبەتی لەسەر شاعیران، بەڵام نووسینەکانیان زۆر کزن هەرگیز نابن بە سەرچاوە بۆ مێژوو نووسی ئەدەبی کوردی‌ی ڕاستەقینە.

٤- هەندێ کەس ئەدەبی کوردی‌یان کردووە بە زرێ بۆ ئەوەی شتی تری پێ بپارێزن وەکو زیاد لە پێویست هەڵدان بەسەر شاعیرێک بۆ مەبەسی سوودی کەسی و لەسەر حسێبی مێژووی ئەدەبی کوردی.

٥- هەندێ جار پلەی بەرزیان داوەتە شاعیرێک کە شایانی نەبووە، تەنیا لەبەر ئەوەی میرات گری هەیە.

٦- هەندێ جاری تریش کە یەکێک خۆی بە پسپۆر زانیوە لەشاعیرێک موبالەغەی کردووە و نەیویستووە کەسی تر باسی ئەو شاعیرە بکا.

٧- دەنگی ناسازو نا دڵسۆزیش هەیە بە ناوی زانستی‌یەوە گێرەشێوێنی دەکا و دەیەوێ نرخی نەتەوە کەم بکاتەوە لە ئەدەب و هونەردا.

کاری ئێمە ڕاست کردنەوەو وەرام دانەوە نەبووە لە ڕووداوی ناڕاست و ناهەموار لە بواری مێژووی ئەدەبی کوردی دا. لەبەر ئەوەیە هەرچی بەڕاست دەزانین - بە پێی

پێویست - وەری دەگرین و هەرچی بە هەڵەی دادەنێین پشت گوێ دەخرێ.

بە باشی دەزانم خوێنەری ئەم کتێبە ئاگاداری هەندێ لایەنی دیکەی ناوەرۆکی کتێبەکە بێ لەپێناوی ئەوەی زیاتر سوودی بۆی هەبێ.

١- ئەم کارە هەر چەندە مێژووی ئەدەبە و هەوڵێکی زۆرم داوە لە چوار چێوەی مێژوو نەچمە دەرەوە بۆ ڕەخنەی ئەدەبی و تیۆری ئەدەب و ئەدەبی بەراووردکاری بەڵام لەگەڵ ئەوەش دا ئەم بابەتانە تێک هەڵکێش بوون و بە هیچ جۆرێ ناکرێ بە تەواوی پشت گوێ بخرێن و دیوارێکی ئاسنین لەنێوان ئەم زانستیانە و مێژووی ئەدەب دابنرێن، ئەگینا مێژووەکە ووشک دەبێ و جەوهەری ڕاستەقینەی داهێنانە ئەدەبی‌یەکە ناخاتە ڕوو، لەبەر ئەوە هەوڵێکی زۆرم داوە کە ئەم زانستی‌یانەی پێوەندی ڕاستەو خۆیان لەگەڵ داهێنانی ئەدەبی هەیە لەم باسەدا نەبن بە مەبەسی، بەڵکو لەپێناو و بۆ خزمەتی مەبەسی بنچینەیین کە نووسینەوەی «مێژووی ئەدەبی کوردی»یە.

٢- لەم کتێبەدا هەوڵ دراوە لە هەموو شتێک دا بۆ پاش سەرەتای شەستەکان پەنجە درێژ نەکرێ. ئەوەی ئاشکرایە گوڕانێکی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابووری زۆر بەهێز لە کوردستانا ڕوویدا، بەڵام ئەوەندە هەیە کەرەستەو سەرچاوەی پاش شەستەکان و تا ئەمڕۆ بەکار هێنراوە لەبابەت وەزعی کوردەوە لە کۆنەوە تا سەرەتای شەستەکان.

٣- جێگەی شاعیرو نووسەرانی کورد لە قۆناغەکانی مێژووی ئەدەبی کوردی دا بەم جۆرە دیاری کراوە: تەماشای تەمەنی شاعیر کراوە، بیستساڵێک لەو ژمارەیە دەرهێنراوە، چونکە بە زۆری لە دەوروبەری تەمەنی بیست ساڵی دا کەسایەتی‌ی زانستی و ئەدەبی و هونەری پیاو دەردەکەوێ، ئیتر تەماشاکراوە بەشی زۆری ژیانی شاعیرەکە لە کامە قۆناغ بوو بێ لەوێ دانراوە، بۆ بەڵگە سالم (١٨٠٥ - ١٨٦٩) ئێمە لە شاعیرانی نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەمان داناوە، با ١٩ ساڵیش لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەم ژیا بێ چونکە ٤٥ ساڵ لە نیوەی یەکەمی ئەم سەدەیەدا ژیاوە، لەمە بەلای کەمی‌یەوە (٢٥) ساڵی بە شیعر ووتن بردۆتە سەر، کەچی لە نیوەی دووەم تەنیا ١٩ ساڵی وەرگرتووە، ئەمە و جگە لەوەی کە ناوی ئەم شاعیرە بە دوو شاعیرەکەی ترەوە بەستراوە نالی و کوردی کە هەرسێکیان تێکرا دامەزرێنەرانی قوتابخانەی تازەی ئەدەبی کوردین لە خوارووی کوردستان دا.

٤- لە سەرانسەری ئەم کتێبە گەلێ زاراوەی وەکو «کلاسیک» و «ڕۆمانتیک» و هی تر

بەکـار هێنراوون. بێ گـومـان مـانای ئەم زاراوانە لەگـەڵ شـێـوەی بەکـار هێنانیـان دا دەگـۆڕێن، واتە تەنیـا یەک مـانایان نی‌یە، بۆ بەڵگە «کـلاسیـک» بە زۆر مـانـا هاتووە، وەکو: ئـەدەبی کۆن، ئەدەبی خوێندەواری بەرز، ئەدەبی سالۆنەکانی ئەوروپا، ئەدەبێک داهێنانی تێدابێ، ئەدەبێک ببێـتە هۆی لاسایی کردنەوە، ئەدەبێک ببێـتە قـوتابخانە، ئەدەبی تۆمار کراو بۆ ئەوەی لە ئەدەبی سەر زاری تۆمار نەکراو جیا بکرێتەوە، ئەدەبێک لە ئەنجـامـی لێکدانی کـولتـووری چەند نەتەوەیێک دروست بووبێ، وەکـو ئەدەبی مـوسـڵـمـانی، ئەدەبی سـلاڤی، ئەدەبی جـەرمـەنی، ئەدەبی لاتینی، هەروەها زاراوەی «رۆمـانتـیـکی» ئەگـەر باس باسی پێش سـەدەی نۆزدەم بێ بە مـانای خـەیاڵبـازی و گۆشەگیری و سۆفیزم هاتووە، بۆ ئەم مانایە تا ئێستا بەردەوامە، بەڵام لەدووا ساڵانی سەدەی هەژدەم و سەرەتای سەدەی نۆزدەمەوە تا ئێستا بۆ مەبەسی قوتابخانەش بەکار هێنراوە.

٥- ئەو شیعرانەی بۆ بەڵگە هێنراونەتەوە دوو بابەتن، یەکەمیان شیعری شاعیرە گەورەو ناودارەکـانن، لە کـاتی تۆمـار کـردنی تێکستـەکـانیـان پەنجـە بۆ سـەرچاوەکـانیـان درێژ نەکـراوە، دیارە لەو سـەرچاوانەشـەوە وەرگـیـراوون کـە ئێـمـە باوەڕمـان پێ‌یان هەیە، دووەمیان ئەو بەڵگانەن کە کەم زانراوون و خاوەنیشیان کەم ناسراوون، ئیتر سەرچاوەی ئەم شـیـعـرانە دیاری کـراوون ئەمـانەش یا چاپ کـراوون یا لە دەسنووس دا پارێزراوون، هی واشیان تێدایە بۆ یەکەمین جار لەم کتێبەدا بڵاو دەکرێنەوە.

٦- تێکستی بەڵگەکانی ئەم کارە بە زۆربەی دیالێکتە جیاوازەکانی زمانی کوردین، دیارە وەکو خۆیان بڵاو کراونەتەوە، ئەگەر گومان لەوە کرابێ کە کوردی کرمانجی‌ی خواروو بە ئاسـانی تێ‌ی ناگەن ئەوا گـۆڕراوەتە سەر ئەم دیالێکتە. لە گـۆڕین دا پێڕەوی ئەوەمـان کـردووە وەکـو خـۆی بیگـۆڕین، تەنانـەت هەر ووشـەیێک ئەگـەر بێگانەش بووبێ لەناو تێکستـەکان دا نەمان کردووە بە کوردی ئەگەر لە ئەدەبی کلاسیکی مـوسڵـمـانی دا باو بووبێ و خوێندەواری کورد ئاشنای بووبێ.

٧- تێکسـتی شـیـعـری ئایینی یارسـان بە دیالێکتـی گـۆرانی هەمـوویـان بەراوورد کـراوون، ئەوەی ئێـمـە نووسـیـومـانە ئەنجامی بەراوورد کردنەو بە ڕاستـترینی دەزانین. جگە لەوە شـیـعـری ئایینی یارسـان یەکـجـار زۆرە، ئەوەی ئێـمـە بۆ بەڵگە هێناومـانـەتەوە بەلای ئێمەوە جوانترین نموونەن لەڕووی ئیستێتیکی‌یەوە.

دەمــەوێ سـڵاو بۆ هەمــوو ئەو کــەســانە بنێـرم کـە شـیــعـرو نـووسـینی کـوردی‌یـان بڵاو کردۆتەوە، هەندێکیـان بێ ئەوەی قسـە بکەن و سنگیان دەرپەڕێنن تەنیـا تێکستەکانیان بڵاو کـردۆتەوە، هەندێکی تریان لێکیـان داوەتەوەو تێـبینی‌یان لەسەر کـردووە، هەندێ لەو لێکدانەوەو لەم تێـبـینی‌یانە سـودو کـەڵکیـان دیار و ئاشکرایە. بەڵام سـەرچاوەی بنچینەیی بۆ ئێمە بەرهەمی شاعیر و نووسەرانی کوردە.

لە ئەمین فـەیزی (١٨٦٠-١٩٢٣) یەوە تا عـەلائەدین سـەجـادی (١٩٠٧ - ١٩٨٤) کەرەستەو سەرچاوە کەوتە ناوەوە لە بابەت ئەدەبی کوردی‌یەوە، سەجادی لە ساڵی ١٩٥٢ لە بەرگێک دا مێژووی ئـەدەبی کوردی بڵاو کردەوە، کـتێبێکی کاریگـەر بوو، لەبەر ئەوە جارێکی تریش چاپ کرایەوە (١٩٧١). لەو سەردەمە سەجادی بایی بەرگێک کەرەستەو سەرچاوەی لـەبەر دەست دا بوو بۆ ئەدەبی کـوردی، کارێکی بـاشی کرد. لەپاش ئەو ئـەگەر ئەو کـەسـە دڵسـۆزانەی شـیـعـرو نـووسـینی شـاعـیـر و نووسـەری کـۆنی کـوردی‌یان بڵاو نەکردایەوە، چۆن من دەمتوانی تۆماری مێژووی ئەدەبی کوردی بگەیێنمە چەند بەرگێک! سـڵاو بۆ هەمـوو ئەو دڵسـۆزانەی کـاریـان لە ئەدەبی کـوردی کـردووە و مـژدەش بۆ هەمـوو کەسێـکی بە شەوقەوە پێشـوازی لە پڕ کردنەوەی کەلێنێـکی گەورە دەکا لە ئەدەبی کوردی دا، چونکە ئێمە لەم «مێژووی ئەدەبی کوردی»یەمـان دا کەلێنێکی گەورەمان پڕ کـردۆتەوە بەوەی کـە ئاشکرا بووە ئەدەبی نەتەوەکەمـان لە تەمـەنی هەزار سـاڵەی‌دا لە بابا تاهیـرەوە بەردەوام بووە تا ئێستا. ماوەی نێوان شاعیری یەکەم و رینیسانسی ئەدەبی کوردی باکوور بە ئەدەبی ئایینی یارسان و کۆمەڵێک شاعیرانی دیالێکتی گۆرانی پڕ بۆتەوە.

لەکاتی بیـر کردنەوە لە ناوەرۆکی ئەم کـتێـبە و تۆمار کردنی زانیـاری‌یەکـانی هەمـیـشـە تارمـایی بیـرەوەری و یادگـاری سێ کـەس لەسـەر شـانۆی بیـرو خـەیاڵم دا خـۆی نوواندووە، ئەم سێ کەسە نائاسایی بوون بۆ من، کارێکی گەورەیان کردۆتە سەر ژیانی خوێندەواریم و دەسـتـیـان لە دیار کـردنی دووا ڕۆژم دا بـووە، ئەگـەر ئەوان نەبـوونایە زۆر شـتم نـەدەبوو. یەکـەمـیـان باوکم، کـە نووسـینم لە کـۆواری گـەلاوێژ بڵاو کـرایەوە ووتی: ئۆخـەی! بەڵام دەترسم کتێبت نەبینم! نەیدی! لە گۆڕستـانی شێخ مـحەمەدی خۆراسانی لە هەولێر سەری نایەوە.

دووەمـیـان رەفـیق حـیلمی دەیووت: مـێـژووی ئەدەبی کـوردیمان بۆ بنووسـەوە منیش پێشـەکیت بۆ دەنووسم و قـەرزی پێـشـەکی‌یەکـەی «پاش تەمـووز»ت دەدەمـەوە. ئەویش

نەیدی و پێشەکیشی نەنووسییەوەو بووە میوانی هەمیشە مردووی زیندووەکانی گۆڕستانی سەیوانی سلێمانی.

سێیەمیان تۆفیق وەهبی دەیووت: حەزم دەکرد هەموو نووسینی جووانی کوردیت کۆ بکردایەوە، نابێ تەنیا یەکێک یا دووان مێژووی ئەدەبی کوردی بنووسنەوە، تەماشای میللەتان بکە چەند مێژووی ئەدەبییان لە ناوەوەیە. بەڵام ئەویش نەیدی و بووە میوانی هەمیشەیی یەکێک لە پیاوە هەرە کۆنەکانی پاش ئادەم و لەتەک ئەودا ڕازو نیاز لەگەڵ ئەستێرەکانی میترا و ئەنیتا و ناهید دا دەکا، لەگەڵ پیرەمەگروونی نەمردا پاسەوانی شار دەکا.

بەڵام من زۆر بەختیارم پاش مردنیش بێ ئاوات و ئامانجی ئەو سێ کەسەم هێنایە دی، چونکە مەبەس کوردە، ئەوەی هەمیشەییەو هەر دەمێنێ.

هەولێر: مەڵبەندی رووناکی مارف خەزنەدار

# بەشی یەکەم

# جوگرافیای کوردستان

## مەڵبەند و کوردەواری

لە سەر نەخشەی جوگرافی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست ئەگەر وێنەی سێگۆشەیێک بکێشین دەتوانین نیشتمانی کورد لەناو ئەم سێگۆشەیەدا بدۆزینەوە، بەم جۆرە ئەگەر ئاوڕێکیش لە نەخشەی سیاسی ناوچەکە بدەینەوە دەتوانین لەناو سنووری پێنج دەوڵەت خاکی یەکگرتووی کوردەواری بەدی بکەین، ئەم دەوڵەتانە ئەمانەن: تورکیا و ئێران و عیراق و سووریا و قەفقاسی ڕووسیا. ئەگەر تێبینی لە بابەت ئەوەی رووسیاوە هەبێ بەوەی خاکی کوردەواری لەوێ دا نی‌یە، ئەمە ڕاست نی‌یە چونکە شاخی ئەلەگەز کشاوەتەوە ناو قەفقاس و تەنیا کوردی لێ دەژی، ئەم ناوچەیە بەردەوامی خاکی کوردستانە.

خاکی کوردستان لەدوای پەیدا بوون و بڵاو بوونەوەی ئایینی ئیسلام بەشێک بوو لەو دەوڵەتانەی لە ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست فەرمانڕەوایی‌یان دەکرد، لێرەدا کە دەڵێین ئیسلام مەبەسمان زۆربەی کورد چوونە سەر ئەم ئایینە، پاشماوەی هەندێ لە ئایینە کۆنەکان تائێستاش لەناو کۆمەڵی کوردا ماوە.

لە دوای بڵاو بوونەوەی ئایینی ئیسلام (سەدەی شەشەمی مەسیحی) تا سەرەتای سەدەی شازدەم ناوچە جوگرافیەکانی خاکی کوردستان سەر بەو دەوڵەتە تۆتالیتاریانە بوون کە بەناوی ئیسلامەوە فەرمانڕەوایی‌یان دەکردو لە نەتەوە جیاوازەکانی ئیسلام پێک هات بوون وەکو عەرەب و تورک (تورک زمان، تورکە مەغۆل) و فارس و کورد. ئەوەی لێرەدا سەرنج ڕادەکێشی ئەوە بوو بەشێکی زۆر لەو دەوڵەتانە بنەماڵەی کورد بەڕێوەیان دەبرد، سەرۆکەکانیان بە نەژاد کورد بوون.

خاکی کوردستان بۆ یەکەمین جار لە ساڵی ١٥١٤ لە جەنگی چاڵدیران لەنێوان فارس و عوسمانی دابەش کراو بوو بە دوو پارچە، یاخود ڕاستتر ناوچەکانی ڕۆژئاوای کوردستان کە سنووری لەگەڵ عوسمانی هەبوو لە لایەن ئەوانەوە داگیر کرا.

دەتوانین بۆ ئەو سەردەمانە زاراوەی کوردستانی ڕۆژهەڵات و کوردستانی ڕۆژئاوا بەکار بێنین بەو مانایەی لە باکوورەوە بۆ باشوور خاکەکە لەت کرا، لای ڕۆژهەڵاتی سەر بە فەرمانڕەواکانی فارس بووە و لای ڕۆژئاوای سەر بە فەرمانڕەواکانی عوسمانی بوو، بە درێژایی مێژوو زۆربەی شەڕو شۆڕەکانی نێوان ئێران و دەوڵەتی عوسمانی لەسەر خاکی کوردستان و داگیر کردنی میرنشین و ناوچەکانی سەر سنووریان بوو.

ئەم دیاردەیە زیاتر لە چوار سەدەی خایاند، بەڵام لەو ماوەیەدا لە ناوچە جیاوازەکانی کوردستان میرنشینی کوردی هەبوون. ئەم میرنشینانە هەندێکیان سەربەخۆ و هی دیکەیان نیوە سەربەخۆ لە ناوەوە بوون. هۆی ئەمە وێنەی دروست بوونی خاکی کوردستان لە ڕووی جوگرافیای سروشتی‌یەوە بوو. شاخی بەرزو شیوی قووڵ و دەشتی پان و بەرین و زێ و ڕووباری گەورە ناوچەی تایبەتی‌ی جوگرافیان دروست کرد بوو، هەر لەبەر ئەوەشە یەکێ لە خاسیەتەکانی جوگرافیای سروشتی ئەوەیە ناوچە جیاوازەکان ناوی تایبەتی‌یان هەیەو ناوی شارێک یا ئاوەدانی‌یێکی دیاری کراو نین وەکو: بۆتان و بادینان و سۆران و موکریان و ئەردەڵان و هی دیکە. لەناو ئەم ناوچانە و هی تر دا بە درێژایی مێژوو میرنشینی کوردی دروست بوو بوون.

لە دوای جەنگی گێتی‌ی یەکەم (١٩١٤ - ١٩١٨) ئەو خاکی کوردەواری‌یەی سەر بە ئێران بوو هیچ جۆرە گۆڕانێکی بەسەر دانەهات. بەڵام ئەوەی سەر بە دەوڵەتی عوسمانی بوو کەوتە ژێر دەسەڵاتی چوار دەوڵەت:

١- تورکیا: ئەمەیان ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی باشووری بەشی ئەنەدۆڵی تورکیای گرتۆتەوە و بە «کوردستانی تورکیا» ناوی دەرکردووە.

٢- عیراق: خاکی کوردی عیراق کەوتۆتە بەشی باکوور و باکووری ڕۆژهەڵاتیووڵاتەکە و بە «کوردستانی عیراق» ناسراوە.

٣- سووریا: خاکی کوردی ئەم ووڵاتە کەوتۆتە بەشی باکووری، وەکو ناوچەیێکی جوگرافی بریتی‌یە لە باشووری ناوچەی بۆتان کە بەشی هەرە زۆری لە کوردستانی تورکیایە و بەشێکی کەمی لەسووریا و بەشێکی کەمتر لە عیراقە (ناوچەی زاخۆ لە سنووری دەوڵەتی‌یەوە واتە لە خابوورەوە تا گەلی زاخۆ، لە دوای ئەو خاکی بادینانە).

٤- قەفقاسی رووسیا: لەڕووی مێژوویی‌یەوە ناوچە کوردنشینەکان لەئێستا فراوانتر بوون هی وەکو ناگۆرنی قەرەباغ و ئەلەگەزو و هی‌تر، بەڵام لە ئەنجامی شەڕو شۆڕ و جەنگ و

چەوساندنەوە گۆڕانی بنچینەیی دیمۆگرافی لەو ناوچانەدا روویان داوە، کەچی لەگەڵ ئەوەش دا خاکی کورد بەرەو ڕۆژهەڵاتی ئەو ناوچەیە دەخزێ بەرەو شاخی ئەلەگەز و دەشتی بەردەمی کە ئێستا بەشێکە لە ئەرمەنستان.

بەم جۆرە خاکی کوردستان لەڕووی سنووری سیاسی و دەوڵەتی‌یەوە بەسەر وولاتەکانی تورکیا و ئێران و عیراق و سوریا و قەفقاسی ڕووسیا دابەش کراوە بەڵام ئەم خاکە لەڕووی جوگرافیەوە یەک پارچە خۆی دەنوێنێ و ئاشکرایە ئەم سنوورە دەسکردە.

ئەو خاکەی کە کوردی تێدا دەژی کوردستانی پێ دەووترێ، بەڵام کورد لە دەرەوەی کوردستانیش هەیە لە تورکیا لە ناوچەی قونیە، لە ئێران لە ناوچەکانی خۆراسان و شیراز، لە سووریا لە حەڵەب، ئەمە جگە لەو کوردانەی بە کۆمەڵ لە هەموو کۆمارەکانی قەفقاس و هەندێ لە کۆمارەکانی ئاسیای ناوەڕاستی وەکو تورکمەنستان و کازاخستان و ئوزبەگستان دەژین.

جگە لەمانە لە پایتەخت و شارەکانی وەکو: ئەستەموول و ئەنقەرەو تاران و بەغدا بە میلیۆن دەژین، هەروەها جالیەی کوردی لە شارەکانی دیمەشق (شام) و بیروت و عەممان و جێگەی دیکە دەبینرێ.

کوردستان لە رووی جوگرافیای سروشتی‌یەوە خاکێکە بە یەکەیێکی سەربەخۆ دەژمێررێ، بەڵام قەوارەی سیاسی نی‌یە، بە بڕیاری سیاسی و درۆی دیپلۆماسی و شەڕو شۆڕی کوشندە دابەش کراوە لەبەر ئەوە لە نەخشەی سیاسی‌دا ناوی نی‌یە، بەڵام لە نەخشەی سروشتی دا جێگەیێکی دیاری هەیە.

# بەشی دووەم

# مێژووی کورد

# نەژاد و بەسەرهات

## مێژووی کۆن

پەیدا بوونی باب و باپیرانی کوردی ئەم سەردەمەی ئێمە لەو خاکەی کە ئێستا ناوی کوردستانە دەگەڕێتەوە ڕۆژگارانی زۆر کۆن. مێژووی ئەم ڕۆژگارە هەرە کۆنانە تەنگو چەڵەمەییێکی زۆری تێدایە، نەوەکو تەنیا لە بابەت مێژووی بنج و بناوان و نەژادی کوردەوە، بەڵکو ئەم تەنگو چەڵەمەیە نەتەوەکانی هەموو ناوچەکەو بگرە هەموو گێتی دەگرێتەوە.

لە سەرەتای سەدەی دووازدەم سەلجوقی‌یەکان ناوچەکانی نێوان ئازربایجان و لوڕستانیان ناو نا «کوردستان»، لەو ڕۆژەوە ناونیشانی «کوردستان» لەسەر نەخشەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست نەخش کراوە.

لە ڕۆژگارانی پێش مێژووەوە ئادەمزاد لە خاکی کوردەواری دا ژیاوە. لە دەوری بەردی کۆن مرۆڤی نیاندرتال لە ئەشکەوتی شانەدەر (نزیکەی ٣٠ کم باکووری ڕۆژهەڵاتی ئاکرێ) و هەزار مێرد (نزیکەی ١٥ کم خوارووی سلێمانی) زیندەگانی‌یان کردووە، واتە لە ٦٠ تا ٤٠ هەزار ساڵ بەر لە مەسیح ئاوەدانی و ژیانی ئادەمزاد لە خاکی کورد دا بووە.

بیست هەزار ساڵ پێش مەسیح مرۆڤی کۆن لە دەربەندی بازیان و قەد پاڵەکانی دا ژیاوون. هەروەها قەڵای جەرمۆ شوێنەواری ژیانی ئادەمزادی کۆن بووە لە هەزارەی پێنجەمی پێش مەسیح و یەکێکە لە شوێنەوارە کۆنەکانی ئادەمزاد کە ژیانی ئەشکەوتیان بەجێ هێشتووەو دەستیان بە کشتوکاڵ کردووە.

ئەوەی ئاشکرایە ئەوەیە کە کورد لە نەژادا لە بنەماڵەی هۆزەکانی هیندو - ئەورووپی‌یە،

زانایانی نەژادناس لە بیرو باوەڕدا یەک ناگرنەوە لە دیار کردنی مەڵبەندی کۆنی ئەم هیندو - ئەوروپاییانە، هەندێ دەڵێن لە دەشتەکانی باکووری خۆراسان دەژیان، هەندێکی تر لەسەر ئەو باوەڕەن کە لە پانایییەکانی ڕووسیا بوون، هی تریش دەڵێن لە خوارووی زەریای خەزەر دەژیان.

ئەوەی جێی گومان نییە ئەوەیە کە هۆزەکانی هیندو - ئەوروپی پێش کۆچ کردنیان، زمانی وەک یەکی یا گەلێ نزیک لە یەکترییان بووە، بەڵام لە دووای شەپۆلە گەورەکانی کۆچەکانیان دیارە لەڕووی زمان و نەریت و خوو و ڕەووشت لە یەکتری دوور کەوتوونەتەوە.

سێ شەپۆلی کۆچی ئەم هیندو - ئەوروپییانە ئاشکرایە: یەکێکیان بۆ ناوچەکانی دانووب و بەلقان لە ئەوروپا، ئەویتریان بۆ وڵاتی هیندستان، سێیەمیان بەرەو ئاسیای بچووک و شاخی زاگرۆس لە ئێران و کوردستان دا نیشتنەوە، ئەو خەڵکەی لە شاخەکانی زاگرۆس نیشتەجێ بوون گۆتییەکانیان لێ دروست بوو، لەپاش ئەوانیش میدییەکان ئەو ناوەیان داگیر کرد.

لە هەزارەی سێیەمی پێش مەسیح بەشی هیندو - ئەوروپی جیا بوونەوە، ئەمانە بەخۆیان دەووت «ئاری» بە مانای (شەریف)، گۆیا ئەمانە ڕوویان کردە خاکێک ناویان نا «ئیریانا ڤەیجا = Airyana - Vaejah» بە مانای (نیشتمانی ئاریان)، لەناو ئەم کۆمەڵە پێغەمبەرێک پەیدا بوو ناوی زەردەشت بوو، داوای لێ کردن کە ئەهورەمزدا بپەرستن، بەڵام خەڵکی بە قسەیان نەکرد. ناچار خۆی و یارانی بەرەو ڕۆژئاوا کشان و هاتنە ئەو خاکەی ناو نرا ئێران (واتە نیشتمانی ئاریان).

ئەو بەشانەی کە لە هیندو - ئەوروپی جیا بوونەوە لە هەزارەی سێیەمی پێش مەسیح هۆزەکانی گۆتی و لۆلۆ بوون لە ناوچەی زاگرۆسی مەرکەزی، هەروەها ئۆرارتۆ لە ناوچەکانی نێوان وان و ئارارات لە ١٢٠٠ پێش مەسیح.

## میدیا

ڕۆژهەڵاتناس و پسپۆری مێژووی کۆنی ڕۆژهەڵات لە ناو زانا ئەوروپایییەکانا لەمێژووی کۆنی ئەرکیولۆجی ئەم ناوچەیان کۆڵیوەتەوە و زانیارییێکی باشیان بە دەستەوە داوە. دیارترین سفیلیزاسیۆنی کۆنی باپیرانی کورد لە ئیمپراتۆریەتی میدیا

دەردەکەوێ. شارەزایانی مێژووی کوردی وەکو مینۆرسکی و تۆفیق وەهبی لەسەر ئەو باوەڕەن کە نەژادی کورد خۆی لە میدیەکانا دەنوێنێ.

لە کتێبە ئاسمانی‌یە ئایینی‌یە کۆنەکانیش دا باس لە نەوەی «ماد» و وولاتی میدیا کراوە، لە تەوراتا ئەوە هاتووە کە: سام و حام و یافت منداڵی نووح بوون، لە پاش لافاو، ئەمانە منداڵیان لەپاش بەجێ ما، منداڵەکانی یافت جوومەر و ماجووج و مادای و یاوان و تووبال و ماشەک و تیراس بوون.

لە جێ‌یێکی تری تەوراتا نووسراوە: جارێکی تر ئیبراهیم ژنی هێنا ناوی قەتوورە بوو، ئەمە زیمران و یەقشان و مەدان و میدیان و بیشباق و شووحای بۆ بوو.

لە «کارەکانی نێراوان»دا کە پزیشک لۆقا نووسیویەتی‌یەوە و هەر خۆشی خاوەنی ئینجیلی لۆقایە دەڵێ: «هەندێکمان فەرتین و مادین و ئێلامین، هەندێکی ترمان دانیشتووانی مێزوپۆتامیا و یەهوودیەو کەبدووکیەو بونتس و ئاسیا و فریجیە و یەمفیلیە و میسر و ناوچەکانی لیبیای بەرامبەر بە قەیرەوانین...».

لە تۆمار کراوە هەرە کۆنەکانی کە بە ئێمە گەیشتووە لە بابەت میدیەکانەوە ئەو لەوحە هەڵکەنراوەیە کە باسی هێرشی شەلمانسری سێ‌یەمی تێدا تۆمار کراوە بۆ سەر هەرێمێک ناوی پارسوا بووە لە شاخەکانی کوردستان دا (٨٣٧ پێش مەسیح)، وا دەردەکەوێ لەو هەرێمەدا بیست و حەوت سەرۆک هەبووبن، ئەمانە شا بوون و فەرمانڕەوایی بیست و حەوت وولاتیان دەکرد، بەلام ژمارەی دانیشتووانی ئەم وولاتانە کەم بوو، خەڵکەکە «ئامادای» یا «مادای» یا «میدی»یان پێ دەووتن، ئەمانە لە نەتەوەکانی هیندو - ئەورووپی بوون، لە قەراغ زەریای خەزەرەوە ڕوویان کردە ڕۆژئاوای ئاسیا بە هەزار ساڵ پێش مەسیح. کتێبی پیرۆزی زەردەشتیان ئاڤێستا ئەم نیشتمانە کۆنە بە بەهەشت لە قەڵەم دەدا.

نیشتمانی کۆنی میدی‌یەکان ناوچەکانی بوخاراو سەمەرقەند بوو، لە پاشانا بەرەو خووار کۆچیان کرد، تا لە دووا سالانی سەدەی هەشتەمی پێش مەسیح هۆزو تیرەی میدیایی‌یەکان لە ژێر فەرماندەی دیۆسیس یەکیان گرت، ئەم شایە بە دەسەلاتە لە دەوروبەری ٧١٥ی پێش مەسیح یەکەمین پایتەختی لە ئەکباتان (هەمەدان) بۆ دامەزراندن. ئەم هێزە بووە گەورەترین هێز بەرامبەر بە ئاشوور، هەر لەبەر ئەوەش بوو ئاشووری‌یەکان هەلیان دەست بکەوتایە بە سەر وولاتی میدیایان دا دەدا. لە دووایی‌دا

گەورەترین شای میدییەکان سیاخار (سیاکزارس) توانی نینەوا تەفرو توونا بکاو ئاشوور برووخێنێ. (٦١٢ ی پێش مەسیح) وولاتی میدییەکان هەمیشە لەلایەن بێگانەکانەوە لەبیر نەدەکراو، هەر دەم پیلانی بۆ دەکێشرا بۆ دەست بەسەر داگرتنی و داگیر کردنی. لە ساڵی ٥٥٦ ی پێش مەسیح دارای یەکەم ئەکباتانی داگیر کرد. لە پاش دوو سەدە زیاتر ئەسکەندەری مەکدۆنی لە ٣٣٠ پێش مەسیح دەستی بەسەرا گرت، لە پاشانا سلووکیەکان لە ٣١٠ ی پێش مەسیح داگیریان کرد، ئینجا ساسانییەکان بوون بە خاوەنی تا ٦٣٣ پاش مەسیح و داهاتنی ئیسلام.

## لە یەک چوونی ناوی «کورد» و ناوی هەندێ لە تیرەو هۆزی هیندو - ئەوروپییەکان

ئێمە کە سەرنجی کۆمەڵێک ناوی هۆزو تیرەو میللەت و نەتەوە دەدەین، بە ئاشکرا بۆمان دەردەکەوێ کە ئەم ناوانە زۆر نزیکن لە ووشەی «کورد»ەوە: ووشەی «کەردەکا» لەسەر دوو تاتە بەردی سۆمەری هەڵکەندراوە، ئەم تۆمار کراوە دەگەڕێتەوە سەردەمی دوو هەزار ساڵ پێش مەسیح، هەروەها لەمانە «کاردۆخ»ەکان ئەوانەی بەرهەڵستیی سوپای ئەسکەندەری مەکدۆنییان کرد لە ڕێگەی گەڕانەوەی لە وولاتی ئێران پاش سەرکەوتنی بە سەر کۆرشی گەورە (٤٠١ - ٤٠٠)، مێژوونووسی گریکی کسینۆفون = Xenophon (٤٢٧ - ٣٥٥ پێش مەسیح) باس لە ئازایی و مەردایەتی و سووار چاکییان دەکاو ئەوە دەردەخا کە خۆشەویستییان بەرامبەر بە نیشتمانیان بێ سنوور بوو.

میللەتێکی تریش لە مێژووی ئەرکیۆلۆجی ئەم ناوچەیە ناوی هاتووە، ئەمە میللەتی «کورت»ە، بێ گومان ئەم ووشەیە هەر یەکێکە لە ووشەی «کورد»ی ئێستا. جوگرافییەکانی گریکیی وەکو ستراو و پتۆلیمی لە سەرەتای سەدەکانی پاش مەسیح دا باسی ناوچەی «کوردئین» یان کردووە. سترابۆ دەڵێ ئەو ناوچەیە لە دەوروبەری ئەودا «کوردۆئین» یان پێ دەووت و شاری «پیناک»ی لێ بوو، ئەمە وولاتی کاردۆخەکان بوو لە ڕۆژگارانی رابردوو دا. ئارامییەکان ناوی وولاتی کوردیان بە «بیث قردا» بردووە، هەروەها لە تێکستەکانی عەرەبی پێش ئیسلام بە وولاتی کوردیان ووتوە «بقردا».

گەلێ کۆمەڵی ئادەمزاد و هۆزو میللەت بە درێژایی مێژوو لەم ناوچەدا ژیاوون، زۆریان لەڕووی ناویانەوە پێوەندییان بە ناوی «کورد»ەوە هەیە. بێ گومان هەموو کۆمەڵە ئادەمزادێکیش لە خاسیەتی تایبەتیی خۆیەوە دەست پێ دەکاو دروست دەبێ، ئینجا

جەوهەری دەرەوەی تێکەڵ دەبێ، ئەو جەوهەرانەی دەرەوە لە ناو خاسیەتە تایبەتی‌یەکە دا ڕۆژ لە دووای ڕۆژ دەتوێنەوە، بەم جۆرە لە سەردەمێکی مێژوو دا میللەت یا نەتەوە، یا ناسیۆن دروست دەبێ. بێ گومان لە سەردەم و ڕۆژگارانی پێش ئیسلام نەتەوەی کوردی ئێستا دروست بووە.

هەر لە سەرەتای بڵاو بوونەوەی ئایینی ئیسلامەوە ووشەی کورد باو بووە. بۆ یەکەمین جار ئیمامی عەلی کوڕی ئەبوو تالیب کە نامەی بۆ زیادی کوڕی ئەبیهی نووسیوە، ووشەی «کورد»ی بەکار هێناوە. ئیتر لەپاش ئەوە بە درێژایی مێژووی دەوڵەتی ئیسلامی مێژوونووسە کلاسیکی‌یەکانی عەرەب و فارس و تورک باسی کوردیان وەکو میللەتێک یا کۆمەڵێکی ئیتنی کردووە، لەمانە: تەبەری (٩٢٣ مردووە)، مەسعوودی (٩٥١ مردووە)، ئیبنولئەسیر (ابن الاثیر) (١١٤٠ - ١٢٣٤)، حەمدوڵڵای موستەوفی (سەدەی چواردەم). ئەسکەندەر بەگ مونشی تورکمان (١٥٦٠ - ١٦٣٥) گەڕۆکی تورکی بە ناو بانگ ئەولیا چەلەبی ١٩٥٤، مەهدی خان کەوکەب (سەدەی هەژدەم).

## سەرەتای ئیسلام تا جەنگی چاڵدیران

بڵاو بوونەوەی ئایینی ئیسلام لە ووڵاتی کوردەواری و لە هەموو ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و ئاسیا هەروا بە ئاسانی و بە ڕۆژێک و دوو ڕۆژ نەبوو، بەڵکو ماوەیێکی درێژی خایاند. لەپاش جێگیر بوونی ئایینی ئیسلام، ووڵاتی کوردەواری کەوتە ژێر دەسەڵاتی خەلیفەی عەرەبی موسڵمانان. لە ماوەی فەرمانڕەوایی خەلیفەی ئیسلام هەندێ بنەماڵەی کورد دەسەڵاتی گرتە دەستی خۆی، لەمانە بەهێزترینیان دەوڵەتی مەڕوانی - دوستەکی‌ی سەربەخۆ بوو لە ٩٩٠ تا ١٠٩٦ فەرمانڕەوایی کرد. هەروەها دەوڵەتی مەسنەوی لەلای خوارووی ڕۆژهەڵاتی کوردستان لە دینەوەرو شارەزوور لە ٩٥٩ تا ١٠١٥ دەسەڵاتی بە دەستەوە بووە.

نەتەوەی کورد پیاوی گەورەی وای لێ هەڵکەوتووە لە چووار چێوەی نەتەوەو موسوڵمانەتی و ڕۆژهەڵات چۆتە دەرەوە بووە بە دیاردەو دروشمێکی جیهانی، سەلاحەدینی مەزن یەکەمین گەورە پیاوێکی کوردە کە لە هەموو جیهان دا ناسراوو بە ناوبانگە، دامەزرێنەری بنەماڵەی ئەیووبی‌یە لە پارچەیێکی پان و بەرین و فراوانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست: میسر و شام و میزوپۆتامیا و کوردستان، ئەم ناوچانە لە ژێر فەرمانڕەوایی ئەیووبی‌یەکانا بوون لە ساڵی ١١٦٩ وە تا دووا ساڵانی سەدەی سێزدەم.

ئەم قـارەمـانە بـە تووانايە قـەيسـەری گـاووری لە قـودس لە ناو بـرد و بەسـەر ريچـاردی يەكەمی ئينگليز (ريكاردۆسی دڵ شێر) و فيليپ ئۆگستينی فەرەنسی‌دا زاڵ بوو.

لە سـەدەی سـێـزدەم خـەلافـەت و دەسـەڵات و فـەرمـانڕەوايی نەوەكـو لە دەست قـورەيش دەرچوو، بەڵكو نەدرا بە عـەرەبيش. گـەلێ هۆزو مـيللەتی توركـە - مـەنگۆلی نـەژاد پەيدا بوون، لـە مـاوەييێكی زۆر پێش ئەوەی هۆلاكـۆی مـەنگۆلی لە سـاڵی ١٢٥٨ خـەلافـەتی عەباسی بڕووخێنێ. هۆزو ميللەتە موسڵمانە نا عـەرەبەكان دەسەڵاتيـان بەهێز بوو بوو، وا بوو لە سـەدەی يازدەم وولاتی كـورد كـەوتە دەست سـەلجـووقـی‌يەكـان و بۆ يەكـەمين جـار لە سەرەتای سەدەی دووازدەم ناوی «كوردستان»يان لە خاكی كوردەواری نا، لە پاش ئەمە لە سەدەی سێزدەم كوردەكان كەوتنە بەربەرەكانی‌ی هۆلاكۆ، لە پاشانا تەيموری لەنگيـان لە ساڵی ١٤٠٠ لە ئامێدی شكاند.

هێزی دڕندەی بێگانە وەكو لافاو بەسەر خاكی كوردی دا دەدا و تەڕو ووشكی ڕادەماڵی لەمانە خاوەنەكانی مەڕی ڕەش (قەرە قوينلوو) (١٣٧٨ - ١٤٦٨) و خاوەنەكانی مەڕی سپی (ئاق قوينلوو) (١٣٧٨ - ١٥٠٢) كارەساتێكی گەورەيان لەم وولاتەدا نايەوە، لە كـوشتن و بڕين و تاڵان كـردن و سـووتاندن بەولاوە هيچ يادگـارێكی تريـان نەمـايەوە بۆ گێڕانـەوە لە دووا ڕۆژ دا. ديارترين ڕووداوێكی مێژووی كە كارێكی گەورەی كردبێتە سەر چارەنووس و دووا ڕۆژی كورد جەنگی چاڵديران بوو.

## جەنگی چاڵديران و دابەش كردنی كوردستان

لە سـاڵی ١٥١٤ لە دەشـتی چاڵديران گـەورەتريـن جـەنگ لەنێـوان سـوڵتـان سـەليـمی يەكـەمی عـوسـمـانی و شـا ئيـسـمـاعيـلی سەفـەوی ڕووی دا. ئەوی ڕاسـتی بێ ئەم جـەنگە جەنگێكی مەزهەبی بوو لە نێوان سوننە و شيعە، لەسەر داگير كردنی خاك و نەتەوەيێك كـە مـافی سـەربەسـتی و ئازادی خـۆی هەبوو. ئەوی زياتر ياريدەی سـەركـەوتنی سـوڵتـان سـەليـمی دا ئەوە بوو زۆربەی كـوردی ئەم ناوچەيە مـوسـوڵمـانی سـوننە بوون و زيـاتر دەشكانەوە لای عوسمانلی‌يەكان.

لە پاش سەركەوتنی عـوسمـانلی‌يەكـان سوڵتـان سەليم فـەرمـانڕەوايی كـوردسـتـانی دايە مـێـژوو نووسی دانا ئيـدريسی بتليـسی. لەمـەوە كـوردسـتـان بوو بە دوو بـەش، بەشـێكی كەوتە ژێر دەسەڵاتی سەفەوی‌يەكان، بەشەكەی تری لە ژێر دەسەڵاتی عوسمانلی‌يەكان بوو. ئيـتر ميرنشينی كورد لەناو هەر دوو دەوڵەت پەيدا بوو، وەكو شەمدينان، بۆتان، بايەزيد،

هەکاری، بادینان، سۆران، ئەردەڵان، بابان... هتد.

ئەم میرنشینانە سەربەخۆ بوون، گەلێ جار بەرهەڵستی دەوڵەتیان دەکرد، بەڵام بەگشتی میری ئەم میرنشینانە پێوەندییێکی تایبەتییان لەگەڵ سوڵتانی ڕۆم و شای عەجەم هەبوو، لەو کاتەی باج و سەرانەیان لە ڕەنجبەرو جووتیارو هەژاری کورد وەردەگرت، هەر خۆشیان باج و سەرانەیان دەدایە شای عەجەم و سوڵتانی ڕۆم.

لە ماوەی پێنج سەدەی دووایی دا، واتە پاش جەنگی چاڵدیران دوای ئەوەی سوڵتان سەلیمی یەکەم بەشێکی زۆری لە سەرووی کوردستان دابڕی و خستییە سەر خاکی سەڵتەنەت، خاکی کورد بە سنووری سیاسی لە یەک داپچڕاو دابەش کرا. بێ گومان گەلی کورد ناڕازی بوو لە سیاسەتی زەبرو زەنگ و زۆرداری و ستەمی بێگانە. خەباتی قارەمانی لە پێناو ئازادی و سەربەستی بە ئاوی زێڕ لە مێژووی نەتەوەی کورد تۆمار کراوە. ژمارەی هەڵسان و ڕاپەڕینی میللەت لە مێژووی کورد دا یەکجار زۆرە، بە تایبەتی بەهێزترینیان لە سەدەی نۆزدەم ڕوویان داوە. ئەم بزووتنەوانە بەڵگەی ئەوەن کە نەتەوەی کورد عەوداڵی ئازادییە هەرگیز کۆڵ نادا تا دەستی دەخا.

لە پاش ڕووخانی سەفەوییەکان (١٥٠٢ - ١٧٣٦) فەرمانڕەوایی ئێران کەوتە دەست بنەماڵەی کەریم خانی زەند (١٧٣٦ - ١٧٨٦)، ئەمەش ڕووداوێکی ئاسایی بوو، چونکە ئەگەرچی دەوڵەتی ئێران لە کۆنەوە هەمیشە بەشی میللەتی فارس بووە، بەڵام بە زۆری تا ئێستاش بنەماڵەی فەرمانڕەوا لە نەتەوەی تر بوون.

## سەدەی نۆزدەم

لە ماوەی سەدەی نۆزدەم دا سوڵتان و شا دەسەڵاتی سیاسی و ئابووریی خۆیان لە سەر کورد بەهێزتر کرد. هەندێ لە چینەکانی دەرەبەگی سەرەوەی کورد لەگەڵ داگیرکەرە عوسمانلی و فارسەکان یەکیان گرتبووەوە و میللەتیان دەچەوساندەوە، ئەمە بوو بووە هۆی ئەوپەڕی دوواکەوتوویی، لە دووا سالانی سەدەی نۆزدەم کوردستان یەکێ بوو لە ناوچە دوواکەوتووەکانی دوو دەوڵەتە داگیرکەرەکە. سیاسەت و ئایینی جیاوازی دوو دەوڵەتەکەو شەڕو شۆڕی نێوان دەرەبەگ و میرنشینە کوردەکان، تاوان و خیانەتی هەندێ لە دەسەڵاتداری کورد بوونە هۆی ئەوەی خەباتی کورد بۆ یەکێتی و دروست کردنی دەوڵەتی خۆی سەر نەگرێ. دەبێ ئەوەش بزانین کە لە دەوڵەتی ڕەسمی عوسمانلی و ئێران تا دووا سالانی سەدەی نۆزدەمیش میرنشینی کوردی سەربەخۆ لە ناوەوە بوون. بەڵام هیچ

یەکێکیان نەیتوانی ببێتە بنکە بۆ یەک گرتن و یەکێتیی خاکی کورد.

هەر لە سەدەی نۆزدەم دا بوو بیروڕای لە ناو بردنی میرنشینەکانی کورد کەوتە ناوەوە، بەرامبەر بەمە بیرو باوەڕی «کوردایەتی» بە شێوەییێکی تازە خۆی نوواند. سولتان مەحموودی دووەم بڕیاری دا دووبارە کوردستان داگیر بکاتەوەو دەستی بەسەردا بگرێ، وا بوو لە ساڵی ١٨٣٤ هێرشێکی بردە سەری و دەسەڵاتی بەسەرا سەپاند. ئەمە بووە هۆی ئەوەی بۆ یەکەمین جار بەدرخان پاشا لە ساڵانی ١٨٤٣-١٨٤٦ بزووتنەوەییێکی نەتەوایەتی بەشێوەییێکی تازە بەرپا بکا، بەڵام ئەو بزووتنەوەیە سەر نەکەوت.

لە ساڵی ١٨٥٥ لە ناوچەی هەکاری و بۆتان یەزدان شێر دژی دەسەڵاتی عوسمانلی هەڵسا، بتلیس و مووسڵی داگیر کرد، بەرەو خووارتر چوو، تا هەموو ناوچەکانی نێوان وان و بەغدای گرت. هەندێ لە دانیشتووانی کوردستان وەکو فەلەو گریکی (یۆنانی) لەژێر ئاڵای یەزدان شێر کەوتنە جەنگەوە، بەڵام ئەم بزووتنەوەیەش سەری نەگرت.

بزووتنەوەی ساڵی ١٨٨٠ بە سەرۆکایەتی شێخ عوبەیدوڵڵا بوو، ئەگەرچی ئەم بزووتنەوەیە ئەدگاری تایبەتیی خۆی هەبوو و لە بزووتنەوە و ڕاپەڕینەکانی تری کورد جیا دەکرێتەوە، بەڵام ئەمەش لەبەر هۆی تایبەتی هەر سەری نەگرت.

## سەرەتای سەدەی بیستەم

لەپێش جەنگی یەکەمی گیتی و لەماوەی جەنگ دا چەند جارێک کورد لە دژی دەسەڵاتی بێگانە ڕاپەڕی، بەڵام پێوەندی لە نێوان سەرۆکایەتی ئەم ڕاپەڕین و هەڵسانانە نەبوو. ئەمانە ڕێکخراو و پارتی وایان نەبوو کە سەرۆکایەتییان بکا، هەروەها بەرنامەی دیار کراویشیان نەبوو، لەبەر ئەوە بەئاسانی دەتووانرا ئەم بزووتنەوانە لە ناو ببرێن.

لە ماوەی جەنگی یەکەمی گێتیدا کوردستان بووە مەڵبەندو ناوچەی جەنگی خوێناوی نێوان لەشکری دەوڵەتە شەڕکەرەکان. وڵات ڕووخێنرا، بە سەدەها هەزار خەڵک کوژران یا لە برسانا مردن، ئەمە بووە هۆی ئەوەی کە بێزاریی میللەت زیاد بکا.

بە پێی پەیمانی سیڤەر کە لە ١٠ی ئاغستۆس ١٩٢٠ مۆر کرا، دەبوو هەندێ بەشی ئێمپیراتۆریەتی عوسمانلی لێی بپچڕێ، ئەمانە هەندێ ناوچە و هەرێمی نەتەوایەتی بوون، کوردستان یەکێک بوو لەوانە. پەرەگرافی گرنگی پەیمانەکە دروست کردنی دەوڵەتی کوردستان بوو. بۆ ئەم مەبەسە لیژنەییێک لە نوێنەرانی بەریتانیا و فرەنسە و ئیتالیا

دروست بوو. له پەیمانەکە داهاتووەکە دانیشتووانی کورد لە تورکیا بە نووسین داوایان لە کۆمەڵی نەتەوەکان کرد کە سەربەخۆیی‌یان دەوێ، پێویستە لەسەر دەوڵەتی تورک خۆی بکێشێتەوە لە کوردستان.

بەڵام ئەمە بازرگانی‌یێکی دیبلۆماسی‌ی دەوڵەتە ئەمپریالیستەکان بوو، چونکە دەست بەجێ و هەر لەپێشەوە بریاری ئەوەیان دابوو کە رێگە نەدەن کوردستان سەربەخۆ بێ. بەم جۆرە لە کۆنفرانسی لۆزان لەساڵی ١٩٢٣ بە تەواوی مەسەلەی کورد پشت گوێ خراو تەنیا ووشەیێکیش بەچاک و خراپ لەم بارەیەوە نەنووسرا.

## کورد لە تورکیا

لەماوەی بزووتنەوەی کەمالی‌یەکانا، لەو کاتەی کە تورکیا کەوتبووە مەترسی‌یەوە و خۆی لە پێش پیلانەکانی ئەمپریالیزم و هێزی دەرەوە رانەدەگرت، لەو کاتەدا کورد بەشداری‌یێکی تەواوی لە خەباتا کرد لە دژی هێزی بێگانە ئەوەی ئابڵۆقەی تورکیای دابوو. تەنیا کوردی کوردستانی تورکیا یاریدەی کەمالی‌یەکانیان نەدا، بەڵکو کوردی عیراقیش پارێزگاری و پاسەوانی سنووری رۆژهەڵاتی خوارووی تورکیایان کرد. میللەتی کورد گەلێ قوربانی لە پێناوی سەربەخۆیی تورکیا پێشکێش کرد. دەورێکی باڵاو گرنگی هەبوو لە خەبات دا لەپێناوی رزگار کردنی دەوڵەتی تورک لە دەسەڵاتی بێگانە. بەشداری کردنی لە خەبات دا لە پێناوی رزگاری‌ی تورکیا گەلێ گرنگ بوو، بەڵگەی ئەمە بیروڕای مێژوونووسی عەرەب سلێمان نەزیفە لە بابەت یادگاری سەربازی نەناسراو ئەوەی لە پێناوی رزگاری‌ی تورکیا لە جەنگی سەقاریا شەهید کراوە دەڵێ: «بێ گومان ئەم سەربازە دەبێ کورد بێ».

لەگەڵ ئەمەش دا وەزعی کورد لە وولات دا لە ئەوپەڕی خراپی دا بوو. هەموو بزووتنەوەیێکی کورد لە پێناوی مافی نەتەوایەتی دامرکێنرایەوە. پرۆپاگەندەیێکی بەهێز لە تورکیا دەکرا لە دژی کورد، بەوەی کە کورد لە بنەڕەت دا «بوونی» نی‌یە، لە بنج دا ئەمانە تورکن و زمانی زگماکی خۆیان لەبیر کردووە. پشکێنەری (موفەتیش) وەزارەتی زانیاری تورکیا نەجاتی بەگ گۆیا لە مێژووی کورد و زمانی کوردی «کۆڵیوەتەوە»، دەڵێ: «زمانی تورکە شاخاوی‌یەکان (واتە زمانی کوردی - م. خ.) بە درێژایی رۆژگار بەرە بەرە سواوە و تێک چووە».

چەوساندنەوەی میللەتی کورد لەڕووی کۆمەڵایەتی و نەتەوایەتی‌یەوە بووە هۆی ئەوەی

لە ساڵی **١٩٢٥** کوردی تورکیا دەست بکەن بە شۆرش لە دژی چەوسێنەرە تورکە کەمالی‌یەکان بە سەرۆکایەتی شێخ سەعید. ڕۆشنبیر و خوێندەواری کورد دەوری باڵای هەبوو لەم هەڵسانەدا. ئەم بزووتنەوەیە هەرێمێکی گەورەی لە کوردستانی تورکیا گرتەوە. دەسەڵاتی تورک بۆ شکاندنی ئەم ڕاپەرینە سوپاییێکی گەورەی بەکار هێنا. فرەنسا یارمەتی‌یێکی زۆری تورکی دا بەوەی ڕێگەی بۆ لەشکری تورک کردەوە کە لەقاپی‌ی سووریاوە هێرش ببەن، بەم جۆرە تورکەکان توانیان بەسەر کورد دا زاڵ بن و شۆرشەکە لەناو ببەن. بۆ ڕشتنی داغی دڵیان دەستیان کرد بە زوڵم و زۆری دژی هاوولاتیانی کوردی بێ چەک و بێ دەسەڵات. گەلێ گوند و دێهاتی کوردیان لەسەر ڕووی زەوی سڕی‌یەوەو منداڵ و پیرو ژنیان دەکوشت.

لە ڕۆژی **٢٥** ی حەزیرانی ساڵی **١٩٢٥** تورکەکان **٤٥** سەرۆک و کار بە دەستی شۆرشیان لە سێدارە دا، لە پێشەوەیانا شێخ سەعید بوو. بەڵام ئەم زۆرداری‌یە پڕ قینە هیواو ئامانجی کوردی لەناو نەبرد کە سەربەستی و ئازادی‌یە.

سەرۆکی هیندستان جەواهیر لال نەهرۆ دەڵێ: «لەساڵی **١٩٢٩** دا کورد بۆ جاری دووەم لە تورکیا ڕاپەڕی، بەڵام دیسانەوە دایانمرکاندەوە. بێ گومان ئەمە ڕووداوێکی وەختی‌یە. بە هیچ جۆرێ ناکرێ شۆرشی میللەتێک هەتا هەتایە لە ناو ببرێ کە ژیانی خۆی دەکا بە قوربانی لە پێناوی ئازادی دا».

لە ساڵی **١٩٢٧** لە پاش دوو ساڵ بەسەر چوونی هەڵسانەکەی شێخ سەعید، کورد جارێکی تریش دەستی دایەوە چەک و سیلاح. ئەم شۆرشەیان تا ساڵی **١٩٣٠** بەردەوام بوو، سەرۆکی ئەم شۆرشە ئیحسان نووری پاشا بوو. سوپای تورک بەهێزو بێ بەزەیی‌یانە ئەم هەڵسانەشیان دامرکاندەوە. عەشیرەتە کوردە بەهێزەکانیان ئاوارەی هەرێمە هەرە دوورەکانی ئەنەدۆڵ کرد. بەشی زۆری کوردی تری بە توانا ئاوارەی ناو گوندی تورک کران و بەسەر ناوچە تورکی‌یەکاندا دابەش کران. بەم جۆرە دەسەڵاتی تورک ویستی هێزی نەتەوەی کورد شل بکا بۆ ئەوەی توانای هەڵسانێکی تری نەبێ. بەڵام هەر چەندە زوڵمی کومەڵایەتی و نەتەوایەتی بەسەر کورددا بەهێزتر بووبێ زیاتر بێزاری‌ی میللەتی بووە بە دروشم و نەخشی لەناو دڵی ڕۆڵەکانی‌دا کێشاوە.

لەساڵی **١٩٣٧** کوردی دەرسیم ڕاپەڕین. هۆی ئەم هەڵسانە بەلای أ. سافراستیانەوە ئەوە بوو کە تورکیا سیاسەتی چەوساندنەوەو لەناو بردنی کوردی بەکار دەهێنا».

هەڵسانی کوردی ناوچەی دەرسیم پلەیێکی بەرزی هەبوو لەناو زنجیرە شۆرشەکانی کورد لە سەرەتای سەدەی بیستەم دا. رێکوپێکتر و خاوەن بەرنامە بوو، تەنیا جووتیار و فەللاح بەشداری‌یان تێدا نەکرد بەڵکو شارستانیش دەورێکی دیاریان هەبوو لەناو شۆرش دا، بەڵام هێزی چەکداری تورک ئاگری ئەم شۆرشەیان کوژاندەوەو زەبرو زەنگێکی زۆریان بەرامبەر هاووڵاتیانی کورد نواند.

لە ماوەی جەنگی دووەمی گیتی‌دا بزووتنەوەی رزگاری نەتەوایەتی کورد لە تورکیا بێ دەنگ بوو، هەروەها حوکوومەتی تورکیش بە ئانقەست و بە شێوەیێکی وەختی نەیدەویست بە ئاشکرا دژی هەستی نەتەوایەتی‌ی کورد بوەستێ. بەڵام لەپاش جەنگ و لە سەردەمی دەست درێژ کردنی ئەمەریکا لە دژی کۆریای باکوور حوکوومەتی تورک بۆ یارمەتی دانی کۆریای خوارووە لەشکری بۆ ناردن، سەربازی لەشکرەکە کورد بوون، لەو جێگا دوورە و لەسەر خاکی کۆریا بە سەدان لاوی کورد کوژران.

هەڵگەرانەوەی سوپایی یەکەمی شۆرشی ١٤ ی تەمووزی ساڵی ١٩٥٨ لە عیراقدا بووە هۆی ئەوەی بزووتنەوەی نەتەوایەتی‌ی کورد لە تورکیا و ئێران و سووریا ببووژێتەوە، هەروەها هەستی نەتەوایەتی میللەتی کوردی تا پلەیێکی دیار بڵند کردەوە لەناو ئەم وڵاتانەدا.

کار بەدەستانی تورکیا و ئێران دەستیان کرد بە چەوساندنەوەو هێرش بردنە سەر هاووڵاتیانی کورد، چونکە ئەم کوردانە لایەنگری خەباتی میللەتی عیراق بوون لە دژی ئەمپریالیزم و چەوساندنەوە. لەبەر ئەوە پاڵپشتی سەرۆکایەتی شۆرشی عیراقیان دەکرد بە تایبەتی لە ساڵی یەکەمی شۆرشدا. حوکوومەتی تورک لە ماوەی دوو ساڵی یەکەمی پاش شۆرشی عیراق سەدەها نیشتمان پەروەری کوردی خستە بەندیخانەوە لە ئەنقەرە و ئەستەمووڵ، تاوانی پێوەندی لەگەڵ رێکخراوی بێگانەی خستە پاڵیان. لە بابەت تیرۆر و زۆرداری‌یەوە رۆژنامەی «نێشنال گاردیان = National Gardian»ی ئەمەریکی دەنووسێ: «هۆی بنچینەیی ئەم گرتن و بەند کردنەی کورد لەبەر ئەوەیە چونکە کوردن. ئەمانە داوا لە حوکوومەتی تورک دەکەن کە بە کورد بیانناسن، نەوەکو بە تورکی شاخاوی هەروەها داوا دەکەن کە رێگە بدرێ بە چاپ کردنی گۆڤاری کوردی» (١١ی نیسانی ١٩٦٠).

رۆژنامەگەری رەسمی تورک هەمووی هێرش و جنێو بوو بۆ سەر کورد، بۆ بەڵگە رۆژنامەی «میللی‌یەت= Milliyet» ناوەرۆکی پەرەگرافەکانی دەستووری تورکیای بڵاو

کردەوە، بە تایبەتی ئەو بەندانەی هەموو ئەو کەسانە تاوانبار دەکا کە پێوەندییان بە کوردەوە هەبێ، ڕۆژنامەکە دەڵێ: «پەرەگرافی ۱۰۵ی دەستووری تورکیا دەڵێ ئەو کەسەی کورد هان بدا بۆ خەبات، بە پێی قانوون تاوانبار دەکرێ، بۆیە لە ژێر ڕۆشنایی ئەم پەرەگرافە پۆلیس مافی ئەوەی هەیە ئەم جۆرە کەسانە لەگەڵ خێزان و بنەماڵەکانیان ئاوارەی جێگەی دوور بکا» (۲۵ی تشرینی یەکەم ۱۹٦۰). حوکوومەتی تورک سەدەها کوردی خستە بەندیخانەوە تەنیا لەبەر ئەوەی لە نووسیندا ئەلفو بێی کوردییان بەکار هێنا بوو. لەم بابەتەوە ڕۆژنامەی «یەنی ئیستانبوول = yeni Istanbul» دەنووسێ: «ئەم ۵۰۰ کوردەی کە لە دیار بەکر بەندکراوون، کەسی کۆنەپەرستن، ئەمانە ئەلفو بێی کوردییان داناوە. ئەوی ڕاستیش بێ ئەوەیە زمانی کوردی هەمووی لە ٤۲۰۰ ووشە پێک هاتووە، لەمانە ۲۵۰۰ ووشەی تورکییە، ئەویتری عەرەبی و فارسییە. ئەم کەسانە ئەوانەی زمانیان بۆ خۆیان دروست کردووە، نەیانتوانیوە تەنیا ۵۰ ووشەی ڕەسەن بدۆزنەوە» (٦ تشرینی دووەم ۱۹٦۰). خاوەن ووتار ڕاستی دەشێوێنێ و هەڵی دەگێڕێتەوە، ئەم بیروڕایە هەتا پێچەوانەی گێرە شێوێنەکانی پێشووتری خۆشیانن، ئەمانە جەدوەلەکەی عەلی کەمالیشیان لەبیر چۆتەوە کە لەبارەی زمانی کوردییەوە لە کتێبەکەیدا درۆی هەڵبەستووە، زانیاریی عەلی کەمالی لەم بابەتەوە بەم جۆرەیە: لەپاش لەناو بردنی ڕاپەرینی کورد (۱۹۲۷ - ۱۹۳۰) لە تورکیا دەست کرا بە هێنانە دی سیاسەتی گۆڕینی ڕووی نەتەوایەتیی کورد، واتە بە تورک کردنی کورد. بۆ ئەم ئامانجە لە ساڵی ۱۹۳۲ والیی ویلایەتی ئەرزنجان عەلی کەمالی لە کتێبەکەی دا «ئەرزنجان» جەدوەلی بۆ زمانی کوردی داناوە، بە پێی ئەو جەدوەلە ئەوە دەخاتە ڕوو کە زمانی کوردی لە ۸٤۲۸ ووشە پێک هاتووە، لەمانە ۳۰۸۰ یان بریتین لە ووشەی کۆن و تازەی تورکی، ۲۰۰۰ یان ووشەی عەرەبی تازەن کە لە زمانی تورکیدا بەکار دەهێنرێن. ووشەکانی تر لە زمانەکانی ئێرانی و ئاسووری و گورجی و چەرکەسی وەرگیراوون، تەنیا بەلای ئەوەوە لەوانەیە ۳۰۰ ووشە کوردی کۆن بن. (Ali Kemali, Erzincan [S. 1], 1932).

بەڵام لەگەڵ هەموو ئەم چەوساندنەوە و پلیشاندنەوەو زۆردارییە میللەتی کورد لە تورکیا بەردەوام بوو لە خەباتی دا لە پێناوی پاراستنی پەیکەری نەتەوایەتیی خۆی، بە تایبەتی زمانی زگماکی.

بزووتنەوەی نەتەوایەتی کورد لە کوردستانی تورکیا ڕۆژ لە دووای ڕۆژ زیاتر پەرەی

سەند. لە ٨ ی مایسی ١٩٦١ لە شارە جیاوازەکانی کوردستانی تورکیا، بە تایبەتی لە مێردین و دیاربەکر و بتلیس و وان ڕاپەڕینی گەلی کورد دەستی پێ کرد. هەزاران خەڵک بەشداریی خۆ پیشاندانیان کرد، دروشم و بەیداغیان هەڵکرد، داوایان ئەمانە بوو: «ئێمە تورک نین، ئێمە کوردین»، «بڕووخێ زۆرداری»، پێویستە «تورک دان بە مافی نەتەوایەتیمان دا بهێنێ». ئەم خۆ پیشاندانە ئاشتیخوازەی کورد لەخوێن وەردرا. لەشارە کوردەکان دا سەدەها کوردی نیشتمان پەروەریان کوشت و ژمارەی زیاتریشیان بریندار کرد.

## کورد لە ئێران

کوردستانی ئێران لە گەلێ شت دا وەکو کوردستانی تورکیا وابوو. ناوچەکانی کوردستان یەکێک بوو لە هەرێمە هەرە دوواکەوتووەکانی ئێران. ڕژێمی دەرەبەگایەتی باڵی بە سەر کۆمەڵا کێشا بوو خۆی خاوەن دەسەڵات بوو، کار بەدەستانی ئێرانیش وەکو کار بەدەستانی تورکیا سیاسەتی لەناوبردنی مافی نەتەوایەتی نەتەوەکانی نافارسیان بەکار دەهێنا. بە شوێن هەموو جۆرە بەڵگەیێک دەگەڕان، لە پێش هەموو شتێک دا زمانی کوردی وەکو زمانێک لە بنەماڵەی ئێرانی بوو بووە بنیشتەخۆشەو بەڵگەی ئەوە کە زمانی کوردی دیالێکتێکی فارسییە، واتە زمانی کوردی فارسییە. لەگەڵ ئەوەی لە ئێرانا دانیان بەوەدا هێناوە کە کورد هەیە، بەڵام جیاوازییێکی ئەوتۆ لە نێوان ئێران و سیاسەتی چینەکانی سەروو و دەسەڵات بە دەستی تورکیا بەرامبەر بە کورد نییە. لە بنج دا هەر دوولایان لەوە یەکیان گرتبوو کە نەتەوەییێک بەناوی کوردەوە نییە و هەوڵی تەواویشیان دەدا کە ئەدگاری نەتەوایەتیی لەناو ببەن. نوێنەری مەجلیسی شوورایی میللی کۆنەپەرست و پان ئێرانیستی ناودار دەشتی دەڵێ: «لە ئێرانا مەسەلەی کورد لە گۆڕێ نییە، هەروەها لێرە تەماشای کورد ناکرێ وەکو میللەتێک، بەڵکو لەگەڵ فارس دا لە یەک نەژادن».

ئەمەیە ئەستووری ئیدیۆلۆجیەتی «پان ئێرانیزم»، بێ گومان ئەمە زیانی بۆ کورد لە هەموو کەسێکی تر زیاترە.

چەوساندنەوەی نەتەوەکانی کوردستان و ئازربایجانی ئێران بووە هۆی ئەوەی چەک هەڵگرن و لە ڕووی زۆرداریی ڕەزا شا بووەستن. لە هاوین و پاییزی ساڵی ١٩٢٦ شۆڕش ناوچەکانی سەروو و خووارووی کوردستانی ئێرانی گرتەوە. هەروەها لەو ماوەیەدا

پارتی و ڕێکخـراوی نەتەوایەتیی کـوردی پەیدا بوون. ئەمـە بزووتنەوەی نەتەوایەتیی کـوردی خـسـتـە ناو قـاڵـبـێـکی ڕێکوپێکەوە و پێـوەندیشی لەگـەڵ خـەباتی ڕزگـاریی نەتەوایەتیی میللەتانی تری ئێران پەیدا کرد.

لە مـاوەی پێش جەنگی دووەمی گـێـتی لە کـوردسـتـانی ئێـران «حـیـزبی ڕزگـاریی کوردستـان» پەیدا بوو. لەو سەردەمەی کە لەشکری سووری یەکێتیی سۆڤیەت بە پێی پەیمانێکی سوێند خۆرەکان هاتە ناو ئێرانەوە، گۆڕانێکی بنچینەیی لە بەرنامەی حیزبی ڕزگاریی کوردستان ڕووی دا، ناوی حیزبەکە گۆڕرا و بوو بە «ژ. ک. = ژیانەوەی کورد».
ئەم کۆمـەڵەیە دەستی کرد بە بڵاو کردنەوەی چاپەمـەنی، دیارترین چاپەمـەنییان کۆواری «نیشتمان» بوو. لە ساڵی ١٩٤٥ لە سەر بنچینەی «ژ. ک.» حیزبی دیموکراتی کوردستان دروست کرا.

لە پاش جەنگی دووەمی گـێـتی و لە کـانوونی یەکـەمی ١٩٤٥ کـۆمـاری کـوردسـتـان و کـۆمـاری ئازربایجـان پەیدا بوون. هەمـوو مـیللەتی کورد و نەتەوە ئازادیخـوازەکـانی تری جیـهـان بە شـادییەوە پێـشـوازیی کـۆمـاری کـوردی سەربەخـۆیان کـرد. مـیللەتی کـورد بە هەمـوو هێزیەوە پارێزگـاری کۆمارە نەوزادەکەی خۆی دەکرد، بەڵام هێزو تووانای دەوڵەتی ئێـران و کـۆمـارە سـاواکـەی کـورد لە یەک پلەدا نەبوون! هێـزی چەکـداری دەسـەڵاتی کۆنەپەرستی ئێـران تووانی بزووتـنەوەی کورد دامـرکێنێـتـەوە، ئەوەی یـاریدەی تەواوی لە ناوبردنی کـۆمـاری کـوردسـتـانی دا دەرچوونی سـوپای سـوور لە ئێـران و بایەخ نەدانی یەکـێـتـیی سـۆڤـیـەت بە مـەسـەلەی کـورد بوو، لەلایێکی ترەوە یارمـەتیی بەهێـزی ئەمـپـریالیـزم بـوو چونکە نوێنەری لە شـای ئێـران چاکـتـری بۆ نە دەدۆزرایەوە لەم هەرێمە گرنگە ستراتیجییەدا.

لە مارت و نیـسـانی ١٩٤٧ هەمـوو سەرۆکەکـانی کۆمـاری کوردیان لە سێدارە دا، لە سەرووی هەموویانەوە سەرۆکی حیزبی دیموکراتی کوردستان و سەرۆکی کۆماری کورد قازی محـەمەد. لە بابەت خنکاندنی قـازییەوە پارێزەری ناوداری ئەمـەریکی وولیـەم دوگلاس دەڵێ: «لە سێدارەدانی ئەم قارمانە کوردە بووە هۆی مردنی تاقە کەسێک، نەوەکو مردنی کوردایەتی، مردنی ئەو هێزی تازەی خستە ناو ئەم کوردایەتییەوە».

لە پاش شۆڕشی ١٩٥٨ و دەرچوونی عـیراق لە پەیمانی بەغدا، هەندێ لە کۆنەپەرست و دوواکەوتووانی عـیراق لەگەڵ نوێنەرانی دەرەبەگ و کـۆنەپەرستی کورد ڕایان کردە ئێران.

لێره لەگەڵ هەندێ کوردی ئێران دەستیان کرد بە دەرکردنی ڕۆژنامەی «کوردستان». ئەگەر چی مەبەسی بنچینەیی ئەم ڕۆژنامەیە بڵاو کردنەوەی ئیدیۆلۆجیەتی پان ئێرانیزم و پرۆپاگەندە بوو لە دژی شۆرشی عیراق، بەڵام وەکو سەرچاوەیێک بۆ لێکۆڵینەوە لە زمان و ئەدەبی کوردی ناخرێتە پشت گوێ.

## کورد لە عیراق

لە مایسی ساڵی ١٩٢٠ دەوڵەتی عیراق دامەزرێنرا، بەڵام دەوڵەتی سەربەخۆی تەواو نەبوو، خرایە ژێر چاودێریی بەریتانیا. لەم ماوەیەدا کوردی ناوچەی سلێمانی بە سەرۆکایەتی شێخ مەحموود هەڵسان، ئەم هەڵسانە زۆری خایاند و لە سەرکەوتن و ژێرکەوتن دا بوو تا سیەکانی ئەم سەدەیە.

لە ٢٤ی کانونی یەکەمی ساڵی ١٩٢٢ حوکوومەتی تازەی عیراق و بەریتانیا ناچار بوون بەیانێک بڵاو بکەنەوە، لە بەیانەکەدا بڕیاریان دا کە دەوڵەتی کوردستان لە ناوچە کوردنشینەکانی عیراق دا دروست بکەن، بەڵام ئەمە ساختەکارییێکی دیبلۆماسی ئەمپریالیزمی ئینگلیزی بوو، هەوڵیان دا بەمە کورد بخەڵەتێنن و هەر لەو کاتەش دا بیروڕای کۆمەڵانی جیهان دابین بکەن، بۆ ئەوەی خۆیان کۆبکەنەوەو لە دوواییی دا بزووتنەوەی کورد لە ناو ببەن.

کە بۆ کورد دەرکەوت ئەمپریالیزمی ئینگلیزی بەڵێنەکانی ناهێنێتە دی، دەستی کرد بەخۆ کۆکردنەوە بۆ شۆرش. لە هەولێر و سلێمانی هەتا لە بەغداش خوێندەوارو ڕۆشنبیری کورد ڕێکخراوی نەتەوایەتییان دامەزراند. لەگەڵ هەموو میللەتی کورد میللەتی عەرەبیش خۆی ئامادە کرد بۆ خەبات لە دژی دەسەڵاتی ئینگلیز. بە ڕاستیش ڕژێمی کۆلۆنیالی لە عیراق دا سیاسەتی بەڕێوە دەبرد.

سەربەست نەبوونی عیراق لە کاروباری دەرەوەو ناوەوەی بووە هۆی ئەوەی لە چووار چێوەی کۆمەڵێکی کشتوکاڵی دوواکەوتوو نەچێتە دەرەوە، دەرەبەگ و نوێنەرانی حوکوومەت لە مووچەخۆرە گەورەکانی دەوڵەت گوند و دێهاتیان بەڕێوە دەبرد. سیاسەتی کۆنەپەرستی و دوواکەوتوویی عیراق دەسەڵاتی ئینگلیزی لە وڵات دا بەهێز کرد بوو. پیلانی ڕێکوپێک بۆ چەوساندنەوەی میللەتی کورد دانرا بوو. ئەمە هەمووی بووە هۆی ئەوەی بێزاری بکەوێتە ناو هەموو بەشەکانی کۆمەڵ، کورد لە دژی زوڵم و زۆری و چەوساندنەوەی نەتەوایەتی لە خەباتا بوو، بەم جۆرە بزووتنەوەی ڕزگاری نەتەوایەتی کورد

هەر لە سەرەتای پەیدا بوونیدا ئاشکراو دیار بوو کە دژی ئەمپریالیزمی بێگانەی دەرەوەیە.

ڕۆژی ٦ی ئەیلوولی ١٩٣٠ دەست نیشان کرا بوو بۆ هەڵبژاردنی ئەندامانی پەرلەمانی عیراق لە سلێمانی. دەبوو ئەو پەرلەمانە هەڵبژێرراوە تازەیە پەیمانی ساڵی ١٩٣٠ی نێوان بەریتانیا و عیراق مۆر بکا، ئەو پەیمانەی زیاتر دەسەڵاتی ئینگلیزی بەسەر عیراقا دەچەسپاندو بەهێزتری دەکرد. لە پەیمانەکەدا بە هیچ جۆرێ مەسەلەی کورد نەهات بووە ناوەوە و باسی لێوە نەکرا بوو. بە تەواوی ئاشکرا بوو کە ئەمپریالیزمی بەریتانی بیری لەوە نەکردبووەوە کە دان بە مافی نەتەوایەتیی کورد بنێ. لە ڕۆژی هەڵبژاردن دا کوردی شاری سلێمانی ڕاپەڕی، سوپای عیراق بە یارمەتیی ئینگلیز خەڵکیان گوللە باران کرد. شێخ مەحموود لەو کاتەدا لەگەڵ چەکدارەکانی لە شاخا بوو، کە بیستی دوژمن کوردی گوللە باران کردووە و خوێنی ڕشتووە، بەسەر سلێمانی دادا. حوکوومەت لەشکرێکی گەورەی ناردە سەر کورد لەگەڵ چەک و سیلاحێکی زۆر بە تایبەتی هێزی هەوایی بەریتانیا. شۆڕشگێڕەکان تووانای ئەوەیان نەبوو بەرهەڵستی ئەم هەموو لەشکرە بکەن. ڕۆژی ٣٠ تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٣٠ شێخ مەحموود ڕاپۆرتێکی بۆ کۆمەڵی نەتەوەکان نارد، لە ڕاپۆرتەکەدا دەڵێ: «... ئەگەر ئینگلیزەکان یارمەتیی کورد نادەن لە خەباتیان دا لە پێناوی سەربەستی دا با دەست لە کارو باریشیان وەر نەدەن، بەم جۆرە پێویستە کورد تەنیا بەهێزی تایبەتیی خۆی بنازێ». بەڵام هێزی هەوایی بەریتانیا بەردەوام بوو لە بۆردومانی شارو دێهاتی کورد، لە پاشانا لە حەزیرانی ساڵی ١٩٣٢ قۆمیسەری باڵای پێشووی ئینگلیز لە عیراق دا ویلسون دەڵێ: «لە ماوەی دە ساڵی دووایی هێزی هەوایی مەملەکەتی بەریتانیا بێ بەزەییيانە هاوولاتی کوردی بۆمبا باران دەکرد».

ڕاپەڕینی کوردی سلێمانی لە ساڵی ١٩٣٠ بە شێوەیێکی دڕندانە دامرکێنرایەوە، بەڵام بزووتنەوەی ڕزگاریی نەتەوایەتی کورد دیسانەوە لە ناوچەی باکووری کوردستانی عیراق سەری هەڵدایەوە. لە ساڵی ١٩٣١ بارزانییەکان بە سەرۆکایەتی شێخ ئەحمەدی بارزان هەڵسان. هۆی بنچینەیی ئەم هەڵسانەش هەر ئەوە بوو حوکوومەتی عیراق بە فەرمانی ئینگلیز کە لە ژێر حیمایەی بوو مافی میللەتی کوردی لە عیراق نە دەدا. لەو ڕۆژەی کە دەوڵەتی عیراق دروست بوو بایەخێکی ئەوتۆ بە ڕۆشنبیری و خوێندەواری و تەندروستی ناوچە کوردییەکان نە دەدرا، بە تایبەتی ناوچەی بارزان.

لە ساڵی ١٩٣٥ بارزانیەکان جارێکی تر لەژێر فەرماندەی خەلیل خۆشەوی هەڵسان. بۆ لە ناوبردنی ئەم هەڵسانە، هێزی ئاسمانی بەریتانیا بەشداریێکی تەواوی کرد. لایە کۆنەپەرستەکانی حوکومەتی عیراق بە پێی ئارەزووی بێگانە هەموو جارێک کە لە کوردستان دا خەڵکی ڕادەپەڕین بەڵێنیان دەدایە کوردەکان کە داوایان جێ بەجێ دەکرێ و مافی خۆیان وەردەگرن، دیارە ئەمە بەڵێنی ناڕاست بوو درۆیان لەگەڵ دا دەکردن، بۆ ئەوەی وەخت ببەنە سەرو خۆیان کۆ بکەنەوەو جارێکی تریش بەسەر کورد دابدەن. بەڵام میللەتی کورد دووبارە و سێ بارە چەکی هەڵدەگرت و هێرشی دەبرد بۆ وەدەست خستنی مافی نەتەوایەتی ی خۆی.

لە ساڵی ١٩٤٣ لە کوردستانی عیراق دا شەپۆلێکی تری بزووتنەوەی ڕزگاریی نەتەوایەتی کورد پەیدا بوو. ئەمە لە ژێر فەرماندەی مستەفا بارزانی بوو، ئەم شۆڕشە نزیکەی دوو ساڵ بەردەوام بوو تا ساڵی ١٩٤٥.

حوکومەتی کۆنەپەرستی عیراق و داگیرکەری ئینگلیز وەکو سەرکەوتوویێک لە جەنگی جیهانی دووەم هەموو هۆیێک بۆی ئامادە بوو شۆڕشی کورد دامرکێنیتەوە و شۆڕشگێڕ و چەکداران تەنگە تاو بکا بۆ ئەوەی خاکی خۆیان بەجێ بهێڵن. ئیتر مستەفا بارزانی لەگەڵ کۆمەڵە خەڵکەکەی خۆی سنووری عیراقیان بڕی و چوونە ناو کوردەکانی ئێران لە مەهاباد کە پایتەختی کۆماری کوردستان بوو، لە پاش لە ناوبردنی بزووتنەوەی کورد لە ئێرانیش دا بارزانی لەگەڵ ئەو هێزانەی خۆی کە مابوونەوە ناچار بوو لە سنووری یەکێتی سۆڤیەت بچێتە ژوورەوە و داوای پەنابەری سیاسی لە دەوڵەتی سۆڤیەت بکا.

دەوڵەتی عیراق لە پاش لە ناوبردنی بزووتنەوەی بارزانییان دەستیان کرد بە زوڵم و زۆری و چەوساندنەوەی هاووڵاتییەکانی ناوچەکە بە تایبەتی بارزانییان. گەلێ لە نیشتمان پەروەرە کوردەکانیان خستە بەندیخانەوە، بە تایبەتی گەنج و لاو، پیر و ژن و منداڵیشیان ئاوارەی خوارووی عیراق کرد.

لە ١٩ ی حەزیرانی ساڵی ١٩٤٧ لە بەغدا چووار ئەفسەری کورد لە سێدارە دران، ئەمانە بە شداریيان لە شۆڕشی ساڵانی ١٩٤٣ - ١٩٤٥ کرد بوو (کەپیتان عیزەت عەبدولعەزیز، کەپیتان مستەفا خۆشناو، لیفتینانت خەیروڵڵا عەبدلکەریم، مولازمی پلە دوو محەمەد مەحموود قودسی).

ڕێکخراو و پارتی نەتەوایەتی کورد ئەوانەی لە ناوەڕاستی سییەکانی سەدەی بیستەم

پەیدا بوون دەورێکی باڵایان بینی لە ڕێبەری و سەرۆکایەتی بزووتنەوەی ڕزگاریی نەتەوایەتی لە ناو کوردی عیراق دا.

لە ساڵی ١٩٣٥ لە کوردستانی عیراق حیزبی نەتەوایەتیی کورد «هیوا» پەیدا بوو. ئەم حیزبە هەموو نیشتمان پەروەرو خوێندەوارو ئەفسەرانی سوپای لە دەوری خۆی کۆ کردەوە، دەورێکی گەورەی نیشتمان پەروەری و کوردایەتی بینی لە بزووتنەوەی نەتەوایەتیی کورد دا.

لە ماوەی جەنگی دووەمی گێتیدا لە کوردستانی عیراق ئیدیۆلۆجیەتی مارکسی (مارکسیزم) پەیدا بوو و بڵاو بووەوە، کارێکی گەورەی کردە سەر خوێندەوار و ڕۆشنبیری کورد، ئینجا پارتی کۆمۆنیستی عیراق دروست بوو و دەورێکی باڵای هەبوو لە پرۆپاگەندە لە ناو خوێندەواری کوردا.

لە چلەکانی ئەم سەدەیەدا ئەندامانی چەپڕەوی پارتی «هیوا» لەگەڵ نیشتمان پەروەرەکانی تری کورد پارتی پێشڕەو و نوێخوازی «شۆڕش» یان دامەزراند. نوێنەرانی بۆرجوازیی نەتەوایەتی کوردیش پارتی «ڕزگاری» یان دامەزراند، پارتی «هیوا» و «ڕزگاری» جەبهەی نیشتمانیان دروست کرد.

لە هاوینی ساڵی ١٩٤٦ کۆنفرانسێک لە نێوان پارتی کۆمۆنیستی عیراق و هەندێ ڕێکخراوی سیاسی کورد بەسترا، لە ئەنجامی ئەم کۆنفرانسە بەشێک لە ئەندامانی پارتی «شۆڕش» چوونە ناو پارتی کۆمۆنیستی عیراقەوە، بەشەکەی تر چوونە ناو پارتی «ڕزگاری» یەوە، ئەمانەش جوونە ناو (پارتی دیمۆکراتی کورد) کە لە دوای ماوەییێک ناوی بوو بە (پارتی دیمۆکراتی کوردستان).

لە پاش جەنگی دووەمی گێتی لە عیراقا جارێکی تر خەباتێکی تیژ لە ناو میللەت دا پەیدا بوو لە دژی پەیمانی ئەنگلۆ - عیراقی ساڵی ١٩٣٠. هەروەها حوکومەتی عیراقیش دەیویست ئەم پەیمانە بگۆڕێ، لە لایێک بۆ ئەوەی میللەت هێمن بکاتەوە چونکە داوای هەڵوەشاندنەوەی پەیمانەکەی دەکرد، لەلاییێکی ترەوە خۆی بەهێزبکا بۆ ئەوەی پەیمانێکی پوختتر لەگەڵ ئینگلیز ببەستێ و زیاتر چاکەی داگیرکەری تێدابێ.

لە ڕۆژی ١٥ ی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٤٨ لە شاری پۆرتسمۆت کۆبوونەوەو گفتوگۆ دەستی پێ کرد بۆ ئامادە کردنی پەیمانی تازە لە نێوان عیراق و بەریتانیا. میللەت دژی ئەم گفتوگۆیە بوو، بۆ ئەم مەبەستە لێشاوی خۆپیشاندان هەموو لاییێکی عیراقی

گرت بووەوە و ئەم ڕاپەڕینە حوکوومەتی عیراقی ناچار کرد لە گفتوگۆ کردن بوەستێ، چونکە خەڵکی عیراق سوور بوون لەسەر ئەوەی هەموو قوربانی‌یێک بدەن تەنیا ئەم پەیمانە سەر نەگرێ. بەڵام حوکوومەت توانی تۆڵەی خۆی بکاتەوە، زەبرو زەنگی دەوڵەت دەستی پێ کرد، بە تایبەتی کەوتنە قەلاچۆ کردنی هێزەکانی دیمۆکراتی و کۆمۆنیست و نیشتمان پەروەرانی تری عیراق. گەلێ ڕۆڵەی بێ تاوانی میللەتیان بەبێ خەتا خستە بەندیخانەوە، هەندێ لە سەرۆکەکانی کۆمەنیستیان لە سێدارە دا، سەدەها نیشتمان پەروەر لە بەندیخانەکان دا ئازار دران، هەندێکیان لە ئەنجام دا مردن.

ئەم هێرشە خوێناوی‌یە بۆ سەر نیشتمان پەروەرو پیشکەوتنخواز و دیمۆکراتی یانی عیراق، هەروەها بەربەرەکانی کردنی مافی نەتەوایەتی میللەتی کورد، ئەگەر چی بەڵگەی بەهێز بوونی کۆنەپەرستی بوو لە عیراقا لەو سەردەمەدا، بەڵام هەر چەندە کۆنەپەرستی بەهێزتر بێ زووتر دەڕووخێ.

سەر بە ئەمپریالیستەکان هەوڵیان دەدا وولاتانی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست بە پەیمانێکی جەنگی بە یەکتری ببەستنەوە، ئەمە نەک تەنیا دژی یەکێتی‌ی سۆڤیەت بوو، بەڵکو بۆ بەربەرەکانی بزووتنەوەی نەتەوایەتی و نیشتمانی و چینایەتی کۆمەلانی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستیش بوو. لە ئەنجامی پرۆژەی ئەمەریکا لە ساڵی ١٩٥٥ «پەیمانی بەغدا»ی جەنگی دانرا. لە بنج دا پەیمانی تورکی - پاکستانی بوو بە بنیادی ئەم پەیمانە تازەیە لە پاش ئەوەی کە عیراق بەشداری تێدا کرد.

شۆڕشی ١٤ ی تەمووزی ساڵی ١٩٥٨ ڕژێمی مەلیک و نووری سەعیدی ڕووخاند، دەسەلاتی ئینگلیزە ئەمپریالیستەکانی لابرد، بەمە دەسەلاتی بێگانە لە ناوچوو. ئەم شۆڕشە لە چاکەی هەموو میللەتی عیراق دا بوو، زۆرترین بەشی جەماوەری میللەت بەشداری‌یان تێدا کرد. بەڵام زوو بەزوو دیمۆکراتیەت کەوتە لێژی و عەبدولکەریم قاسم حوکمی بەرەو دیکتاتۆری دەبرد و کەوتە بەربەرەکانی‌ی مافی نەتەوایەتی کورد، بەمە دەوری مستەفا کەمال و ڕەزا شا و حەمە ڕەزا شای بەرامبەر بە کوردی عیراق تازە کردەوە. کوردیش ناچار بوو چەک هەڵگرێ بۆ بەرگری و پاراستنی مافی نەتەوایەتی خۆی.

## کورد لە سووریا

بەشێک لە میللەتی کورد لە پاش ڕووخانی دەسەلاتی عوسمانلی کەوتە سووریا. لە ساڵی ١٩٣٠ بەم لاوە هەندێ لە ڕۆشنبیرو خوێندەواری کوردی سووریا و برێکیش لە

دەرەوە چوو بوونە ئەوێ ئەمانە هەوڵیان دەدا بۆ چاکەی کورد کۆشش بکەن. لە سووریاو لبنان چاپەمەنیی کوردییان دەمەزراند، دەستیان کرد بە دانانی ئەلفوبێیێکی کوردی لەسەر بنچینەی لاتینی. نەوەی بەدرخان دەورێکی بالایان هەبوو لەپێش خستن و پەرەسەندنی چاپەمەنی و نووسینی کوردی لە ڕێی ڕۆژنامە نووسی و کتێب و نامیلکە و سیپارە بلاو کردنەوە.

لە پاش جەنگی دووەمی گێتی و دەست خستنی سەربەخۆیی تەواو لە سووریا، ماوەی کۆدەتاو وەرگێڕانی دەسەلات بەهێزی سوپا دەستی پێ کرد. کورد ژیانی کەوتە لێژی و مافی نەتەوایەتی کەوتە مەترسییەوە، چاپەمەنی کوردی قەدەغە کرا، گەلێ لە خوێندەوارو نیشتمان پەروەری کوردی بەوە تاوانبار کران کە بیرو باوەڕی مارکسیزمی و دژی نەتەوەی عەرەبیان هەیە، سەبارەت بەمە خرانە بەندیخانەوە. تا وای لێ هات ناوی کوردی لە منداڵی کورد قەدەغەکرا و ناوی گوندو دێهات و ناوچە کوردییەکان لە سووریا بە عەرەبی گۆڕایەوە.

ئەم دیاردەیە وا مایەوە تا ٢٣ی شوباتی ١٩٦٦، حوکوومەتێکی تر هات و هەندێ ئەم زەبروزەنگەی سووکتر کردو وەزعی کورد باشتر بوو.

## کورد لە رووسیەو یەکێتیی سۆڤیەت

لە سەرەتای سەدەی نۆزدەم (١٨٠٤ - ١٨٠٥) لە پاش سەرکەوتنی تسیتسیانۆڤ لە جەنگی ڕووس لەگەڵ عەجەم و مۆرکردنی پەیمانی گولستان لە ساڵی ١٨١٣ ناوچەی ئەلیزابیت پۆل کەوتە ناو خاکی ڕووسەوە، بەمە بەشێک لە کورد بوو بە هاوولاتی ڕووسیا، وە لە پاش هێرشی تورکمانەکان لە ساڵی ١٨٢٨ کوردەکانی ناوچەی یەریڤانیش لە وولاتی ئێرانەوە هاتنە ناو ڕووسیا، لە ساڵی ١٨٧٨ لە ناوچەکانی قارس و ئەردەهانیشەوە گەلێ لە کوردەکان کۆچیان کردە خاکی ڕووسیا.

کورد لە وولاتی ڕووسیا یەکێ بوو لە میللەتە بچووکە دووا کەوتووەکان، ئەمەش بۆ ئیمپراتۆریەتی ڕووس شتێکی سەیر نەبوو، گەلێ میللەتی تریشی لێ بوو کە لە کوردیش دوواکەوتووتر بوون.

لە پاش شۆڕشی ئوکتۆبەر لە ساڵی ١٩١٧ەو چەسپاندنی دەسەلاتی تازەی سۆڤیەت لە هەموو خاکی ڕووسیای قەیسەری کۆن ، بە تایبەتی لە ناوچەکانی قەفقاس و ئاسیای

ناوەڕاست کوردی ڕووسیەی کۆن بە کۆمەڵ لە گەلێ جێی جیاواز دەبینران:

### ١- ئەرمەنستانی سۆڤیەت

کوردی ئەرمەنستانی سۆڤیەت لە ناوچەی یەریڤان و ئەلەگەز دەژین. شاخی ئەلەگەز و دێهات و ئاواییی دەوروبەری پارچەیێکە لە خاکی کوردستان و کشاوەتە ناو کۆماری ئەرمەنستانی سۆڤیەت. زۆربەی هەرە زۆری کوردی ئەرمەنستان بە ئایین یەزیدین، تاکو تووک موسوڵمانی سوننییان تێدایە. لە پاش دامەزراندنی دەسەلاتی سۆڤیەت هەندێ مافی نەتەوایەتییان وەرگرت، وەکو خوێندن بە زمانی دایک و چاپ کردنی کتێبی کوردی هەمەجۆرو دەرکردنی ڕۆژنامەی «ریا تازە» کە تا ئێستاش هەفتەی دووجار دەردەچێ، هەروەها ڕادیۆو شانۆو قوتابخانەی خۆشیان هەیە.

### ٢- ئازربایجانی سۆڤیەت

کوردی ئەم وولاتە لە ناوچەکانی لاچین و کەلبەجاڕ دەژین، بە ئایین موسوڵمان و بە مەزهەب شیعەن. لە سەرەتای دامەزراندنی سۆڤیەت مافی خوێندەوارییان هەبوو، قوتابخانەی کوردی هەبوو، کتێبی کوردی قوتابخانەکان بە زمانی کوردی تیپی لاتینی چاپ دەکرا. بەڵام ئەمە زۆری نەخایاند و پێش جەنگی دووەمی گێتی مافی نەتەوایەتی نەماو کورد لە ناو ئازربایجانی یان تووانەوە، هۆی سەرەکی بۆ ئەمە ئەوەیە کە کورد و ئازربایجانی هەر دوو لایان موسوڵمان و بە مەزهەب شیعەن. دروشمی دەسەلات بە دەستانی ئازربایجان ئەوە بوو کە «ئێمە موسوڵمانین!» دیارە بە مانا ئەنترۆپولۆجییەکەی، نەک بە مانا ئایینییەکەی، ئیتر ئەمە بووە هۆی تووانەوەی کورد لە ناو ئازربایجانییان.

### ٣- گورجستانی سۆڤیەت

کوردی ئەم کۆمارە بە ئایین یەزیدین، بە زۆری لە شاری تفلیسی پایتەخت دەژین، ئەمانە تا ئێستاش پارێزگاری زمانی خۆیان و ئەدگاری نەتەوایەتییان کردووە، ڕێکخراو و یانەی ڕۆشنبیریی خۆیان هەیە، پێوەندییان لەگەڵ کوردی ئەرمەنستانا بەهێزە، کتێب بە زمانی گورجی و رووسی لەسەر کورد بڵاو دەکەنەوە.

### ٤- تورکمانستانی سۆڤیەت

کوردی ئێرە لە ناوچەکانی دەوروبەری ماری دەژین (ماری شاری مەرۆی مێژوویی

کۆنە) ، ئەمانە کوردی موسوڵمانی شیعەن، لە سەرەتای دامەزراندنی دەسەڵاتی سۆڤیەت قوتابخانەی کوردی و کتێبی کوردییان هەبوو بە تیپی لاتینی. بەڵام پێش جەنگی دووەم ئەم مافەیان لێ سەندرایەوە، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا کوردی تورکمانستانی سۆڤیەت تا ئێستاش پارێزگاریی ئەدگاری نەتەوایەتیی خۆیان کردووە، وەکو کوردی ئازربایجان مەترسی تووانەوەیان نییە، چونکە ئەمانە وەکو ووترا بە مەزهەب شیعەن و تورکمانەکان سوننەن، ئیتر ئەمە بووە هۆی ئەوەی پارێزگاری ناوەرۆکی نەتەوایەتیی خۆیان بکەن.

* * *

ئەم کوردەی کە نەتەوەییێکی هەرە کۆن و گرنگ و پڕ بایەخی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستە، خاوەنی سفیلیزاسیۆنی ڕەسەنی خۆیەتی، ئەمە ڕەنگی لە ژیانی کۆمەڵایەتی داوەتەوە، بووە بە خاوەنی خوێندەواری و ڕۆشنبیری و کولتووری نەتەوایەتیی تایبەتیی خۆی. ئەلفو بێی کوردی (بە تیپی عەرەبی بێ، یا لاتینی، یا سیریلی) قالبێکە هەست و تاقی کردنەوەی شاعیرو نووسەرو زاناو هونەروەرو هەموو ڕۆشنبیرێکی کوردی پاراستووە، بە هەر دیالێکتێک بێ بە دیالێکتەکانی زمانی کوردی، ئەمە هەمووی بەشێکە لە سامانی نەتەوایەتی، ڕۆژگاریش ئەم هەموو هەویرە نەترشاوانە لە سوێنەییێک دا دەشێلێتەوە و زمانی ئەدەبی یەکگرتووی کوردی لێ دروست دەکا. ئەوەی پێشووش کە بووە بە کلاسیک هەر دەمێنێ.

## بەشی سێیەم

# زمانی کوردی

زمانی کوردی لە گرووپی ئێرانی یا هیندۆ ئێرانی بنەماڵەی هیندۆ ئەورووپی‌یە، ئەو زمانە نەتەوەیی‌یەی ئێستا لە ناوەوەیە بە پێی گۆڕانێکی سروشتی لەو زمانانەوە دروست بووە کە باب و باپیرانی کورد لە پێش هاتنی ئایینی ئیسلام قسەیان پێ کردووە و پێ‌یان نووسیوە. بەم جۆرە ئەو زمانەی ئێستا کە بووە بە ڕەمزی نەتەوەیی کورد لە دوای پەیدا بوونی ئیسلام کەوتۆتە ناوەوە.

زمانی کوردی وەکو هەموو زمانەکانی دیکەی سەر ڕووی زەوی لە دیالێکتی گەورەو بچووک پێک هاتووە، بەرهەمی ئەدەبی سەر زاری نەنووسراو بە هەموو دیالێکتەکانی کوردی لە ڕۆژگارێکی دێرینی مێژووەوە تا ئێستا لە ناوەوەیە. بێ گومان وەزعی جوگرافیای سروشتی کوردستان لە شاخی بەرز و شیوی قووڵ و رووباری بەرین و دەشت و بیابانی گەورە بۆتە هۆی دابڕانی ناوچە جوگرافیەکان لە یەکتری و دروست بوونی نەریت و ئەدگاری تایبەتی بە ناوچە، ئەمە نەک تەنیا زمان دەگرێتەوە بەڵکو هەموو لایەن و سووچەکانی ئەتنۆگرافیاش دەگرێتەوە.

## دیالێکتەکانی زمانی کوردی

یەکەمین کەسێک زانستانە پەنجەی بۆ نەتەوەی کورد درێژ کرد بێ و دیالێکتەکانی زمان و ئەو تیرەو هۆزانەی نەتەوە لێ‌یان پێک هاتووە دەست نیشان کرد بێ، شەرەفخانی بدلیسی‌یە (١٥٤٣- ١٦٠٣) لە کتێبی «شەرەفنامە»دا. لەوێ دا کوردی بەسەر چوار تیرەی گەورە دا دابەش کردووە: کرمانج و گۆران و لوڕو کەلهوڕ.

لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم تۆفیق وەهبی ئەم بیروڕایەی شەرەف خانی کردووە بە بنج و بناوان بۆ دابەش کردن و دیاری کردنی دیالێکتە گەورەو بچووکەکانی زمانی کوردی. لە دوایی هەندێ کەسی دیکە لەم بارەیەوە قسەیان کردووە، بەڵام ئەو لیستانەی تۆفیق وەهبی بۆ دیالێکتەکانی زمانی کوردی دایناوون ڕاستی و زانستی‌یان وون

# دیالێکتەکانی زمانی کوردی



نەکردووە و بۆ هەموو دەورو زەمانێک دەست دەدەن.

نەخشەی جوگرافی تۆفیق وەهبی بۆ دیالێکتەکانی زمانی کوردی وەکو لای خوارەوەیە:

١- کرمانجی دەکرێ بە دوو بەش:

(أ) کرمانجی سەروو: لە باکوورەوە یەریڤان - قارس - ئەرزنجان - ئەرزەڕۆم، مەلاتیە - مەرش (مەرعش)- ئەسکەندەروونە.

لە باشوورەوە گۆلی وان - بە درێژایی زێی گەورە - ڕووباری دیجلە.

(ب) کرمانجی خواروو: لە باکوورەوە گۆلی وان - بە درێژایی زێی گەورە - ڕووباری دیجلە.

لە باشوورەوە کرماشان - خانەقین - ڕووباری دیجلە.

٢- لوری: لە باکوورەوە سولتان ئاباد - دەوڵەت ئاباد - کرماشان - خانەقین - ڕووباری دیجلە.

لە باشوورەوە شیراز - کازەروونە - تا نزیک کەنداو.

٣- گۆرانی: لە خەتی سنە - کرماشان بەرەو ڕۆژئاوا، لە هەندێ دێهاتی نزیک سنووری عیراق و ئێران قسەی پێ دەکرێ.

زازایی: لە هەندێ پارچەی ویلایەتەکانی ئەرزەڕووم، خەرپووت، بدلیس، دیاربەکر قسەی پێ دەکرێ. لە بنج دا گۆرانی و زازایی یەکتری دەگرنەوە.

## مێژووی دانانی ئەلفوبێ بۆ زمانی کوردی

بە درێژایی مێژوو لە دوای بلاو بوونەوەی ئایینی ئیسلام لە کوردستان دا نووسینی کوردی لە سەر بنج و بناوانی ئەلفو بێی عەرەبی بووە تا سەرەتای سەدەی بیستەم لە پاش ئەوە هەوڵ دراوە ئەلفو بێی نەتەوەکانی دیکە بەکار بهێنرێ بۆ دانانی ئەلفو بێی کوردی. ئێمە لەم ماوەیەدا باس لەو هەوڵ و تەقەلایانە دەکەین کە سەرنەکەوتن و نەبوون بە ئەلفو بێی ستانداردی زمانی کوردی بەکار هێنراو:

١- هەوڵی «کۆمەڵەی هیوی» ئەستەموول ١٩١٠

لە ساڵی ١٩١٣ کۆمەڵەی هیوی قوتابیانی کورد لە ئەستەموول پرۆژەیێکی دانانی ئەلفو بێی کوردی پێشنیاز کرد لە سەر لاپەڕەکانی کۆواری «ڕۆژی کورد» (ژمارە ٢، ١٩١٣) ئەم ئەلفو بێیە لە سەر بنجی ئەلفو بێی عەرەبی بوو، ئەو دەنگانەی (مەبەس تیپی دەنگدارە) لە پێشانا نەبوون بۆیان دانرا. ئێنجا وایان بە باش زانی بوو تیپە

عەرەبی‌یەکان بە یەکتری‌یەوە نەنووسێنرێن، واتە وەکو نووسینی لاتینی کە تیپەکان بە یەکتری‌یەوە نانووسێنرێن ئەمەیان دیارە بۆ نووسینی دەست و چاپ بوو، واتە لە هەر دوو باردا تیپەکان بە یەکتری‌یەوە نەنووسێنرێن. ئەم پێشنیازە سەری نەگرت زیاتر لەبەر ئەوەی ئەلفو بێی عەرەبی گیروگرفتی زۆری تێدا بوو و بەشی زمانی کوردی نەدەکرد، ئەم کارە زیاتر مەسەلەکەی دەشێواند.

٢- ئەلفو بێی کوردی بە تیپی ئەرمەنی

لە ساڵی ١٩٢٠ لە شاری تفلیسی پایتەختی گورجستان لازۆ کازاریان ئەلفو بێی بۆ کوردی قەفقاس ڕێک خست لە سەر بنج و بناوانی ئەلفو بێی ئەرمەنی. لە سەرەتا لەو قوتابخانە کوردی‌یەی تفلیس ئەم وانەیە دەووترایەوە کە لازۆ خۆی بۆ منداڵانی کوردی کرد بووەوە. هەروەها کتێبێکی بۆ ئەم مەبەسە چاپ کرد بوو بە ناوی «شەمس» هەر خۆشی دایناوبوو و بە دەرز دەیووتەوە.

٣- دوو کتێبی ئایینی ئێزیدی «جلیوە» و «مەسحەفی ڕەش» لەبەر دەست دایە، ئەمە بە ئەلفو بێ‌یێکی تایبەتی نووسراوەتەوە، بێ گومان مەبەسی ئەوە بووە تێکستەکان بە نهێنی بمێننەوە و تەنیا چینەکانی سەرەوەی ئێزیدی‌یان هی وەکو میرو شێخ بتوانن دوو کتێبەکە بخوێننەوە.

کلیلی خوێندنەوەی تێکستی دوو کتێبەکە لەلایەن ڕۆژهەڵاتناس و کورد ناسانی ئەوروپا دۆزرایەوە.

٤- هەموو ئەو کورد ناسانەی تێکستی ئەدەبی میللی‌یان کۆکردۆتەوە هەر یەکەیان بەپێی لێکدانەوەی خۆی ئەلفو بێ‌یێکی لاتینی داناوە بۆ تێکستەکان، بە هیچ جۆرێ بە تەنیا یا بە کۆمەڵ ئەم ئەلفو بێ یانە نەبوون بە ئەلفو بێی ڕەسمی‌ی ستانداردی زمانی کوردی.

٥- جوولەکە کوردەکانی ئیسرائیل هەندێ هەوڵیان داوە بۆ دانانی ئەلفوبێ لەسەر بنج و بناوانی تیپی عیبری و تێکستی کوردی ئەدەبی میللی‌یان پێ نووسیوەتەوە و بڵاو کردۆتەوە. ئەمە ئەو کەسانە سوودی لێ وەردەگرن کە کوردی دەزانن و شارەزایی‌یان لە ئەلفو بێی عبیری هەیە. زۆرتر ئەم کارە لەلایەن جوولەکە کوردەکانی ئێرانەوە بووە.

٦- هەندێ تێکستی کوردی بە درێژایی مێژوو بە ئەلفو بێی سریانیش دەبینرێ.

# مێژووی ئەلفو بێی ستانداردی زمانی کوردی

لە سەردەمی ئێستامان دا سێ جۆرە ئەلفو بێ لە زمانی کوردی دا بەکار دەهێنرێ وەکو لای خوارەوە:

(أ) ئەلفو بێ لە سەر بنج و بناوانی تیپی عەرەبی، ئەمە لە سەردەمی بڵاو بوونەوەی ئاینی ئیسلامەوە بەردەوامە تا ئێستا، لە چەند قۆناغێک دا گۆڕانی بەسەردا هاتووە لە پێناوی ئەوەی زیاتر تیپەکان لەگەڵ دەنگەکانی زمانی کوردی بگونجێن.

١- یەکەم هەنگاو هەر لە کۆنەوە تیپەکانی پ - چ - ژ - ڤ. گ خراونەتە سەر ئەلفو بێی زمانی عەرەبی، چونکە ئەم دەنگانە لە عەرەبیدا وێنەیان نییە، شاعیرانی کوردی کلاسیکی ئەم دەنگانەیان بەکار هێناوە، هەروەها کوردناسەکانیش لە تۆمار کردنی تێکستی کوردی ئەم تیپانەیان بەکار هێناوە.

٢- یووسف زیائەدین پاشای خالیدی لە ساڵی ١٨٩٢ لە کتێبی «الهدیة الحمیدیة في اللغة الکردیة»دا دەرکی بەوە کردووە کە سێ حەرەکەتەکەی زمانی عەرەبی سەرو بۆرو ژێر (ـ وـ) لە زمانی کوردی دا هەیە، پێشنیاز دەکا (ـە، ە) و (و) و (یـ) بۆیان دابنرێن، هەروەها هەستی بە بوونی دوو دەنگداری دیکەش کردووە واوی کراوە (ۆ) و یی کراوە (ێ). ئەم پێشنیازانە زوو بەزوو نەکەوتنە پراکتیکەوە، بۆ ئەمە کە لە ساڵی ١٩٢٢ دیوانی مەحوی چاپ کراوە سێ حەرەکەتەکەی عەرەبیش ڕەنگیان نییە.

٣- لە سییەکانی سەدەی بیستەم دا ئەم دەنگدارانە پەیدا بوون: «ـە = e، و = u، ی = i، وو = u» لە نووسین دا بەبێ دەسکاری کردن لە وێنەی تیپە عەرەبییەکان. هەروەها لە ساڵی ١٩٢٦ ئەحمەدی عەزیز ئاغا لە کتێبی «ئەلفبای کوردی» پێشنیاز دەکا تیپ بۆ هەندێ دەنگدار دابنرێ، لەمانە (و = u) و (ی = i) هەروەها بۆ (ر) و (ل) لەم لایەنە دەڵێ: ڕێ لە «سەر» سووکە، لە «گەڕ» قورسە. لام لە «کەلاوە» سووکە، لە «پڵاو» قورسە.لێرەدا دانەر تەنیا پێشنیاز دەکا تیپ بۆ ئەم دەنگانە دانانێ.

٤- لە ساڵی ١٩٢٣ وەزارەتی مەعاریف داوای لە تۆفیق وەهبی کرد دەستووری زمانی کوردی بنووسێتەوە، بە دوو بەش بڵاو کرایەوە لە ساڵانی ١٩٢٩ و ١٩٣٠، هەر لەو سەردەمەدا بوو سەعید سدقی «مختصر صرف و نحوی کوردی» دانا (بەغدا ١٩٢٨)، ئەمانە هەموویان بایەخی زۆریان بە ئەلفو بێ داوە، بە تایبەتی ئەو تیپانەی دەنگیان هەبوو و ڕەنگیان نەبوو، پێویست بوو بەدروشمی وەکو (i) ئەم تیپە تازانە دروست بکەن.

٥- له ساڵی ١٩٣٠ مارف جیاووک «بەرگی ئیملای کوردی» بڵاو کردەوە، لەوە دا حەرفی بۆ هەر سێ حەرەکەتەکەی عەرەبی دانا و یەکێکی تریشی خستە سەر و ناوی نا مەددە.

هەمــوو ئەو هەوڵانە لە رووی پراکــتــیکەوە لە کــتــێب و هەندێ لە کــۆوارەکــانی وەک «گەلاوێژ» و «دەنگی گێتی‌ی تازە» و هی دیکە گەیێنراونەتە ئەنجام.

دوا هەنگاوی گۆڕانی ئەلفــو بێ‌ی کــوردی لەسەر بنجی تیــپی عــەرەبی دەکــەوێتــە پاش جەنگی دووەمی گێتی. لەو ماوەیەدا هەرچی پێویست بوو لە ئەلفو بێ‌ی عەرەبی دا بکرێ بۆ ئەوەی بە تەواوی لەگەڵ زمانی کوردی بگونجێ گەیێنرایە ئەنجام، تەنیا دەنگێک نەبێ «ژێری گــوشــراوی ســووک» هیچ جۆرە وێنەیێکی بۆ دانەنراو لە ئیــمــلای کــوردی بە تیــپی عــەرەبی نــانووســرێ، بەڵام لە ئەلفــو بێ‌ی لاتینی (i) بۆ دانراوە، وەکــو ئەوەی بە حــەرفی عەرەبی «کردن» دەنووسرێ، بەڵام بە لاتینی «Kirdin» دەنووسرێ.

لە پاشانا لە بێ دەنگەکان «ر» و «ل» ی قــەڵەو دانران «ڕ» و «ڵ»، لە دەنگدارەکــانیش «و، وو، ۆ، و، ێ» هاتــنە نــاو ئەلفــو بێ‌ی زمــانی کــوردی‌یەوە، بەم جــۆرە ئەلفــو بێ‌ی کــوردســتــانی عــیراق و ئێران لەسەر بنجی تیپی عەرەبی گەیشــتــە پلەیێک نەتوانرێ زیاتر دەســکــاری بکرێ، لەم کــردەوەیەدا ڕۆشنبــیــر و خــوێندەوارێکی زۆری کــورد بەشــداری‌یان کردووە، لە سەرووی هەموویانەوە جێ پەنجەی تۆفیق وەهبی لەم لایەنەوە ئاشکراو دیارە.

(ب) ئەلفو بێ لەسەر بنج و بناوانی تیپی لاتینی

لە دوای جــەنگی یەکەمی گێتــی لە سێ لا عــیــراق و ئەرمەنســتــان و ســووریا هەوڵ درا ئەلفو بێ‌ی ستانداردی زمانی کوردی لەسەر بنج و بناوانی ئەلفو بێ‌ی لاتینی دابنرێ، ئەو کەسانەی خەریکی ئەو کارە بوون ئاگاداری کۆششی یەکتری نەبوون، بەڵام لەگەڵ ئەوەش لە زۆر هەوڵ و تەقەلادا کارەکانیان لە یەکتری‌یان دەکرد، ئەگەر جیاوازیش لە نێوانیاندا دا بوو بێ لەبەر دیالێکتە جیاوازەکانی زمانی کوردی بووە بە تایبەتی کرمانجی خواروو و کرمانجی سەروو، ئەوەی عیراق بۆ کرمانجی خواروو بووە، ئەوەی ئەرمەنستان و سووریا بۆ کرمانجی سەروو بووە.

## ١- لاتینی کوردستانی عیراق

لە بەغدا زانای ئینگلیز ئی. ب. سۆن لە ساڵی ١٩١٩ کتێبی «سەرەتای دەســتووری زمــانی کــوردی» بڵاو کــردەوە ئەمــە لەســەر بنج و بناوانی دیالێکتی کــرمــانجی خــوارووی زمانی کوردی بوو، لەوێ هەوڵی داوە وێنەی دەنگەکانی زمانی کوردی بە تیپی لاتینی

بکێشێ. له پاش ئەم کتێبە هەندێ کردەوەی دیکە کەوتە ڕوو وەک لاسایی کردنەوەی پرۆژەکەی سۆن. وا بوو لە ساڵی ۱۹۲۰ محەمەد زەکی و میرزا محەمەد باشقە «اولەمین قراءتی کوردی» یان لە بەغدا بڵاو کردەوە.

کتێبی تۆفیق وەهبی «خوێندەواری باو» لە بەغدا لە ساڵی ۱۹۳۳ بڵاو کرایەوە، زنجیرەیێک ووتار لە کۆواری «دەنگی گێتی‌ی تازە» (۱۹٤۳ - ۱۹٤٤) بە ناوی «دەستووری زمانی کوردی» بڵاو کرایەوە، ئەمە هەمووی مەشق بوو بۆ جێگیر کردنی تیپی لاتینی لە ناو کوردی عیراق دا، ئەم ئەلفو بێ‌یەی تۆفیق وەهبی پێڕەوی هەندێ لە کارەکانی سۆنی کرد بوو، بۆ بەڵگە بۆ دەنگەکانی (غ ش چ) (gh, sh, ch)ی دانا بوو، بۆ (ل، ر) قەڵەو (lh, rh)ی دانا بوو هەروەها بۆ (یی) - یێ‌ی قوول - (iy) دانا بوو.

بە هەموو جۆرێک، زیاتر لەبەر هۆی سیاسی لە دەوڵەتی عیراقەوە و هۆی ئایینی لە نێوەندی هێزی ئایینی‌یەوە ئەم کارە سەری نەگرت، بە تایبەتی قەومی‌یە عەرەبەکانی عیراق نەک تەنیا دژی تیپی لاتینی بوون بەڵکو دژی ئەو دەنگانەش بوون کە لە زمانی عەرەبی‌دا نی‌یە وەکو (پ) و (چ)... لەسەر ئەمە تۆفیق وەهبی یان تاوانبار دەکرد کە دەسکاری وێنەی تیپی زمانی عەرەبی دەکا.

## ۲- لاتینی بۆ کوردی ئەرمەنستان

لە ساڵی ۱۹۲۹ ئیسحاق موروگوولۆڤ و عەرەبی شەمۆ ئەلفو بێ‌یان بۆ کوردی ئەو وولاتە دانا لەسەر بنجی لاتینی. لە دوایی دا ئەو ئەلفو بێ‌یە بە ڕەسمی دانی پێدا هێنراو ئینجا کتێبی زانستی و هونەری و کتێبی قوتابخانەی پێ چاپ کرا، بۆ ماوەیێکی زۆر ڕۆژنامەی «ڕیاتازە = Ria Taza» ی پێ چاپ کرا، ئەمە لە قەفقاسی ڕووسیا بەردەوام بوو تا ساڵی ۱۹٤٥، لەو کاتەدا ئەلفو بێ لەسەر بنج و بناوانی ئەلفو بێ‌ی ڕووسی (سلاڤی = سیریلی) دانرا.

## ۳- لاتینی‌ی کوردەکانی سووریا

مەسەلەی ئەلفو بێ‌ی تازەی تورکی کارێکی گەورەی کردە سەر ڕۆشنبیری کوردی. لە ساڵی ۱۹۳۲ لە سووریا هەرەکۆل عەزیزان (جەلادەت بەدرخان) ئەلفو بێ‌ی کوردی لەسەر بنجی لاتینی دانا و لە کتێبی «ڕێزمانا ئەلفبایا کوردی، شام، ۱۹۳۲» بڵاو کرایەوە. بێ گومان دانەری ئەلفوبێکە پێڕەوی دیالێکتی کرمانجی‌ی سەرووی کردووە، ئەم ئەلفو بێ‌یە دەورێکی گرنگی هەبوو لە بڵاو کردنەوەی ڕۆشنبیری کوردی لە کتێب و کۆ وار تا دوای

## ئەلفوبێی کوردی

### لە سەر بنجی تیپی عەرەبی و لاتینی و ڕووسی (سلاڤی، سیریلی)

| عەرەبی | لاتینی | ڕووسی |
|---|---|---|
| ء | – | – |
| ب | B b | Б б |
| پ | P p | П п |
| ت | T t | Т т |
| ج | C c | Ш ш |
| چ | Ç ç | Ч ч |
| ح | H h | Һ һ |
| خ | X x | Х х |
| د | D d | Д д |
| ر | R r | Р р |
| ڕ | Ŕ ŕ | - |
| ز | Z z | З з |
| ژ | J j | Ж ж |
| س | S s | С с |
| ش | Ş ş | Щ щ |
| ع | -’ | Э э |
| غ | X x | Ґ ґ |
| ف | F f | Ф ф |
| ڤ | V v | В в |
| ق | Q q | Q q |
| ک | K k | К k |
| گ | G g | Г г |
| ل | L l | Л л |
| ڵ | Ĺ ĺ | - |
| م | M m | М м |
| ن | N n | Н н |
| ه | H h | Һ һ |
| و (بێ دەنگ) | W w | W w |
| ی (بێ دەنگ) | Y y | Й й |
| ا (ـا) | A a | А а |
| ە | E e | Э э |
| و | U u | Ō ō |
| وو | U u | У у |
| ۆ | O o | О о |
| ی | I i | И и |
| ێ | E e | Е е |
| - | I i | Ь ъ |

جەنگی دووەمی گێتی، ئیتر نەک زمانی کوردی بەڵکو بوونی کورد لە سووریا قەدەغە کرا.

(ج) ئەلفو بێ لەسەر بنج و بناوانی ئەلفو بێی ڕووسی

لە دوای جەنگی دووەمی گێتی ئەلفو بێی لاتینی هەمـوو نەتەوەکانی رووسـیا لە ناو ئەوانەش کـورد دەسـتی لێ هەڵگیـراو ئەلفـو بێی تازەیان بۆیان دانا لەسـەر بنجی ئەلفـو بێی رووسی، ئەمە هەموو نەتەوەکانی قەفقاس و ئاسیای ناوەڕاستی گرتەوە بە تایبەتی نەتەوە موسوڵمانەکان. بەڵگەی گۆڕینی لاتینی بە ڕووسی بۆ کورد ئەوەبوو منداڵی کورد بە رووسی و کـوردی و ئەرمەنی دەخـوێنێ، واتە پێـویسـتـە سێ جۆرە ئەلفـو بێ فـێـر ببێ، ئەگەر زمـانی کوردییەکەی خـۆی بە ئەلفو بێی ڕووس بنووسێ مـانای ئەوەیە فـێری دوو ئەلفـو بێ دەبێ رووسی و ئەرمـەنی بۆ سێ زمـانی کـوردی و ڕووسی و ئەرمـەنی بەکـاری دێنێ. ئەمـە ئەگـەرچی قـازانجی هەبوو بـۆ کـوردی ئەوێ، بەڵام بۆ کـوردی دەرەوە زیانـێکی گەورە بوو.

بەم جـۆرە ئێـسـتـاش سێ جـۆرە ئەلفـو بێ لە ناوەوەیە، لـە عـیـراق و ئێـران لەسـەر بنجی ئەلفـو بێی عـەرەبییە، کـوردی سـووریا و تورکـیـا لاتـینی بەکـار دێنن هەروەها دەسگا زانسـتییەکانی هەمـوو ئەوروپا لاتینی بەکار دێنن، کوردی ئەرمەنسـتانی سۆڤیەت ئەلفو بێی ڕووسی بەکار دێنن. (بنوارە وێنەی لیستی ئەلفو بێی کوردی).

ئەم دیاردەیە هەر چەندە باش و سـروشـتی نییە، بەڵام ئەو خـراپەش نییە، دوا ڕۆژ ئەو بڕیارە دەدا کامە ئەلفو بێ هەڵدەبژێرێ؟ ئەگەر لە ڕووی زانسـتییەوە تەماشای کێشەکە بکرێ لاتینی لە هەموویان باشترە.

## بەشی چوارەم

# ئایینی کورد

کورد بۆ ماوەیێکی زۆر پێش بڵاو بوونەوەی ئایینی ئیسلام لە نیشتمانە شاخاوی‌یەکەی خۆی دا ژیاوە، بێ گومان لەو سەردەمە کۆنانەدا ئەویش هەر لەسەر ئەو ئایینانە بووە کە کۆمەڵانی هاوسێی گرتوویانە. کورد هەموویان ئایینێکی وەک یەکی‌یان نەبووە، واتە لەسەر یەک ئایین نەبوون هۆی ئەمەش دەچێتەوە سەر چڕی خاکی کە خۆی لە وەزعی تایبەتی جوگرافی ناوچەو هەرێمەکان دەدۆزێتەوە.

ئەوەی ئاشکرایە ئەوەیە کە پەرستنی دیاردەکانی سروشت: ئاسمان و ئەرز و باو باران و برووسک و هەورە تریشقە و ڕۆژ و ئاگر و ڕووناکی لەناو هۆزو تیرەکانی هیندو - ئەورووپی دا باو بوو. واتە ئەو دیاردە چاکانەی کە لە سروشت دا دەبینرێن، بەم پێ‌یە ئاشکرایە کە پێوەندی‌ی کۆمەڵانی هیندو - ئەورووپی بە پەروەردگارەوە بە پێچەوانەی نەتەوە تورکە - مەنگۆلەکان بووە، ئەوان خۆیان لە خوادایانی خراپ نزیک دەکردەوە و قوربانی‌یان پێشکێش دەکردن بۆ ئەوەی لە خراپەیان دوور بکەونەوە.

پەرستنی دیاردەکانی سروشت لە ئایینی میترابیزم خۆی دەنوواند. میترابیزم لە میترا (Mithra) وە هاتووە، ئەمە خودای ڕووناکی‌یە لەلای هیندو - ئێرانی‌یەکان. میترای خودای ڕۆژ و ئەنیتای خودا ژنی خاک و زاوزێ و هومای گاجووتی پیرۆز بنکەی بنچینەیین لە ئایینی میترابیزم دا.

پەرستنی میترا ماوەیێکی زۆری خایاند، لایەنی پراکتیکی خوو و ڕەووشتێکی زۆری لەناو کۆمەڵ دا دروست کرد، جگە لەمە میترابیزم پلەی نهێنیشی هەبوو، بۆیە پەرستنی میترا و ئەنیتا خودای ڕۆژ و خودا ژنی ڕووەک و پیت و بەرەکەت و زاوزێ هەر مایەوە تا پاش پەیدا بوونی ئایینی ئەهورامزداش، نەک هەر ئەمە بەڵکو لە سەدەکانی سەرەتای مێژووی مەسیح دا جارێکی تریش ژیایەوەو چووە ناو جیهانی ڕۆمانەکانەوە. ئەمە هەمووی بەڵگە و نیشانەی ئەوەیە کە میترابیزم کۆنترین ئایینێکی سەر ڕوو زەوی‌یە کە تا پلەیێک خزمەتی کۆمەڵانی کۆنی کردووە بەوەی بووە هۆی بڵاو بوونەوەی شارستانیەتی و چاک کردن و بەرەو پێشەوە بردنی ژیانی ئادەمزاد.

میتانی‌یەکان یەکەمین نەتەوەی هیندو - ئەوروپی بوون لە ئاسیا کە میترایان دەپەرست، لە وانەوە ئەم ئایینە چووە ئێران و هیندستان، لەبەر ئەوەی لەگەڵ گۆڕانی کۆمەڵ رێک دەکەوت زوو بەزوو لە ناو زۆربەی تیرەو هۆزی کۆمەڵانی هیندو - ئێرانی بڵاو بووەوە.

## ئایینی زەردەشتی

زەردەشت پێغەمبەری هۆزو تیرە و کۆمەڵەکانی ئێرانی بوو، لە سەدەی حەوتەمی پێش مەسیح لە وولاتی میدیا پەیدا بوو، بیرو باوەڕی شۆرشێک بوو بۆ چاک کردن و گۆڕین و تازەکردنەوە و یەکخستنی ئایینی ئەم کۆمەڵە خەڵکانە. لە پێشانا بیرو باوەڕی لە بەلخ بڵاو کردەوە، لە پاشانا هەموو خاکی ئێرانی گرتەوەو بوو بە ئایینی رەسمی بنەماڵەی ئەخەمەنی‌یەکان، ئەوەی ئەسکەندەری مەکدۆنی لە ناوی بردن (٣٣١ پێش مەسیح)، لە پاشانا ئەردەشێری یەکەم کردی بە ئایینی دەوڵەتی ساسانی تا داهاتنی ئیسلام.

زەردەشت لەناو کۆمەڵی نەوەکانی ماد و فارس لە ئێرانا پەیدا بوو، لای ئاشکرا بوو کە هاوولاتیانی ئاژەڵ و رووەک و رۆژ و ئەرز دەپەرستن، زۆربەی ئەم دیاردانە لە ئایینی میترایی رەنگیان دابووەوە، لەم رووەوە تووانی کارێکی گەورە بکا بۆ چەسپاندنی ئەم بیرو باوەڕە تازانە لەناو خەڵکی دا.

بنج و بناوانی ئایینی زەردەشتی لەسەر «چاکە» و «خراپە» دامەزراوە، ئەهورامزدا و ئەهریمەن بەڵگە و نیشانەو دروشمی ئەم هێزەن. رۆژ نرخێکی گرانی هەیە لەلایان، بە جەوهەری هەموو شتێکی بوون (کون، وجود) ی دادەنێن، بەم پێیە ئاگریش لەلایان پیرۆزی‌یێکی تایبەتی‌ی هەیە، لەسەر شاخەکان دا ئاگریان دەکردەوە بۆ رێزگرتن لە ئەهورامزدا، بەڵکو ئاگر خۆی گەیشت بووە ئەو پلەیەی کە بپەرسترێ، هەموو بنەماڵەو خانەوادەیێک لە دەوری ئاگردانی خۆی کۆ دەبووەوە، هەوڵیان دەدا کە هەمیشە لە ئاگردانی ناو ماڵ ئاگر هەبێ و قەت نەکوژێتەوە.

ئایینی زەردەشتی لەسەر بنکەی سێ بیرو باوەڕ دامەزرا بوو:

١- ئاوەدان کردنەوەی جیهان، بە بنیاد نانی ماڵ و دروست کردنی بنەماڵە و خێزان و زاوزێ کردن و خەریک بوون بە کشتوکاڵ و بەخێو کردنی ماڵات و لە ناو بردنی هەموو ئاژەڵ و زیندەوەرێکی کە چاکەی بۆ ئادەمزاد نەبێ، هەروەها پاراستنی لەش و تەندروستی و پاک و تەمیزی، لەبەر ئەوە بوو رۆژوو گرتن لەلایان قەدەغە بوو، چونکە لەش لاواز و بێهێز دەکا.

٢- باوەڕ کردن بە دوو هێز، یەکەمیان ئەهورامزدا بوو خودای بە تواناو سەرچاوەی چاکە لە هەمــوو جـیــهــان دا، دووەمـیــان ئەهریمەن بـوو خـودای خـراپە، دیارە خـەبات و زۆرانبازی‌ییێکی تیژ لە نێوانیان دا هەبوو، بەڵام لە ئەنجام دا خودای چاکە بەسەر هێزی خراپە دا زاڵ دەبێ.

٣- هەر چووار جەوهەرەکە ئاگرو باو خاک و ئاو پیرۆزن، لە هیچ جۆرێک نابێ بە شتێکی تر پیس بکرێن، نویشکی فـەلسـەفـەی ئەم ئایینە لەسـەر سێ پەند دامـەزراوە «بیـری چاک، قسەی چاک، کردەوەی چاک».

لە پاشانا ئایینی مـانی پەیدا بوو، ئەمـەش بریتی‌یە لە کـۆمـەڵێک مـەزهەب و بیـرو باوەڕی ئاری و سـامی‌یە کـۆنەکـان، هەروەها لە هەمـوو ئایینەکـانی سـەردەمی خـۆشی وەرگـرتووە. بەڵام زەردەشتی و گـاوورەکـان بەرهەڵسـتی‌یان کرد و بەربەرەکانی‌یان کـردن، ئەمە بووە هۆی ئەوەی زۆریان لێ بکوژن.

لە ڕۆژگـارانی کـەی قـوبادی یەکـەم (٤٨٨ پاش مـەسـیح) مـەزدەک پەیدا بوو، ئەمـە پشـتگیری هەندێ لە بیرو ڕاکانی مانی دەکرد، فەلسەفەی ئایینەکەی لەسەر سۆسیالیـزم دامـەزرا بوو، بە تایبـەتی لە رووی ئابووری و پێـوەندیی نێـرینە بە مێیینەوە، دەیویست یەکسـانی لە ناو ئادەمـزاد دا باو بێ، بەڵام نەوشـیـرەوان مـەزدەک و یاران و هـاو بیـرانی لەناو برد.

لەو سـەردەمـەی کە هیندو ئێرانی لە هیندو - ئەورووپی جیا دەبوونەوە و پێش ئەوەی ببن بە دوو بەشی هیندی و ئێرانی سێ زمان لە ناوەوە بوو:

١- زمـانی سانسکریتی گرنگترین یادگـاری کتێبی پیـرۆزی «ڤیدا»ی هیندستـانی پێ نووسراوەتەوە.

٢- زمانی ئاڤێستا نایابترین تۆمار کراوی دەستووری زەردەشتی‌یان کتێبی ئاڤێستای پێ نووسراوەتەوە.

٣- زمـانی فـارسی کـۆن، ئەم زمـانە لە تۆمـار کـراوی سـەر لەوحـە هەڵکەنراوەکـانی ئەرکیۆلۆجی دا دەبینرێ.

ئاڤێستا کتێبی پیرۆزی ئایینی زەردەشتی‌یە، زمانەکەشی هەر زمانی ئاڤێستـای پێ دەووترێ. زمـانی ئاڤـێسـتا زمـانی ئایین و ئاتەشکەدەو موبەدان بووە (پیاوانی ئایینی زەردەشتی)، ئەلفو بێ‌ی تایبەتی‌ی خۆی هەیە، لە پێنج بەش پێک هاتووە:

١- یەسنا: یەسنا بە مانای عیبادەت و پاڕانەوەو تەسبیحات و ونوێژ و جەژن هاتووە، گرنگترین بەشەکانی ئاڤێستایە، بریتییە لە ٧٢ فەسڵ و هەمووی بەسەر دوو بەش دا دابەش کراوە، بەشی یەکەم لە فەسڵی یەکەمەوە تا فەسڵی بیست و حەوتەمینە، بەشی دووەم فەسڵەکانی ترە. لە ناو ئەمانەدا ١٧ فەسڵ بە «گاتا» ناسراوە، ئەمە کۆنترین بەشی ئاڤێستایەو لە هەمووشیان پیرۆزترە.

گاتاکان بە شیعر دانراوون، ناوە ناوە پەخشانیان تێدا تێک هەڵکێش کراوە، زەردەشتی‌یەکان دەڵێن ئەمە قسەی زەردەشت خۆیەتی. گاتاکان لە ٢٣٨ پارچە شیعر پێک هاتوون، ژمارەی دێڕەکانیان ٨٩٦ دێڕە شیعرە و ژمارەی ووشەکانیان ٥٥٦٠ ووشەیە. لە ڕووی بابەتیشەوە گاتاکان لە پێنج بەش پێک هاتوون: ئەهنوود، ئەشتوود، سپەنتمەد، هوەخشەتر، هیشتواشت.

٢- ڤیسپەرد: بە مانای «سەروەران هەموویان» هاتووە، ئەمە کتێبێکی تایبەتی و سەربەخۆ نی‌یە، بەڵکو لە پاشکۆکانی یەسنایە.

٣- ڤەندیدات: بە مانای «دەستووری دژ بە شەیتان» هاتووە، بریتی‌یە لە ٢٢ فەسڵ، فەسڵی یەکەم باس لە دروست کردنی (خەلقی) ئەرز و ئیقلیمەکان دەکا، فەسڵی دووەم خەریکی ئەفسانەی «جەم» یا «یەم»ە، ئەوانی تر باس لە ئەدگارەکانی ئایین و پاک و تەمیزی دەکەن، فەسڵی دوایی باس لەوە دەکا کە چۆن ئەهریمەن سەرچاوەی دەرمان (٩٩٩٩٩) نەخۆشی‌یە و چۆن «پەیکی یەزدی» نێرراوی خودا (٩٩٩٩٩) دەرمان بۆ نەخۆشی‌یەکان دەدۆزێتەوە.

٤- یەشت: بە مانای «عیبادەت لە کاتی نان خواردن» داهاتووە، لە بنج دا یەشتەکان شیعر بوون، بەڵام بە درێژایی ڕۆژگار لێکدانەوەی شیعرەکان بە پەخشان بۆ مەبەسی تێگەیشتن، شیعرو پەخشان تێکەڵ بە یەکتری بوون و کێشی شیعرەکان شێوان. ئێستا ٢١ پارچە یەشت لەبەر دەست دایە، هەندێکی کورتە و هەندێکی درێژ.

٥- ووردە ئاڤێستا: ئەمە کورتە و نویشکی ئاڤێستایە، مووبەدی مووبەدان (سەرۆکی مووبەدان) ئازەربەد میهر ئەسپەند لەسەر دەمی فەرمانڕەوایی شاپووری دووەم (٣١٠ – ٣٧٩ پاش مەسیح) دایناوە، ئەمە کتێبی نوێژ و پاڕانەوەی ڕۆژانەیە، هەروەها لە ڕۆژە پیرۆزەکان و جەژنە ئایینی‌یەکانیش دەدوێ.

لەپاش بڵاو بوونەوەی ئایینی ئیسلام، کتێبی ئاڤێستا وەکو سەرچاوەیێک و یادگارێکی کۆن هەر مایەوە، بە تایبەتی بۆ کورد کەڵکێکی زۆری بووە، لە نیوەی یەکەمی

سەدەی بیستەم و تا ئێستاش ئاڤێستا سەرچاوەیێکی گرنگ بووە بۆ دەوڵەمەند کردنی زمانی کوردی تازە لە ڕووی داهێنانی ووشە و زاراوەی نوێوە. تۆفیق وەهبی دەورێکی باڵای نوواندووە لەم لایەنەوە. هەرچی ئاییینەکەشە خۆی بەرامبەر ئاییینی تازە نەگرت و ئیسلام هاتە جێی، ئەگەر بەشێکی زۆر کەم لە خەڵکی لە ئێران و هیندستان تا ئێستا لەسەر ئەم ئاییینە نەمانایەوە، بۆمان هەبوو بڵێین ئاییینی زەردەشتیش وەکو گەلێ ئاییینی تری ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بە تەواوی کوێر بووەوە.

## ئاییینی ئیسلام

ئاییینی ئیسلام لە ناو زۆربەی هەرە زۆری نەتەوەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و ئاسیای ناوەڕاست بڵاو بووەوە. کوردیش یەکێک بوو لەو کۆمەڵە خەڵکانەی کە چوونە ناو ئەم ئاییینە تازەوە. بڵاو بوونەوەی ئاییینی ئیسلام لە ناو کوردا بە جارێک و بەبێ گرێ نەبوو، ماوەیێکی زۆری خایاند هەر لە سەرەتاوە بەرەبەرە ئاییینی ئیسلام زیاتر پەرەی دەسەند و ئاییینە کۆنەکان گرژ دەبوونەوە و دەچوونەوە ناو قەپێلکی خۆیان، بەڵام بەشێکی کورد لەسەر ئاییینە کۆنەکانی خۆیان هەر مانەوە، با هەندێکیان - لەبەر گەلێ هۆی دیاری کراو - هەوڵیشیان دابێ ئاییینەکانیان بخەنە قالبی ئیسلامی ڕەسمییەوە بەناوی مەزهەبێک لە مەزهەبەکانی ئیسلام یا سۆفیزم.

زۆربەی کوردی موسوڵمان لەسەر مەزهەبی سوننین و پێڕەوی ئیمامی شافعی دەکەن، بەشەکەی تری کوردی موسوڵمان لەسەر مەزهەبی شیعیی دووازدە ئیمامین. ئەم دیاردەیە کارێکی گەورەی کرد بووە سەر مێژووی کورد بە تایبەتی لە ماوەی ئەو پێنج سەدەی دوواییی‌یە دا، کە بەربەرەکانی و دوو بەرەکی لەنێوان شای عەجەمی شیعی و سوڵتانی عوسمانلی سوننی بەهێز بوو بوو گەیشتبووە پۆپەی، هەر لایە ئەم جیاوازە مەزهەبیی‌یەی بۆ چاکەی خۆی بەکار دەهێنا، لەلایەکی تریشەوە ئەگەر چی تورکی عوسمانلی و کورد هەر دوولایان سوننی بوون، بەڵام سەر بە ئیمامێک نەبوون لە چووار ئیمامە سوننیی‌یەکان، کوردەکان وەکو ووترا پێڕەوی ئیمامی شافعیی‌یان دەکرد و تورکە عوسمانلیی‌یەکان پێڕەوی ئیمامی حەنەفیی‌یان دەکرد، کەچی ئەم دیاردەیە هەر چەندە بچووکیش بوو دەبووە هۆی جیاوازی بیروڕا.

بەم جۆرە سیاسەتی گێرەشێوێنی سوڵتانەکانی عوسمانلی کوردی لە چووار چێوەی «موسڵمانی حەنەفی» دەبردە دەرەوە.

بەگشتی پاش بڵاو بوونەوەی ئایینی ئیسلام لە ناو کۆمەڵی کوردەواری دا، کورد بە باوەڕێکی پاک و بێ گەردەوە پێڕەوی ئەم ئایینەیان دەکرد تا پلەیێک هەستی ئایینی لە لایان لە هەستی نەتەوایەتی بەهێزتر بوو، ئەمە بووە هۆی ئەوەی کۆمەڵێکی زۆر لە زانایانی ئایینی ئیسلام لە ناو کورد دا پەیدا ببن و خزمەتێکی گەورەی ئایینەکە بکەن لە ڕێگەی نووسینی ئەو کتێبانەی کە خەریکی دەستووری ئیسلامەتی و زانستیی‌یەکانی زمانی عەرەبی دەبن، ئەمانە لە ئەنجامی باوەڕ کردنێکی قووڵ بە ئیدیۆلۆجیەتی ئایینی ئیسلام فەرامۆشی زمان و ئەدەبی نەتەوەکەی خۆیان کرد بوو. مەلاییێکی دیارو بەناوی وەکو مەلا محەمەدی قزڵجی لە بابەت مەلا گەورەکانی کوردەوە دەڵێ: «دانراوەکانیان و بەرهەمی بیری‌یان هەمووی بە زمانی عەرەبی ئایینی بوو، هیچ بایەخێکیان بە زمانی خۆیان نەدەدا چونکە لە ناو ئیسلام تووانەوە و زمانی قورئانیان خۆش دەویست، بە تایبەتی بە کوڵ مەزهەبی ئیمامی شافیعی‌یان گرتبوو، ئەوەی تووانەوە لەناو عەرەبی دا، لە هەموو شتێک دا بە پێویست (واجب) دەزانێ».

هەرچی خەڵکە ساکارو نەخوێندەوارەکەی تریشە بە تایبەتی دەشتەکی و دێهاتی، ئەمانە بە بیرو باوەڕێکی خاوێن و دوور لە ڕەچاو کردنی هیچ چاکەیێکی کەسی تایبەتی پێڕەوی دەستوورەکانی ئایینی موسوڵمانیان دەکرد و لەگەڵ ژیانی ڕۆژانە و خەبات لەپێناوی ژیان دا گونجاند بوویان.

لەناو کۆمەڵی کوردی موسوڵمانی سوننی لە سەرەتای سەدەی نۆزدەم دا بزووتنەوەی دەروێشی (لایەنی پراکتیکی سۆفیزمی ئیسلام لە کۆمەلی ئیسلام دا)پەیدا بوو، ئەم بزووتنەوەیە بە تایبەتی لە دوو تەریقەتە بە ناوبانگەکەی «قادری» و «نەقشبەندی» خۆی نوواند بوو.

تەریقەتی یەکەم «قادری» کە دامەزرێنەری شێخ عەبدولقادری گەیلانی (١٠٧٧ – ١١٦٦) بوو لەسەر دەستی شێخ مارفی نۆدەیی (١٧٥٣ – ١٨٣٨) لە ناوچەی سلێمانی کەوتە ناوەوە، تەریقەتی دووەم «نەقشبەندی» کە دامەزرێنەری شێخ بەهائەدینی بوخاری نەقشەبەندی (١٣١٧ – ١٣٨٩) بوو لەسەر دەستی شێخ خالیدی شارەزووری نەقشەبەندی (١٧٧٩ –١٨٢٦) هەر لە ناوچەی سلێمانی پەیدا بوو.

دیارە گفتوگۆ و چەند و چوونێکی فەلسەفی لە لێکدانەوەی ڕێبازەکانی تەریقەتی قادری و نەقشبەندی و تەریقەتەکانی تر لە ناوەوە بوو، بە تایبەتی لە نێوان شێخ مارفی

نۆدەیی و شێخ خالیدی شارەزووری و لە دووایی دا لە نێوان خەلیفە و جێنشینەکانیان، ئەمە هەمووی بۆ ئەوە بوو هەر کەسە ئەوە دەربخا کە تەریقەتەکەی خۆی ڕاستترە و کۆمەڵی موسوڵمان پێویستە پێڕەوی بکەن.

بێ گومان هەردوو لاشیان هەموو بیروڕاکانیان لەگەڵ «شەریعەت» گونجاند بوو لە رووی تیۆرییەوە، واتە هیچ تەنگو چەڵەمەو ناخۆشییێک لەنێوان «شەریعەت» و «تەریقەت» دا نەبوو، ئەوەی ڕاستیش بێ لە سەرەتادا بزووتنەوەی سۆفیزمی ئیسلامی – بەشێکە لە سۆفیزمی کۆزموس – لە دژی شەریعەت و نوێنەرە ڕاستەقینەکەی خەلیفەی عەباسی بوو؛ بزووتنەوەیێک بوو بەرامبەر بە شەریعەت کە ڕەمزی «وەستان» بوو، هەرچی سۆفیزمیشە خۆی بە ڕەمزی «بزووتنەوە» دادەنا. ئیتر خەلیفەکان بە هەموو هێزیانەوە هەوڵیان دەدا ئەم بزووتنەوەیە دەمار بڕ بکەن، بەڵام بۆیان نەکرا.

لە لاییێکی ترەوە ئەم شۆرشە ئەدەب و هونەرێکی یەکجار بەرزی لەناو نەتەوە موسوڵمانەکان دا پەیدا کرد، بێ گومان لە ئەدەبی کوردیش دا ئەم ڕێڕەوە ئاشکراو دیارە. هەرچی لایەنی ئیدیۆلۆجیەتەکەشە ئەمەیان بەرە بەرە سارد بووەوە و لە ڕێگەی بنچینەیی خۆی لای داو تا بە تەواوی لەگەڵ شەریعەت دا گونجا، تا وای لێ هات تاقە کەسێک هەر دوو وەزیفەی لە کاتێک دا دبینی: مەلای خاوەنی شەریعەت و شێخی خاوەنی تەریقەت. ئەمە بووە هۆی ئەوەی خەلیفەکانی عوسمانلی بۆ چاکە و بەرژەوەندیی چینەکانی سەرەوە لە ژێر ناوی «سۆفیزم» بە ناو و «دەروێشیزم» بە ناوەرۆک کردیانە داردەستی خۆیان.

هەرچی خەڵکە ساکارەکەی کوردستانیش بوو، چی بە ناوی دەروێشی قادری و چی بە ناوی سۆفیی نەقشبەندی، بە نیەتێکی پاک و خاوێنەوە تەریقەتی لەسەر دەستی شێخ و خەلیفەکان وەردەگرت و پێڕەوی شەریعەت و ئایینی موسوڵمانیشی دەکرد بە ئومێدی ئەوەی بچیتە بەهەشت و ببێتە بەهەشتی، بۆ ئەم مەبەسە داوێنی شێخی بەر نەدەدا، چونکە بێ گومان جێگەی بەهەشتە!.

دەروێشیزم (شێخ و دەروێش و سۆفی و تەکیە و خانەقا) دەورێکی گەورەی هەبوو لە دیار کردنی ژیانی کۆمەڵایەتی و سیاسیی نەتەوەی کورد، زیاتریش تەگەرەیێک بوو بۆ گەیشتن بە ئامانج. لە پاش جەنگی دووەمی گێتییەوە دەروێشیزم لە کوردستانا بەرەو ئاوا بوون ڕۆیشت و باوی نەما.

# ئایینی ئێزیدی

ووشەی «یەزیدی» یا «ئێزدی» لە «یەزد» و «یەزدان»ەوە هاتووە. ئەم ووشەیە مانای خوداو کردگار و پەروەردگار دەگەیێنێ لەلای باپیرانی کورد و نەتەوەکانی تری ئێرانی.

ئایینی یەزیدی یادگارو نموونەی بیرو باوەڕێکی گەلێ کۆنە، وە پاشماوەی ئایینە کۆنەکانی باپیرانیانە لە کوردانی پێشوو و تا ئێستا لەناو بەشێکی نەتەوەی کورد بۆیان ماوەتەوە. یەزیدییەکان وا دەردەخەن کە باوەڕیان بە دوو هێز هەیە، هێزی چاکە و هێزی خراپە، هەروەها باوەڕیان بە دۆنادۆنیش هەیە کە کردگار دێتە سەر زەوی بۆ مەبەسی چاک کردنی باری ژیانی خەڵکی.

یەزیدییەکان گەلێ جەوهەر لە سروشت دا دەپەرستن، لەمانە ئاگر و ڕووناکی جێگەی تایبەتی و دیاریان هەیە. مەلەک تاووس لەلایان ئەدگار و سیمایێکی خودایییە. ئەمە پیاو وا لێ دەکا بیر لەوە بکاتەوە کە دەبێ پێوەندییێک لە نێوان «تاووس»ی یەزیدییان و «تەمووز»ی خودای ڕۆژ و گەرمایی سۆمەرییان هەبێ.

یەکەمین تازە کەرەوەی ئەم ئایینە شێخ ئادیی هەکارییە (٥٥٧ھ / ١١٥٤م مردووە)، وا دەردەکەوێ کە ئەم زانا گەورەیە ئایینی یەزیدی خستۆتە ناو قاڵبی سۆفیزم و دەروێشیزمەوە و تەریقەتەکەی بە ناوی خۆیەوە واتە «تەریقەتی عەدەوی» ناوی دەرکردووە. شێخ ئادی لە مەدینە ژیاوە و لە پاشانا چووە بۆ ناوچەی هەکاری و ئینجا لە لالش تەکیە یا دێری دروست کردووە و هەر لەوێش نێژراوە، ئێستاکە ئەو شوێنە قیبلەی هەموو یەزیدییانە.

یەزیدییان دوو کتێبی ئایینییان هەیە: «جیلوە» و «مەسحەفی ڕەش»، ئەمانە بە زمانی کوردی و ئەلفو بێیێکی نهێنی نووسراونەتەوە پیاوانی ئایینییان نەبێ کەسی تر دەنگی تیپەکانی نەدەزانی.

مەکسیمیلیان بیتنەری ئەڵەمان لە ساڵی ١٩١٣ تێکستی «جیلوە» و «مەسحەفی ڕەش»ی بڵاو کردەوە.

یەزیدییەکان کاهوو و پاقلە و ماسی ناخۆن، جلی شین لەبەر ناکەن، گەلێ ئەدگاری ئایینە کۆنەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستیان پاراستووە.

خەڵکی موسوڵمانی دەورو بەریان بە درێژایی ڕۆژگار ئازاریان داوون، لە ساڵی ١٤١٥

ئارامگای شێخ ئادی‌یان ڕووخاند، پەرستگایان تەفرو توونا کرد، بەڵام دووبارە پێڕەوانی ئایینی یەزیدی دروستیان کردەوە.

هاوسێکانیان بۆ مەبەسی بەر بەرەکانی و لەناو بردنیان ناویان بە «شەیتان پەرست» دەبردە، ئەم کارە لە دەوروبەری فەرمانڕەوایی تورکە عوسمانلی‌یەکان گەیشتبووە لووتکە، چونکە ناو نانیان بە «شەیتان پەرست» خۆی لە خۆی دا هاندانی خەڵکەکە بوو نەوەکو هەر بە چاوێکی سووک تەماشایان بکەن، بەڵکو بە کوشتن لە ناویان ببەن. ئەم سیاسەتە چەوت و چەوێلەی تورک بووە هۆی ئەوەی بە هەزاران یەزیدیی بێ گوناه ببن بە قوربانیی تیرۆری سوڵتانی عوسمانلی.

زانیاری و لێکۆڵینەوەیێکی یەکجار زۆر لە بابەت یەزیدی‌یەکانەوە لە ناوەوەیە بە زمانانی جیاوازی ڕۆژهەڵاتی و ڕۆژئاوایی لەلایەن زانایانی کورد و هی ترو ڕۆژهەڵاتناسەکانەوە، بەڵام یەکێ لە لێکۆڵینەوە هەرە قووڵەکانی نەوەکو تەنیا لە بابەت ئایینی یەزیدی‌یەوە بەڵکو لە بابەت میترایيزمیشەوە لیکۆڵینەوەکانی تۆفیق وەهبی‌یە.

## ئایینی یارسان – ئەهلی هەق

ووشەی «یارسان» وێنەیێکی تری «یارستان»ە (لەسەر کێشی کوردستان) بە مانای خاک یا وولات یا مەڵبەندی یاران، مەبەس لە «یاران» ئەوانەی پێڕەوی ئەهلی هەق دەکەن. ئەهلی هەق یەکێکە لە ئایینە ڕەسەنە کۆنەکانی کورد، پێڕەوانی ئەم مەزهەبە باوەڕیان بە گەڕانی گیان و دۆنادۆن هەیە، لەسەر ئەو باوەڕەن کە کردگار (خودا) حەوت جار لە گێتی دا دەردەکەوێ و خۆی دەنوێنێ، هەر جارە چووار فریشتە (یارانی چار مەلەک)ی لە گەڵایە، خودا لەگەڵ ئەوانا یەکێتی‌یێکی تەواو و بێ کەم و کووڕی دروست دەکا.

یارسانەکان لەسەر ئەو باوەڕەن کە ئایینیان کۆنترین ئایینی سەر ڕووی زەوی‌یە، لەو ڕۆژەی کردگار ژیانی دروست کردووە بە شێوەی دۆنادۆن هاتۆتە سەر ڕووی زەوی. پلەی هەرە بەرزی دۆنادۆن ئادەم و حەوایە، ئینجا شاهە ئەفسانەیی‌یەکانی وەکو کیومرت و جەمشید و فەرەیدوون و کەیکاووس و کەیخوسرەو و ئەفراسیاب، ئینجا ئەو قۆناغانەی کە گیان چۆتە لەشی پێغەمبەرەکانەوە: سلێمان، ئیبراهیم، مووسا، فیرعەون، عیسا، محەمەد، عەلی‌ی کوڕی ئەبوو تالیب، لە پاشانا گیان چۆتە لەشی شا فەزل، باڵوولی دانا، بابا خۆشین، شێرە خان (بابا ناووس)، بابا جەلیل، بابا سەرهەنگ، سوڵتان

ئیسحاق، حاجی بەکتاش، پیر محەمەد.

کۆنی ئەم ئایینە بووەتە هۆی ئەوەی گۆڕرانێکی زۆری بەسەردا بێ، وەکو دیارە هەندێ لە پێغەمبەرانی ئایینەکانی تری وەرگرتووە، وەکو پێغەمبەرەکانی ئایینی جوولەکەو دیان و ئیسلام.

هۆز و تیرە و کۆمەڵانی کە لەسەر ئایینی «یارسان»ن، ناوی جیاوازیان هەیە. وەکو دەردەکەوێ گونجاوترین ناو «یارسان»ە، بەڵام خۆیان بە خۆیان دەڵێن «ئەهلی هەق»، کەچی هاوسێ موسوڵمانە سوننی‌یەکانیان پێیان دەڵێن «عەلی ئیلاهی»، ئەم ناوە بە هیچ جۆرێ لەگەڵ ڕاستی ناگونجێ، چونکە عەلی یەکێکە لەوانەی کە گیان چۆتە لەشی و بۆ چاک کردنی باری ژیانی خەڵکی هاتۆتە سەر ڕووی زەوی.

کەوابێ ئەم ناوە بۆ بەربەرەکانی کردنیانە. لە مەڵبەندی تریش «کاکەیی»یان پێ دەڵێن، لەلاییێکی دیکە «قزڵباش» و لە ناوچەییێکی تر «شەبەک» یا «سارەلوو»شیان پێ دەڵێن.

شێوەی گۆرانی‌ی کوردی زمانی ڕەسمی یارسانەکانە، کۆنترین و بەرزترین بەرهەمی ئەدەبی کوردی ئایینی یارسانەکانە. ئەم بەشەی نەتەوەی کورد زمانی خۆیان بە زمانی بەهەشت دەزانن و ڕۆژی مەحشەریش بەلای ئەوانەوە لە شارەزوور دەبێ.

لێکۆڵینەوە لە ئاینی یارسانەکان لە ڕۆژهەڵاتناسی ئەورووپادا جێگەییێکی تایبەتی هەیە، زانایانی وەکو م.کینیر، ڤ. ژووکۆڤسکی، ڤ. مینۆرسکی وهی تر دەوری دیاریان بووە لە لێکۆڵینەوە و سا کردنەوەی تێکستی ئایینی یارسانەکان. لە ناوزانایانی کوردیش پێویستە ناوی تۆفیق وەهبی و د. محەمەد موکری لەیاد نەکرێ چونکە پسپۆڕی گەورەی ئەم ئایینە و شارەزای تەواوی ئەدەبیاتیان بوون.

# بەشی پێنجەم

# ژیانی کۆمەڵایەتیی کورد

بێ گومان دیاردەی جوگرافیی کوردستان لە کێو و شاخ و شیو و دەربەند و ئەشکەوت و دارستان و دەشت و مێرغوزار و قەڵپەزو بەفرو باران و سەرما و گەرما هەندێ خوو ڕەووشت و خاسیەتی تایبەتیی لەناو کوردا دروست کردووە، ئەم خاسیەتە لە زۆر شت دا لە هاوسێکانی جیای دەکاتەوە و بووە بە جەوهەرێکی تایبەتی لە بوونی نەتەوایەتیدا. هەندێ لەم خاسیەتانە دەگەڕێتەوە بۆ ڕۆژگارێکی یەکجار کۆنی دەوربەری کۆمەڵانی خەڵکی هیندو - ئەورووپی و هیندو – ئێرانی و سەردەمی ئیسلام.

جگە لەمە برێک جەوهەر و خوو و ڕەووشتی سامییەکانیش (ئەکەد و بابل و ئاشوور) نەوەکو تەنیا کاریان لە باپیرانی نەتەوەی کورد کردووە بەڵکو بەگشتی کاریان لە مەدەنیەتی هەموو کۆمەڵەکانی سەر بە هۆزو تیرەکانی هیندو - ئەورووپی و هیندو - ئێرانیش کردووە. ئەم هەموو خاسیەتانەیان لەناو یەکتری تواندۆتەوە و بەرگێکی ئیسلامییان لەبەر کردووە، بەڵام بە ناوەڕۆک ئەدگاری نەتەوەیی تایبەتیان تێدا دیارو ئاشکرایە. تا ئێستاش ژنێکی کوردی زۆر موسوڵمان کە سوێندی گەورە دەخوا پەنجە بۆ گلۆپی ئەلەتریک درێژ دەکاو دەڵێ: «بەم ئاگرە! بەم ڕووناکییە!». بەڵام لە کۆنەوە تا دەوروبەری جەنگی دووەمی گێتی بۆ سوێندە گەورەکە پەنجەیان بۆ فانۆس و لالە و سۆپە و ئاگردانی ناومالّ درێژ دەکرد. گومان لەوەدا نییە ئەمە دەگەڕێتەوە بۆ ڕۆژگارێکی یەکجار کۆن.

## چینەکانی کۆمەڵی کورد

کۆمەڵی کورد بە شێوەیێکی گشتی لە سێ چینی سەرەکی پێک هاتووە:

١- چینی سەرەوە، یا چینی دەرەبەگ، ئەمە بریتییە لە سەرەک عەشیرەتەکان لە ئاغا و میر و بەگ و پاشا و خان و شێخ و کوێخا و خاوەن زەوییە کار بەدەستەکان. بەلای مینۆرسکییەوە دەرەبەگایەتیی کۆمەڵی کورد خاسیەتی تایبەتیی خۆی هەیە، ئەم

خاسیەتە لە ئەنجامی سەر شۆڕ نەکردن بۆ ڕۆم و عەجەم و وەزعێکی ئابووریی باش و پێوەندیی جووتیار بە ئاغاوە هاتووە.

لەم دوواییی‌یەش دا سەرمایەداری بە تایبەتی کۆمپرادۆری لە شارەکانی کوردستانا پەیدابوو.

٢- چینی ناوەڕاست، یا چینی بورجوازیی بچووک ئەمە بریتی‌یە لە پیشەسازی وەکو ئاسنگەر و دارتاش و چەخماغچی و ناڵبەند و موتابچی و خومخانەچی... بە تایبەتی خوێندەوار و مووچە خۆرانی میری، ئەمانە بە زۆری لە شارانا دەبینران.

٣- چینی خووارەوە، یا چینی جووتیار و فەللاح، ئەمە دارکەرو ڕاوچی و کۆڵ هەڵگر و گەلێ جۆری تریش دەگرێتەوە، ئەمانە مسکێن یا ڕەعیە یا بۆرە پیاویشیان پێ دەڵێن بە تایبەتی لە گوند و لادێ دا.

جیاوازی‌یێکی گەورە لە ناو ئەم چینانە دا هەیە، بە تایبەتی لە نێوان چینی سەرەوە و چینی خووارەوە، یەکەمیان دەوڵەمەندێک کە هەموو شتی هەیە! دووەمیان هەژارێک کە هیچی نی‌یە!

لە دووای جەنگی یەکەمی گێتی‌یەوە، لە کۆمەڵی کوردەواری دا وەکو هەموو کۆمەڵەکانی تری ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست چینی کرێکار بە مانای «پرۆلیتێر»یش پەیدا بوو. بەڵام دیاردەیێکی تر لە ژیانی کۆمەلایەتی‌ی کورد دا هەیە کە پێوەندی‌یێکی ڕاستەوخۆی بە چینەکانی کۆمەڵەوە هەیە و کارێکی گەورە دەکاتە سەر چارەنووسی نەتەوە، ئەویش ژیانی کۆچ کردن و نیشتەجێیی‌یە:

١- کۆچەر: ئەمە بریتی‌یە لەو هۆز و عەشیرەتانەی کە لەزستانا لە دۆڵ و شیوەکانا دەژین، مەڕ و ماڵات و بارگە و خیوەت و ڕەشماڵیان دەپێچنەوە، لە هەوارێک بۆ هەوارێکی تر کۆچ دەکەن. ڕەنگە هەر چەندە دوورتر بڕووانینە مێژووی کورد زیاتر ڕوو بەڕووی ژیانی کۆچەری ببین لە ناو عەشیرەتە کوردەکانا، بەڵام هەر چەندە بۆ خووارتر تەماشا بکەین ژیانی کۆچەری تەسکتر دەبێتەوە تا پاش جەنگی یەکەمی گێتی‌ی و دەوروبەری جەنگی دووەم ژیانی نیشتەجێیی باڵی بە سەر کوردەواری دا دەکێشی.

٢- نیشتەجێ: ئەمە بریتی‌یە لە دانیشتووانی شار و دێهات، جیاوازی‌یێکی تەواو لە نێوان ئاسۆی بیری و پلەی ژیانی کۆمەڵایەتی ناو ئەم دوو کۆمەڵە خەڵکە دا هەیە، هۆی ئەمە ئەوەیە کە سەرچاوەی بەرەو پێشەوە بردنی ژیان لە شارا هەیە، وەکو قوتابخانە و

نامەخانە و مۆزە و یانە و ڕێکخراوی کۆمەڵایەتی و چاپەمەنی... بەڵام لە دێهات دا مەگەر چەند پۆلێکی قوتابخانەی سەرەتایی هەبێ، ئەویش نە وەکو لە هەموو دێیێک دا، ئەگینا هیچی لێ نی‌یە.

## خوو و ڕەووشت

ڕۆڵەکانی نەتەوەی کورد بە ئازایی ناوبانگیان دەرکردووە، ئابۆڤیان بە «سووارچاکی ڕۆژهەڵات» یان دادەنێ، لەم لایەنەوە بەم جۆرە باسیان دەکا: «لە یەکەمین بینین دەتوانین کورد بناسین، بە سەر و سیمای پڕ لە پیاوەتی و مەردایەتی و بەژن و قیافەتی قۆزو هەیکەلی بە ئەندام گاڵتە بە ترس دەکا، سەرەڕای ئەمە ڕوخساری کورد چاوێکی گەورە و بریقەدار و ئاگرینی پێوەیە، بڕۆی چڕ و نێوچەوانی بەرز و لووتی درێژی چەماوە و هەنگاوی بەهێز؛ یا بەشێوەیێکی تر سیفەتی قارەمانانی کۆنی بۆ ماوەتەوە».

بێ گومان وولات و خاکێکی خاوەن دیاردەی جوگرافیی جۆراو جۆر و ڕەنگا و ڕەنگ لە شاخی بەرز و شیوی قووڵ و دارستانی چڕ و زستانی سارد و هاوینی گەرم و گەلێ دیاردەی تریش بووە بە بەڵگەی ئازایی ئەم نەتەوەیە، سۆن دەڵێ: «مەترسی هەمیشەیی لە دەروونی کورد دا بووە هۆی ئەوەی باوەڕ نەکردن و ئازایی و چوست و چالاکی و دووربینی‌یێکی زۆر ووردی لەلا دروست ببێ».

بۆیە مینۆرسکی دەڵێ: «لەبەر ئەوە هەر کەسێکی بیەوێ لە ڕووی کورد هەڵستێتەوە پێویستە هەزار حسێب بۆ کارەکەی بکا».

کورد وولاتی خۆی خۆش دەوێ، شانازیی پێوە دەکا، چونکە سەرچاوەی بوونیەتی، لە ناو شاخ و کێوی هەزارا بە هەزارا دەسەڵاتی بێگانەی لەسەر نەبووە، با بە ناو سەر بە سوڵتانی ڕۆم و شای عەجەمیش بوو بێ.

کە مرۆڤێکی کوردی زاگرۆسی دەڵێ «ئەز کرمانجم» یا «من کوردم» یا «ئەمن کوردم» ئەم ڕستە وەک یەکی‌یانە لە هەستێکی قووڵەوە هەڵدەقوڵێ بەوەی خاوەنەکەی باوەڕی بەوە هەیە کە نەژادی کوردی هیچ گرێیێکی سایکۆلۆجی لەلا دروست نەکردووە، بەڵکو بە پێچەوانەوە ئەم نەژادە بووە بە هۆی سەر بڵندی لە ناو خەڵکی تر دا. ئەم ئادەمزادە کوردە ئەوەندە گیرۆدەی نیشتمانەکەیەتی هەرگیز لە خۆی جیا ناکاتەوە یا خۆی لەو جیا ناکاتەوە، لەبەر ئەوەیە «کوردستانی من» ڕستەیێکی گەلێ باوە لەسەر زمانی شاعیران و

نووسەرانی کوردەوە.

ژیانی عـەشیـرەتی و کۆچەری وای لە کورد کـردووە کە پێـوەندی‌یێکی بەهێزی لە گـەڵ ڕێکخـراوی عـەشیـرەت دا ببێ، ئەم پێـوەندی‌یە لە ناخی دەروونەوە پاڵی پێـوە دەنێ کـە شانازی بە نەژاد و بنەچەکـەی خۆی بکا. نەخوێندەواری کورد هەتا چەند پشـتێک ناوی باب و باپیرانی دەزانێ و شارەزای بەسەر هات و مێژووی ژیانی بنەماڵەی خۆیەتی.

کـۆن و کۆنینەی لەلا پیـرۆزە، پابەندی ئایین و مـەزهەبی باب و باپیـریـەتی، تەریقـەتی دەروێشی بە تایبەتی قادری و نەقشبەندی ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ، بە بیروباوەڕ یا هەر بە ناو کارێکی گەورە لە کۆمـەڵی کوردەواری دا کـردووە، سەرۆکی هەمـوو بنەماڵەیێک بە تایبەتی لە سەرەتای سەدەی نۆزدەمەوە، بە باوەڕ یا هەر بە ناو سەر بە تەریقـەتێک بووە، کوڕ و نەوەی پارێزگاری‌ی ئەوەیان کردووە، هەر لەبەر ئەوە شتێکی زۆر ئاسایی بوو باوک بە کـوڕەکـەی بڵێ: «کـاکـە حـمـەد پشـتـیـوانت بێ»، و دایک بە کـوڕەکـەی بڵێ: «شـاهی نەقشـبەند بتپـارێزێ»، ئیـتـر ڕەنگە ئەو کـوڕە لە باتی حوجرە بەر قـوتابخـانەی تازە بابەت کەوتبێ و نە تەریقەتی باوکی وەرگرتبێ و نە هی دایکی.

## ئەتنۆگرافیا

ژیانی کۆمـەڵایەتی کورد لە خانووبەرە و شار و ناومـاڵ و جلوبەرگ و ئاهەنگی ژن هێنان و خەتەنە سـوورانە و پرسە و شـتی تر، کۆمـەڵە نەریت و ڕەووشـتێکە بە درێـژایی ڕۆژگـار لەسەردەمە هەرە کۆنەکانی مێژووەوە تا ئێستـا دروست بـووە، ئەمـە جەوهەری بنەماڵە و عـەشـیـرەت و هۆز و تیـرە و نەتەوە و ئایینی تێـدایە، بەڵام هەر چۆنێ بێ شـێـوەییێکی نەتەوەیی وەرگـرتووە، وەکـو ئەوەی کـە زۆربەی خـەڵکی ئەم زەوی‌یەی ئێـمـە ڕۆژی یەک شەمـووانیـان کردووە بە ڕۆژی پشـوودانی هەفـتـەیی، باوەڕ ناکـەین ئەمـە هیچ ناوەرۆکێکی ئایینی مەسـیـحی تیـدا مـابێ، ئەگـەر چی لە بنجـیش دا دیارە ڕۆژی یـەک شەمـوو ڕۆژی پیرۆزی گاوورانە، چونکە ڕۆژی ژیانەوەی عیسایە.

## جەژنەکانی کورد

گەورەترین جەژنێکی گشـتی‌ی نەتەوەی کورد جەژنی نەورۆزە، ئەم جەژنەیە دەگەڕێتەوە سەردەمە هەرە کۆنەکـانی کە هۆز و کۆمـەڵە خەڵکەکـانی هیندو - ئەوروپی تێدا ژیاوون. نەورۆز واتە ڕۆژی نوێ، ڕۆژی ئاوابوونی زسـتـانی سـەخت و هەڵاتنی بەهاری جـووانە،

ســروشت باری ژیانی کــوردەواری لە نەورۆز دا چاک دەکــا، هەروەها ڕۆژی بزووتنەوەی نەتەوەیە لە ژێر فەرماندەی ڕۆڵەی گەل، پاڵەوانی گەورە کاوەی ئاسنگەر دژی ئەژدەهاکی بێگانەی دروشمی زۆرداری و نالەباری و دوواکەوتوویی. مرۆڤ و سروشت بە ڕاستی لە نەورۆزا تێکەڵ بە یەکتری دەبن و ئەم جەژنە پیرۆزە دەگێڕن، ئاهەنگەکانی نەورۆز لەسەر شانۆی سروشت خۆیان دەنوێن.

لە کوردەواری دا دوو جەژنی ئایینی جەژنی ڕەمەزان و جەژنی قوربان و مانگی ڕەمەزان و ڕۆژوو و پارشێو و عیبادەت و نوێژ و تەراویح و جومعەی جەماعەت و نوێژی جەژن و تەهلیلە و یاهوو و حاڵ و حەلقەی دەروێشان دیمەنی تایبەتی‌یان هەیە، جگە لەمە لەدایک بوونی پێغەمبەر، بە تایبەتی لە شاران دا، مەولوودی ناو ماڵان و مزگەوتان ماوەی کۆبوونەوە و لێک نزیک بوونەوەی کەس و کار و دۆست و برادەرانە. تەنانەت مەولوودی پێغەمبەر لە شاری هەولێر ئاهەنگی تایبەتی‌ی خۆی هەیە، هەر لەویشەوە ئەم نەریتە لە سەردەمی فەرمانڕەوایی سوڵتان موزەفەر دا (١١٥٤م-١٢٣٣م) بە هەموو وولاتانی ئیسلام دا بڵاو بووەوە.

عاشوورا و جەژنە مەزهەبی‌یەکانی کوردی شیعە بە تایبەتی ئاهەنگەکانی دە ڕۆژەکە لە کۆبوونەوەی پرسە و سنگ کوتان و زنجیر و قەمە و شا حۆسێن و واحۆسێن و هەریسە هەر یەکێکە وەکو هەموو نەتەوە موسوڵمانەکانی کە پێڕەوی ئەم مەزهەبە دەکەن، بەڵام ئەوە هەیە کــوردی شــیــعــە هەندێ نەریتی نەتەوەیی کــوردی تایبــەتی‌یان تێکەڵ بە جموجۆڵی‌یە گشتی‌یەکانی عاشوورا کردووە.

جــەژنی مــەزهەبی یەزیدی و یارســانانی ئەهلی هەق بەشــێکی گــرنگە لە نەریتی نەتەوایەتی‌ی کــورد، ڕاســتــە هەندێ وێنەو ناوەرۆکی مــەزهەبی‌ی تایبــەتی‌ی تێــدایە لە موسوڵمانی سوننە و شیعە جیا دەبێتەوە، بەڵام زۆرتر نەریتەکانی نەتەوەیی گشتین و لە هەموو لایێکەوە بە خۆشی وەردەگیرێن، بە تایبەتی سەیران و ئاهەنگی هەڵپەڕکێ و شایی و زەماوەندی دەهۆڵ و زوڕنا و تەپڵ و نەقارە.

جگە لەمە خەتەنە سوورانە لە ناو کوردەواری دا ئاهەنگی تایبەتی‌ی هەیە، سەیرانانی بەهار و چووار شەمبە سووری و پێشووازی حاجی‌یان و نوێژە بارانە و کۆسە و ڕۆژگیران و مانگ گیران و دەستووری ناشتنی مردوو و پرسە و فاتیحە شێوەکانی لە هەندێ نەریتی کۆن و ئایینی ئیسلامی وەرگیراوە.

# ژیانی خێزانی

سۆزێکی یەکجار بە تینی مرۆڤایەتی بنەماڵەی کورد بە ڕێوە دەبا، ژنی کورد هەمیشە حەز بەوە دەکا مێردی بەهێز و توانا بێ، کار گوزار بێ، قسەی سەر بکەوێ. پێوەندیی باوک بە منداڵ یەکجار بەهێزە، کوڕ لەلای باوک بەردەوامی بنەماڵەیە، لەبەر ئەوەیە پیاوی بێ کوڕ «ئۆجاغ کوێر»ی پێ دەڵێن، واتە ئاگردانی کوێرە و ئاگری تێدا نییە.

هەر لەبەر ئەوەشە کوردەواری بایەخێکی زۆر بە خوازبێنی و ژن هێنان و دروست کردنی بنەماڵە و خێزانی تازە دەدا.

خوازبێنی و ژن هێنان بە هێمنی و لە سەرخۆ دەڕوا، بیری زۆری لێ دەکرێتەوە و پەلەی لێ ناکرێ. نیشان و خەنەبەندان و بووک گواستنەوە بەپێی دەستوورێکی کۆمەڵایەتی بە ڕێوە دەچێ، ئەندامانی هەموو بنەماڵە لە کەس و کار، هەروەها دۆست و برادەران بەشداری تێدا دەکەن. زاوزێ و منداڵ بوون و زەیستانی و مامان و ئاڵ و شەوە و غوولی بیابان و جادوو و بەستن و کردنەوە پێوەندیان بە خوو و ڕەووشتێکی یەکجار کۆنەوە هەیە، هەر چەندە هەندێ جار خۆیان وەکو دیاردەیێکی کۆنە پەرست پیشان دەدەن، بەڵام بوون بە بەشێک لە ئەفسانە (میتۆلۆجیا)ی میللی و چوونە ناو سامانی نەتەوایەتییەوە، بەمە بوون بە وێنەیێکی تر لە ئەدگاری نەتەوایەتی کە کورد لە خەڵکی تر جیا دەکاتەوە.

# بەشی شەشەم

# ژیانی خوێندەواری

## مزگەوت و حوجرە

لە پاش بە موسوڵمان بوونی گەلی کورد بیرو باوەڕو تێبینین و نەریت و خوو و ڕەووشتی تازە هاتە ناوەوە، هەندێ لەو شتە تازانە پێشکەوتوو بوو و لەگەڵ گۆڕرانی کۆمەڵ دەگونجا. هەر چەندە ئەو دیاردە نوێیانە هەندێ ئەدگاری کۆنی بێ سوودیان لە ناو برد، بەڵام بوونە هۆی نەمانی گەورەترین دەسکەوتی خوێندەواری و ڕۆشنبیری، مەبەس لەمە لە ناوچوونی ئەو ئەلفو بێیانەیە کە لە نووسین دا بەکار دەهێنران لە ناو نەتەوە هیندو - ئێرانییەکان بە تایبەتی و تورکە - مەنگولییەکان بەگشتی.

بێ گومان تیپی نووسینی عەرەبی بە چاوێکی تایبەتی تەماشا دەکرا بە ئەلفو بێیێکی پیرۆز دەناسرا، چونکە ئایەتەکانی قورئانی پێ نووسرا بووەوە، لە پاشانا زمانی عەرەبی خۆشی بوو بە زمانێکی پیرۆز چونکە خودا قورئانی بەم زمانە بۆ خەڵکی سەر زەوی ناردووە.

ئیتر نەتەوە موسوڵمانەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست فێری ئەلفو بێی عەرەبی بوون بۆ مەبەسی خوێندنەوەی قورئان و لە پاشانا فێر بوونی زمانی عەرەبی، ئەمە کارێکی گەورەی کردە سەر زمانی هەموو ئەو نەتەوانەی بوون بە موسوڵمان، بۆ ماوەیێکی درێژ زمانی عەرەبی زمانی نووسین و زانست و زانیاری بوو، دیارە زمانی نەتەوایەتیش بۆ قسەکردن و ئەدەبە میللی یەکە هەر لە ناوەوە بوو. بەڵام لە پاشانا خوێندەواری ئەو نەتەوانە هەستیان بەوە دەکرد کە زمانی خۆیان جیاوازە لە زمانی عەرەبی و ئەلفو بێی عەرەبی. ئەو ئەلفو بێیەی کە تایبەتییە بۆ زمانی عەرەبی و بەشی زمانی خۆیان ناکا، ئەو دەنگانەی لە زمانی خۆیان دا هەیە لە زمانی عەرەبی بەدی ناکرێن. لەبەر ئەوە لە

پێشانا ئەم نەتەوانە ئەگەر بیانویستایە شتێک بە زمانی خۆیان بنووسن تەنیا ئەلفو بێی عەرەبی‌یان بەکار دەهێنا، واتە ئەگەر تووشی دەنگێک بهاتنایەو ئەو دەنگە لە عەرەبی دا نەبووایە، بە تیپێکی عەرەبی نزیک ئەو دەنگە دەیاننووسی، بۆ بەڵگە (گ) بە (ک) و (چ) بە (ج)... دەنووسرا. بەڵام لە دووایی دا عەجەم و نەتەوە تورک زمانەکان هەندێ دەسکاری‌ی تیپە عەرەبی‌یەکانیان کرد بۆ ئەوەی لە گەڵ بەشێک لە دەنگەکانی زمانیان رێک بکەوێ. لە گەڵ ئەوەش دا تەنگو چەڵەمەیێکی زۆر تا ئێستا ماوەتەوە بە تایبەتی لە فارسی دا، کەچی ئەلفو بێی عوسمانلی و نەتەوە موسوڵمانەکانی تری ئاسیای ناوەڕاست و کازاخستان و قەفقاس لە پاش جەنگی یەکەمی گێتی بوو بە لاتینی و لە پاش جەنگی دووەمی گێتی بوو بە سیریلی. هەرچی کوردیشە دەسکاری‌یێکی یەکجار قووڵی لە ئەلفو بێی عەرەبی دا کرد تاکو لەگەڵ دەنگەکانی زمانی کوردی بگونجێ، بەڵام هێشتا هەر تەنگو چەڵەمەی تێدا ماوە.

ئایینی موسوڵمانی لە سەرەتاوە بایەخێکی یەکجار زۆری بە مزگەوت دا، چونکە مزگەوت تەنیا جێی نوێژ و پاڕانەوە و پەرستن نەبوو، بەڵکو جێی فێر کردنی قورئان بوو، ئینجا خوێندنی هەموو زانستی‌یەکانی کە پێوەندی‌یان بە قورئان و ئایینی ئیسلامەوە هەیە، لەبەر ئەوە لەگەڵ بڵاو بوونەوەی ئایینی تازە مزگەوت پەیدا بوو، لەگەڵ ئەوەدا پیاوی ئایینی موسوڵمان پەیدا بوون، کە ئێمە مەلای پێ‌ی دەڵێین. ژووری مەلای مزگەوت کە حوجرەیان پێ دەووت بوو بە پۆلی وانە ووتنەوە. حوجرە وەکو زاراوەیێک بەرامبەر بە قوتابخانەی میری‌ی ئێستایە.

## ئامانجی مزگەوت و حوجرە

خوێندەواری لە ناو کۆمەڵی کوردەواری دا لەپاش بە ئیسلام بوونی کورد بۆ مەبەسی ئایینی پەیدا بوو، حوجرەی خوێندنی مزگەوتی کوردەواری دەیویست ئەم ئامانجانە بهێنێتە دی:

١- ئامادە کردنی ئەو مەلایەی پێش نوێژی لە مزگەوتی شار و لادێ دەکا، ئامۆژگاری‌ی خەڵکی دەکا و رێگەی شەریعەتیان پێ پیشان دەدا، ناوە ناوە مردوو شۆری دەکا و یاسینیش لەسەر قەبران دەخوێنێ، ئەم جۆرە مەلایانە لە ناو کوردەواری و هەتا لە ناو کۆمەڵی مەلا گەورەکانیش دا «کۆلکە مەلا» یان پێ دەڵێن.

٢- پێ گەیاندنی مەلای گەورەی وا کە ناو و ناوبانگیان تەنیا لە ناو کوردستان نەبوو،

بەڵکو لە هەموو گێتی ی ئیسلام دەنگیان دابووەوە، ئەمانە بەشدارییێکی یەکجار گەورەیان کردووە لە دەوڵەمەند کردنی زانستی یەکانی کە پێوەندی یان بە زمانی عەرەبی و ئایینی ئیسلامی یەوە هەیە. مەلا گەورەکان نووسینیان بە زمانانی عەرەبی و فارسی و تورکی بووە، تەنیا زمانی قسەکردنیان کوردی بووە، ئەمەش لەبەر ناچاری، چونکە ژن و ماڵ و خێزان و کەس و کار و کۆمەڵی دوور و نزیکی دەور و پشتیان کورد بووە.

لە ناو بەشی دووەمی ئەم خوێندەوارانە، ئەم کەسانەی لای خوارەوە پەیدا بوون:

١- بەشێکی کەم لەو خوێندەوارە گەورانە خوێندەواری ی خۆیان کە مەلایانە بووە لەگەڵ زمانی کوردی گونجاندووە لە ڕووی پراکیتکی یەوە واتە شیعرونووسینیان بە زمانی کوردی هێناوەتە ناوەوە، با بەشی زۆریشی لە پلەی داهێنان نەبوو بێ لە ڕووی هونەری و ئیستاتیکی یەوە، بەڵام بەرهەمی وایان بووە کە مێژووی ئەدەبی کوردی شانازی یان پێوە بکا.

٢- بەشێکی کەمتریش لەوانەی پێشوو هەموو ژیانی خوێندەواری یان بۆ زمان و ئەدەبی کوردی تەرخان کردووە، پلەی زانستی ی ئایینی یان لووتکە بووە و لە ڕیزی خوێندەوارە هەرە گەورەکان بوون، بەڵام هەستی نەتەوایەتی و سۆزی نیشتمان پەروەری بووەتە هۆی ئەوەی دەرگای گێتی یێکی زانیاری و داهێنانێکی تر بکەنەوە، لە باتی ئەو خوێندەواری یەی دەمێکە لەسەر پرۆگرامێکی تایبەتی و دیار کراو دەڕوا، زمانی نەتەوە دێننە پێشەوە، نەوەکو بۆ مەبەسی زمانەکە خۆی بەڵکو بۆ دیار کردنی چارەنووسی نەتەوە کە بە پێش خستنی زمانەوە بەستراوە.

مێژووی ئەدەبی کوردی گەلێ مەلای گەورە دەور دەکاتەوە و ناویان لە ناو لاپەڕە زێڕینەکانی دا تۆمار دەکا وەکو شاعیری گەورە و هەڵکەوتوو و داهێنەر، لەمانە: مەلا پەرێشان، مەلای جزیری، ئەحمەدی خانی، نالی، حاجی قادر، شێخ ڕەزا و مەحوی و هی تریش.

ژووری مەلای مزگەوت «حوجرە»ی پێ دەووترا، ئەم ژوورە جێ ی ژیان یا جێ ی دەرز ووتنەوەی بووە، یا جێ ی هەر دووکیان بووە. حوجرە هەر وەکو لە ناو مزگەوت دا هەبوو، لە دەرەوەی مزگەوتیش دەبینرا، وەکو ئەوەی مەلا دوکانێک بەکار بێنێ وەک ژووری دەرز ووتنەوە، یا ژوورێک لە ماڵ بێنێتە دەر و بۆ ئەم مەبەسەی تەرخان بکا. ئەمە قوتابخانەی ئایینی بوو لە هەموو شار و زۆربەی گوند و ئاوەدانی یەکانی کوردستان دا هەبوو.

گەلێ جار هەر لە سەرەتاوە منداڵ دەخرایە بەر خوێندن بۆ فێر بوونی ئەلفو بێ و سەرەتاکانی نووسین، بە تایبەتی لە دووا ساڵانی سەدەی نۆزدەم و سەرەتای سەدەی بیستەم بەو باوەڕەی کە منداڵ لە حوجرە باشتر فێری خوێندنەوەی قورئان دەبێ، ئینجا لە پاش ئەو دەخرایە قوتابخانەی میری‌یەوە، ئەوەی ئاشکراشە هەر لە کۆنەوە هەندێ لە کوڕە مـیر و والی و کار بە دەستانی دەرەبەگ و سەرۆکەکانی عەشیرەت و بنەماڵە دەوڵەمەندەکانی شێخ و پاشا و بەگ و ئاغا و هی تر منداڵیان دەنارده حوجرە بۆ مەبەسی فێر بوونی خوێندن و نووسین، نەک بە مەلا بوون.

خوێندنی قوتابخانەی ئایینی لە سەرەتاوە پێوەندی بە شەریعەت بووە، واتە لێکۆڵینەوە لە ئایین و ئایینزاو و هەموو ئەو زانیاری‌یانەی پێوەندی‌یان بە ئایینەوە هەیە کە خودا بۆ بەندەی داناوە، بەڵام لە دوواییدا کە بزووتنەوەی سۆفیزم کەوتە ناوەوە، لە پێشانا ئایین «شەریعەت» بەربەرەکانی‌ی ئەم بزووتنەوەیەی کرد، خەلیفەکانی عەباسی بە ناهەق خوێنی سۆفی‌ی گەلێ گەورەیان ڕشت و بەربەرەکانی‌ی نوێنەرانیان کرد، بەڵام لە پاشانا شەریعەت بۆ چاکەی خۆی سۆفیزمی بەکار هێنا، بەم جۆرە بە تایبەتی لە کوردستان داو لەم دوو سەدەی دووایی‌یەدا سۆفیزمی تیۆری نەماو بوو بە دەروێشیزمی پراکتیکی «تەریقەت»، ئیتر شەریعەت و تەریقەت و مەلا و شێخ و مزگەوت و تەکیە و خانەقا و قوتابی‌ی ئایین و دەروێش و سۆفی چوونە ناو یەکەوە لە ڕووی پراکتیکی‌یەوە، ئامانجیان هەر یەک بوو، لەبەر ئەوە دەبینین زۆربەی هەرە زۆری پیاوی ئایینی موسوڵمان لە کوردستان دا شێخیش بووە و مەلاش بووە، هەرچی لایەنی ئیدیۆلۆجی بوو لە سۆفیزمی ئیسلامی کە بەشێک بوو لە سۆفیزمی کۆزمۆسی بووە هۆی داهێنانێکی بەرز لە ئەدەبیاتی نەتەوە موسوڵمانەکانی ڕۆژهەڵات.

## بەرنامەی خوێندنی حوجرە

ئەگەر چی بەرنامەی خوێندنی قوتابخانەی ئایینی لە ناوچەیێک بۆ ناوچەیێکی تری کوردستان جیاوازی تێدا بوو، بەڵام بەگشتی لە بنج دا هەر یەکێک بوو، جیاوازی‌یەکەشی لە سێ شوێن و جێگە بەدی دەکرا:

١- ئەو ناوچانەی سەر بە دەوڵەتی عوسمانلی بوون.

٢- ئەو ناوچانەی سەر بە دەوڵەتی عەجەم بوون.

٣- ئەو ناوچانەی سەر بە دیالێکتی گۆرانی بوون و خەڵکەکە بە پێی ئایین و ئایینزای

جیاوازی شیعی و یارسانی ئەهلی هەق و بیرو باوەڕی سۆفیزم، شێوە و بەرنامەی خوێندنیان دەگۆڕا.

قوتابیی حوجرە لە سەرەتا فێری ئەلفو بێی عەرەبی دەکرا، ئینجا قورئانی پێ خەتم دەکرا. لە پاشانا هەموو ئەو زانستییانەی پێوەندیان بە قورئان و ئایینی ئیسلامەوەیە، وەکو تەفسیر و حەدیس و فیقه و شەریعەت و مەنتیق و ریازیات و دەستووری زمانی عەرەبی (سەرف و نەحوو). لە پاڵ ئەمە زمان و ئەدەبی فارسیشیان دەخوێند، شیعرەکانی سەعدی و حافز پایەیێکی بەرزیان هەبوو و گەیشت بوونە پلەی پیرۆزی، هەروەها هەندێ لە بەرهەمە ئەدەبییەکانی نیزامی گەنجەوی و جەلالەدینی ڕۆمی و عەتتار و جامیشیان دەخوێند.

بە دەگمەن ڕێک دەکەوت فەقێیێک هەموو پلەکانی خوێندن لە یەک جێگە تەواو بکا، لەبەر ئەوە لە گەڕانا بوو لە ناوچەیێک بۆ ناوچەیێکی تر، بە تایبەتی ئەگەر ناوبانگی مەلایێکی گەورەی ببیستایە خۆی دەگەیاندێ و لای دەخوێند. ئەم هاتوچۆیە بوو بوو بە ڕەووشت لە قوتابخانەی ئایینی کۆن دا، هەتا منداڵی مەلا و شێخە گەورەکان خۆشیان دەنێررانە قوتابخانەی مەلای تر بۆ خوێندن. دیارە ئەم کوڕە مەلا لە ڕووانە جێگەیێکی تایبەتییان دەبوو بە چاوێکی دیکە تەماشا دەکران. ئەم هاتوچۆیە ئەگەر چی لە خوارووی کوردستان هەر لە ناوچەکانی خۆی دا بوو، هەروەها لە سەرووی کوردستانیش دا، بەڵام گەلێ جار فەقێ و مەلای سەروو بۆ خوارووی دەهاتن، پێچەوانەش هەر هەبوو.

جگە لەمە هەندێ جار قوتابیی کورد بۆ قوتابخانە ئایینییەکانی دەرەوەی کوردستانیش دەچوون.

پلەکانی خوێندن لە قوتابخانە ئایینییەکان دا وەکو لای خوارەوە بوو:

١- پلەی سەرەتایی: منداڵ کە دەستی بە خوێندن دەکرد قوتابییان پێ دەووت. لە پێشانا فێری ئەلفو بێی عەرەبی دەکرا، ئینجا قورئانیان پێ خەتم دەکرد.

٢- پلەی سوختەیی: پلەی فێر بوونی سەرەتاکانی دەستووری زمانی عەرەبی (سەرف و نەحوو) بوو، ئینجا سوختە دەستی دەکرد بە خوێندنی سەرەتاکانی فیقه.

٣- پلەی موستەعیدی: لەم پلەیەدا موستەعید دەستی دەکرد بە فێر بوونی زاراوەی زانستیی قورس لە هەر دووازدە زانستییەکە.

لە پاش تەواو کردن باوەڕ نامە (ئیجازە)ی وەردەگرت و دەبوو بە مەلا.

جەمیلی ڕۆژبەیانی پلەی سەرەتایی و سوختەیی بەرامبەر بە پلەی قوتابخانەی سەرەتایی و ناوەندیی میری دادەنێ، وە پلەی موستەعیدی بەرامبەر بە پلەی قوتابخانەی ئامادەیی و پلەی سەرەتایی زانستگا دادەنێ.

## سەرهەڵدانی کوردایەتی لە مزگەوت دا

خوێندنی قوتابخانەی ئایینی بۆ ئامانجی فێر بوونی قورئان و شارەزایی پەیدا کردن لە ئایینی ئیسلام بوو، ئەمەش دەبوو بە زمانی عەرەبی بێ. زمانی فارسی و کەمتریش زمانی تورکی لە ناوەوە بوون بە هۆی ئەوەی زمانی میری دوو دەوڵەتە گەورەکە بوون، جگە لەمە دەوڵەمەندیی ئەدەبی کلاسیکی‌یان بە تایبەتی فارسی جێی خۆیان کردبووەوە لە قوتابخانەی ئایینی ئەگەر چی لە بنجیش دا ئەمانە لە بەرنامەی خوێندن نەبوون، ڕەنگە مەزهەبی شیعی لە ئێران و حەنەفی لە ناو تورکە عوسمانلی‌یەکان هەندێ ڕێیان خۆش کرد بێ بۆ فارسی و تورکی کە بچنە ناو بەرنامەی خوێندنی ئایینی‌یەوە، دیارە هۆی هەرە گەورە و گرنگ دەسەڵاتی دوو دەوڵەتەکە بووە، دەرگای قوتابخانەی ئایینی‌یان بۆ کراوەتەوە بۆ ئەوەی زمانی فارسی و تورکی ببەنە ژوورەوە.

پێش ئەوەی باس لە بە کوردی کردنی خوێندن بکەین لە قوتابخانەی ئایینی دا، واتە نووسینی بەرهەم بە کوردی، دەبێ ئەوە بزانین لەو ڕۆژەوە کە قوتابخانەی ئایینی ئیسلام لە خاکی کوردەواری پەیدا بووە فێر کردنی(تەقریر) هەموو زانستی‌یەکان لە سەرەتاوە بە زمانی کوردی بوو، بەڵام زمانی قسەکردن، مەلا هەموو دەرزەکانی بەو زمانە کوردی‌یە ووتووە ئەوەی قسەی پێ کردووە، ئەمە زمانێکی کوردی عەرەبی ئامێزی تێک شکاوی تایبەتی بوو، گەیشتبووە پلەیێک بۆ نوکتە قسەی پێ دەگێڕنەوە، چونکە هیچ مەلایێکی کورد زیاتریش ئەوانەی ئەلفو بێ و قورئان فێری قوتابی و سوختە دەکەن عەرەبی‌یان نەزانیوە، ئەگەر لە خوێندن و نووسین هەندێکیان لێ هەڵکڕاند بێ، لە قسە کردن بێ بەش بوون.

لە سەدەی شازدەم، لەپاش دابەش کردنی کوردستان (جەنگی چاڵدیران ١٥١٤) بیری ڕزگاریی نەتەوایەتی بە شێوەیێکی تازە چرۆی دەرکرد، ئەمە قۆناغی یەکەمی کلاسیکی ئەو بزووتنەوەیە کە تائێستا بەردەوامە. هەر لەو سەردەمەوە هەوڵ و کۆشش درا بۆ بە کوردی کردنی خوێندن، یا ڕاستتر زمانی کوردی وەکو کەرەستەیێکی زانیاری تۆمار کراو بێتە ناو قوتابخانەی ئایینی‌یەوە،

مەبەسمان لێرە سەرهەڵدانی کوردایەتی‌یە لە ناوەوە، واتە هەوڵی مەلا کوردەکان بۆ بە

کوردی کردنی زانستیی‌یەکانی ئیسلامی، ئەگینا هەوڵ و کۆششی دەرەوەش لە ناوەوەیە بۆ بە کوردی نووسین، وەکو ئەو بزووتنەوە ڕۆشنبیرییەی کە ئەلێکساندەر ژابای قونسۆڵی گشتیی ڕووس لە ئەرزە ڕۆم لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەم سەرۆکایەتی کرد، ناچار بوو هەموو ئەو شتانەی کە دەیویست بە کوردی بنووسرێنەوە بە خوێندەواری کوردی ئەو سەردەمە بسپێرێ بە تایبەتی مەلا مەحموودی بایەزیدی، دیارە ئەو خوێندەوارانەی یاریدەی ژابایان دەدا هەموویان پیاوی ئایینی و مەلا بوون.

لەم لایەنەوە ئەم دیاردانەی خوارەوە ئەوە دەگەیەنن کە زمانی کوردی دەوری بووە لە زانستیی‌یەکانی زمانی عەرەبی و ئایینی ئیسلامی:

١- لە دووا ساڵانی سەدەی شازدەم (١٥٩١) عەلیی تەرەماخی زانستیی سەرفی عەرەبی بە کوردی نووسیوەتەوە، ئەمە بریتیی‌یە لەو وانانەی بۆ فێر بوونی سەرفی زمانی عەرەبی ووتوویەتیی‌یەوە، واتە تەقریر یا موحازەرەکانی تۆمار کردووە. ئێمە دەشێ بیریش لەوە بکەینەوە کە مەبەسی تەرەماخی لەمەدا ئاسان کردنی فێر بوونی زمانی عەرەبی بێ بۆ قوتابیی‌یانی کورد وەکو مەلا مەحموودی بایەزیدیش لە پێشەکیی کتێبەکەی تەرەماخی دا دەڵێ: «ئەوی عەلی تەرەماخی بخوە بدەستێ خوە دنێڤا گوندی مزگەفت و مەدرەسە بینا کرینە، وە موودەیەکی بخوە ژی دەرس گۆتینە. وەکو دیتیەو موشاهەدە کرینەکو عیلمی سەرفی فەننەکی زەحمەت و دژوار و ئاسێیە. وە موبتەدی زوو بزوو سیغە و ئیعلالێد وان ژ کتێبێد عەرەبی ئیخراج ناکەن. ژ بۆی هیسیا موبتەدیان بزمانێ کورمانجان عیبارەتەکی تەسریفی تەسنیف کرییە، کو ئەم عیبارەت دەنێڤا تەلەبەیێد ئەکرادان قەوی مەقبوول و ئەهەمم و لازمە...».

بەڵام ئەمە ئەوەش دەگەیێنێ کە عەلیی تەرەماخی ویستوویەتی زمانی نەتەوایەتی ببێ بە زمانی نووسین، هەروەها ئەوەشمان لا ئاشکرا دەبێ لە دڵسۆزی و هەستی نەتەوایەتی لای ئەم زانا کوردە بووەتە هۆی ئەوەی کە زانستی سەرفی عەرەبی بە کوردی بنووسێتەوە، بە تایبەتی کە هاتووە هەندێ بەڵگەی بە کوردیش هێناوەتەوە کە بەراوورد لە نێوان بابەتە عەرەبیی‌یەکان لەلایێک و لەلاییێکی ترەوە بابەتە فارسی و کوردیی‌یەکانا دەکا.

٢- ئەحمەدی خانی (١٦٥٠ - ١٧٠٧) فەرهەنگۆکێکی عەرەبی - کوردی بە قسەی کێش و قافیە دار نووسیوەتەوە، بە ناوی «نۆبار»، ئەگەر ئەحمەدی خانی بە یەکەمین شاعیری بڵاوکەرەوەی بیری کوردایەتی دانەنرایە کە پاش چاڵدیران کەوتە ناوەوە، دەشیا بووترایە

ئەم بەرهەمەی بۆ ئەوە بووە کە منداڵی کورد فێری زمانی عەرەبی بکا، چونکە زمانی فێر کردن و تۆمار کردنی هەموو زانستە ئیسلامی‌یەکان بوو، بەڵام بێ گومان مەبەستی خانی ئەوە بوو ووشەی نووسراوی کوردیش بێتە ناو قوتابخانەی ئایینی‌یەوە، ئەم بەرهەمە لە قوتابخانە ئایینی‌یەکانی هەموو ناوچەکانی سەرووی کوردستان دەخوێنرا.

٣- شێخ مارفی نۆدەیی (١٧٥٣ - ١٨٣٨) بۆ مەبەسی فێر کردنی زمانی عەرەبی فەرهەنگۆکێکی عەرەبی - کوردی بە قسەی کێش و قافیەدار دانا بۆ ئەوەی ئەحمەدی کوڕی (کاکە حمەدی شێخ ١٧٩٢-١٨٨٧) فێری عەرەبی ببێ، هەر لەبەر ئەوەش ناوی نا «ئەحمەدی» بەناوی کوڕەکەیەوە، ئەمە لە پاشانا چووە ناو بەرنامەی خوێندنی قوتابخانەی ئایینی لە هەموو ناوچەکانی خوارووی کوردستان.

جگە لەم کارانە هەوڵی تریش دراوە بۆ بە کوردی کردنی قوتابخانەی ئایینی ئیسلامی وەکو کۆشش و تەقەلای مەلا یوونسی هەڵکەتەینی (١٧٨٥ مردووە) کە لە ئەنجاما سێ نامەی لە زانستی‌ی سەرف دا بە کوردی نووسیوەتەوە: «تصریف، ظرف، ترکیب».

کۆمەڵێک دەسنووسی ئەم نامانە لە نامەخانەکانی ئەوروپا پارێزراوون.

بەم جۆرە دەبینین قوتابخانەی ئایینی دوورە پەرێز وەستاوە لە زمانی کوردی و کولتووری کورد، بەڵام ئەوەندە هەبوو دڵسۆزی و هەستی بەشێک لەو خوێندەوارانەی کە لەم قوتابخانە ئایینی‌یە دەرچوون ئاووڕیان لە زمانی کوردی و خوێندەواری نەتەوەکەیان داوەتەوە و نووسینیان کردووە بە کوردی، نە وەکو تەنیا ئەو شتانەی پێوەندی‌یان بە ئایینەوە هەیە بەڵکو هەموو شتێکی کە پێوەندی بە ژیانەوە هەیە لە مەولوود نامە و شیعری ناو خەڵکەوە بگرە تا دەگاتە غەزەل و قەسیدەی هەجوو و کراوە و نووسین و پەخشانی هونەری و هەموو بابەتەکانی داهێنانی ئەدەبی.

لەمە ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە کە حوجرە و قوتابخانەی ئایینی ئاووڕیان لە زمانی کوردی نەداوەتەوە، بەڵام خوێندەواری کوردیان پێ گەیاندووە، ئیتر ئەم خوێندەواری‌یە بووەتە هۆی ئەوەی خوێندەوارەکە ئاووڕ لە زمان و کولتووری نەتەوەی خۆی بداتەوە.

## خوێندنی تایبەتی

گەلێ لە بنەماڵە کار بەدەست و دەوڵەمەندەکانی کورد مامۆستا و میرزای تایبەتی‌یان بۆ فێر کردنی منداڵیان ڕادەگرت، زۆر جار هەر ئەم مامۆستا و میرزایە دەوری نووسەر یا

سکرتێری دەبینی لەلای ئەو کار بە دەستە گەورەیە. ماڵ و دیوەخان و کۆشک و سەرای ماڵە گەورەکان هەمیشە ئەم جۆرە خوێندەوارانەیان لێ بووە، وەکو سەراو دیوەخانی والی‌یانی ئەردەڵان و سەرۆکەکانی عەشیرەتی جاف و بنەماڵەی بەدرخانی‌یەکان و هی تریش. جگە لەوە هەموو کاربەدەستانی عەشیرەت و گوند و دێهاتی کوردستان، هەتا ئەگەر ئاغای دێیێکی بچووکیش بوو بێ مەلایێکی هەر لە پاڵ بووە، سەرپەرشتی مەسەلەکانی ئایینی و منداڵانیشی فێری قورئان کردووە.

## دەسنووس

کورد ژمارەییێکی زۆری لە زانا و مەلای گەورەی ئایینی ئیسلامی بە زمانی عەرەبی پێشکێش بە سامانی نەتەوایەتی عەرەب و ئایینی موسوڵمانی کردووە، بەمە دەورێکی باڵای بووە لە هێنانە ناوەوەی دەسنووسی عەرەبی، لەم لایەنەوە بێ گومان ئەو دەسنووسانەی زانا و مەلای کورد ئامادەیان کردووە لەڕووی نرخی زانستی‌یانەوە بەرزن و لەڕووی نرخی هونەری‌یانەوە بێ هاوتان. نموونەی ئەم دەسنووسانەی کە بە درێژایی رۆژگار زانای ئایینی‌ی کورد نووسیویەتی‌یەوە و ئامادەی کردووە لە هەموو نامەخانە گەورەکانی گێتی دا دەبینرێن.

بەڵام ئێمە زیاتر مەبەسمان دەسنووسی کوردی‌یە، واتە ئەو دەسنووسەی بە زمانی کوردی نووسراوەتەوە وەکو دیوانی شیعر و لێکۆڵینەوەی زمانەوانی و شتی تریش، یا لە بابەت کوردەوەیە وەکو کتێبە بە نرخەکەی «شەرەفنامە» کە بە زمانی فارسی نووسراوەتەوە.

هۆی نووسینی «شەرەفنامە» بە زمانی فارسی ئەوە بوو لەو رۆژگارەدا زمانی فارسی وەکو زمانی تورکی زمانێکی ڕەسمی بوو لە دەوڵەتی عوسمانلی و زمانی ئەدەبیاتی ئەو سەردەمە بوو لە هەرێم و ناوچەییێکی فراوانی دەوڵەتە ئیسلامی‌یەکان، ئەگینا دەبوو شەرەف خان بە تورکی بینووسێتەوە چونکە لەسەر داوای سوڵتانی عوسمانلی ئەم مێژووە بە نرخەی نووسیوەتەوە.

دەسنووسی کوردی زیاتر لە لایەن رۆژهەڵاتناس و گەرۆکە ئەوروپایی‌یەکانەوە لە کوردستانا دەست خراوە و براوەتە ئەوروپا. هەروەها هەندێ جاریش بەڕادان دراوە، وەکو ئەو بزووتنەوە خوێندەواری‌یەی کە قونسوڵی گشتی رووس ئەلێکساندەر ژابا لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەم لە ئەرزەڕۆم دروستی کرد بوو و شارەزایێکی وەکو مەلا

مەحمودی بایەزیدی گەلێ شتی لەمەڕ کوردەوە تۆمار کرد لە ژێر چاودێریی ژابا و لە پاشانا دەسنووسەکان نێررانە پیترسبورگ (لینینگراد).

دەسنووسی کوردی ئەوەی کەوتە ئەوروپا لە نامەخانە گەورەکانی وەکو نامەخانەی گشتی سالتیگوف - شیدرین و نامەخانەی ئامۆژگای رۆژهەلاتناسی ئەکادیمیەی زانستیی سۆڤیەت لە لینینگراد و نامەخانەی مار بورگ - بەرلین لە ئەڵەمانیا و نامەخانەی نیشتمانیی پاریس و نامەخانەی بەریتانی لە مۆزەی بەریتانی لە لەندەن و نامەخانەی زانستگاکانی لەندەن و ئۆکسفۆرد و کامبریدج لە بەریتانیا و هی تر پارێزراوون.

هەرچی دەسنووسەکانی ناوەوەیە ئەوانیش سەرو شوێنیان دیار نی‌یە ، لیستەیان بۆ نەکراوەو جێگەیان ئاشکرا نی‌یە، ئەوەی سەیر و جێی سەر سوڕمانیش بێ ئەوەیە دەسنووسی کوردی نەکەوتۆتە ناو نامەخانەکانی ئەوقافیش لە شارەکانی کوردستانی عیراق.

دەڵێن لە شەستەکان دا قاچاغچی لە سەر سنووری ئەم دیو و ئەو دیو هەستیان بەوە کرد بوو کە «ساڤاک»ی ئێران لە رەگەز پەرست و پان ئێرانیستەکان دەسنووسی کوردی بە نرخێکی گران دەکڕن، ئیتر لەم دیوەوە بۆ ئەو دیو دەسنووسی کوردیشیان لەگەڵ ماڵی قاچاغ بار دەکرد و لەوێ بە پارەیێکی باش دەیان فرۆشت. ئەم دەسنووسانە نەدەچوونە نامەخانە و ئەرشیفی ساڤاکەوە بەڵکو دەسووتێنران.

لە پێش داهاتنی چاپخانە هەموو داهێنانێکی بیری ئادەمزاد بە دەست دەنووسرایەوە، بۆ ئەوەی بپارێزرێ و لە ناو نەچی و تاقی کردنەوەی نەوەیێک بۆ نەوەکانی تر بمێنێتەوە. هەموو بەرهەمێک بۆ مەبەسی فێر بوون و زانیاری و زانستی پەیدا کردن ڕوونووس دەکرا بە پێی پێویست و داوای خەڵک، واتا کتێبێکی دەسنووس ڕوونووس دەکرا بۆ ئەو کەسانەی گەرەکیان بوو، بەم پێیە لە هەر دەسنووسێک گەلێ نوسخە دەکەوتە ناوەوە. نووسەری تایبەتی هەبوو کار و پیشەیان ڕوونووس کردنی بەرهەمی زانستی و ئەدەبی بوو بە پارە.

دەسنووس لە ڕۆژهەلات دا تا ماوەیێکی زۆر دەوری یەکەمی لە خوێندەواری دا هەبوو، لە هەندێ لە مەدرەسە و مزگەوتەکانی کوردستان تا دەوروبەری جەنگی دووەمی گێتی و بگرە تا ئێستاش باوی ماوە. ئەمەش بە هۆی ئەوەوە بوو کە چاپخانە درەنگ گەیشتە ڕۆژهەلات و درەنگتریش گەیشتە ناو کۆمەڵی کوردەواری.

کۆمەڵی کورد وەکو بەشێک لە کۆمەڵی ئیسلام - دیارە مەبەس لێرەدا بەشی زۆری گەلی کوردە نەک هەمووی - مەڵبەندی خوێندەواری مەدرەسە و مزگەوت بووە، ناوەرۆکی خوێندەواریش زانستی‌یەکانی ئایینی موسوڵمان بووە کە هەمووی بە زمانی عەرەبی بووە و بەشێکی زۆریشی هەر پێوەندی بە زمانی عەرەبی‌یەوە بووە و لە پێناوی خزمەت کردنی ئەودا بووە. لەبەر ئەوەیە بەشێکی هەرە زۆر لە دەسنووس پێوەندی بەم زانستی‌یانەوە هەیە. مەلا و میرزا و خوێندەواری کورد دەورێکی باڵایان بووە لە زانستی‌یە عەرەبی و موسوڵمانی‌یەکان تا پلەیێک گەلێ لە بەرهەمەکانیان لە وڵاتی هەموو عەرەب دا بە ناوبانگن و سەرچاوەی خوێندەوارین.

دیارە لێرەدا مەبەسی ئێمە ئەم جۆرە دەسنووسە نی‌یە، بەڵکو ئەو دەسنووسانەی پێوەندی‌یان بە زمانی کوردی و کۆمەڵی کورد و ئەدەبیات و هەموو کار و بارێکی شەقڵی نەتەوایەتی‌ی پێوە بێ. واتە دیوانی شاعیرانی کورد و هەموو دەسنووسێکی باس لە سووچێکی ژیانی کورد بکا.

لەو کاتەی کە دەسنووسی موسوڵمانی لە کۆمەڵی کورد دا لە پێناوی خزمەت کردنی زمانی عەرەبی بووە، دەبینین دەسنووس و سەرچاوەکانی ئایینی بە شێوەی کرمانجی‌ی سەروو ئەوەی سەر بە یەزیدی‌یەکانە، وە بە شێوەی گۆرانی ئەوەی سەر بە یارسان ئەهلی هەقە، بە شیعر و پەخشانەوە شەقڵی نەتەوایەتی پێوەیە، واتە بە زمانی کوردی نووسراوەتەوە و باس لە بیروباوەڕ و ئایینێک دەکا کە شەقڵی نەتەوایەتی‌ی پێوەیە.

بەشی هەرە زۆری ئەو دەسنووسانەی ئێمە مەبەسمان ئەو دەسنووسانەن کە بە کوردی نووسراونەتەوە (بە هەموو شێوەکانی‌یەوە)، هەروەها بەشێکی کەمی دەسنووسی تریش کە ئێمە مەبەسمانە ئەو دەسنووسانەن کە بە زمانی دیکە نووسراونەتەوە، بەڵام لە بابەت کوردەوەن.

## جێگەی دەسنووس لە وڵات دا

لەگەڵ پەیدا بوونی بزووتنەوەی ڕۆژهەڵاتناسی لە ڕێی ڕۆژهەڵاتناس و گەڕۆکە ئەورووپایی‌یەکانەوە بەشێکی زۆر لە دەسنووسی ڕۆژهەڵات و نموونەی تری ئەرکیۆلۆجی کەوتە نامەخانە و مۆزەکانی ئەورووپاوە. تا ماوەیێکی زۆریش نە ڕۆژهەڵاتناسەکان گەیشتبوونە ئەو پلەیەی لە توانایان دا بێ ئەم دەسنووسانە ساغ بکەنەوە و نەخوێندەواری ڕۆژهەڵاتیش ئاگاداری‌ی ئەو دەسنووسانە و ناوەرۆکەکانیان بوون.

دەسنووسی کوردیش وەکو دەسنووسی نەتەوەکانی تر بەشێکی زۆری کەوتە ئەوروپا، ڕەنگە ئەمە بەخێر گەڕابێتەوە بۆ کورد، چونکە لەوێ پارێزراوە، هەرچی هی لای خۆشمانە لەبەر زرووفی تایبەتی و ژیانی ڕۆژانەی تایبەتیی کۆمەڵی کورد بەشێکی زۆر لەم دەسنووسانە لەناو چوون، بە تایبەتی لە ڕۆژگارانی جەنگ و شەڕ و شۆڕ دا. بۆ بەڵگە لەپاش ڕووخانی دەوڵەتی عوسمانلی لەناوچەکانی سەرووی کوردستان دەسنووسی کوردی دەسووتێنرا، چونکە نووسراوی کوردی قەدەغە بوو. لە ماوەی زرووفە تایبەتییەکەی کوردستانی عیراق (١٩٦١ - ١٩٧٥) بە ئاسانی دەسنووسی کوردی ئاوای ئەو دیو دەبوو، بە تایبەتی بازرگانی و جانبازی کردنیش بەم دەسنووسانە کردەوەیێکی باو بوو. دەڵێن لەو دیو بە پارەی باش دەسنووسی کوردییان دەکڕی. دیارە ئەمە بۆ پاراستن و ساغ کردنەوەیان نەبووە، بەڵکو بۆ نەهێشتن و لەناو بردنیان بووە.

تا ئەم دووایییە چارەنووسی دەسنووس و نموونە و پاشماوەی مەتریالی ئەرکیۆلۆجی بەرەڵلا بوو، دەوڵەت دەستی بەسەر دا نەگرتبوو، لەم ماوەیەدا زۆربەی هەرە زۆری ئەم دەسنووسانە موڵکی خەڵکی بوون لە ماڵان. بە ڕێکەوت ئەگەر کەسێک بیویستایە دەسنووس بفرۆشێ دەسگا خوێندەوارییەکانی دەوڵەت دەیانکڕی.

بەم جۆرە و بە ڕێکەوت هەندێ دەسنووسی کوردی کەوتە نامەخانەی دەسگا خوێندەوارییەکانی وولات. بەڵام تائێستا بەشێکی تایبەت بۆ دەسنووسی کوردی لەم دەسگایانە دا نییە.

ڕەنگە هۆی ئەوە کەمی ژمارەی ئەو دەسنووسانە بێ، بە تایبەتی وەکو ووتمان زۆربەی هەرە زۆری ئەو دەسنووسانەی لە کوردستان نووسراونەتەوە پێوەندییان بە زمانی کوردی و سامانی نەتەوایەتیی کوردییەوە نییە.

بەم جۆرە دەبینین دەسنووسی کوردی لە نامەخانەی هەموو دەسگا زانستییە بەرزەکانی وولات دا هەیە، بەڵام ئەگەر بەراووردی بکەین لەگەڵ دەسنووسی زمانەکانی تر دەبینین یەکجار کەمە، بۆیە هەندێ جار لە کاتالۆجەکانیشیان ناویان تۆمار ناکەن. ئەگەر بێتو ئەم دەسنووسانە لە یەک جێ کۆبکرێنەوە ڕەنگە دەسنووسخانە و نامەخانەیێکی جوانکیلەی دەسنووسی کوردی دروست ببێ و ئەو وەختە ماوە هەبێ بۆ وەسف کردنیان و لە پاشانیش لێکۆڵینەوە و ساغ کردنەوە و بڵاو کردنەوەیان.

لەبەر ئەوەی تا ئێستا کاتالۆجی دەسنووسی کوردی بەشێوەیێکی گشتی لە ناوەوەی

وولآت بلآو نەكراوەتەوە، ئێمە ناتووانین جۆر و بابەتی ئەو دەسنووسانە دیاری بكەین، بەلآم دەتووانین ناوی ئەو دەسگا زانستییانە ببەین كە دەسنووسی كوردییان تێدا پارێزراوە لە ناوەوەی وولآت. ئەمانە بریتین لەوانەی خووارەوە:

١- نامەخانەی ئەوقاف لە بەغدا.

٢- مۆزەی بەغدا.

٣- مەجمەعی عیلمی عیراقی (ئەكادیمیەی زانستی عیراقی) لە بەغدا.

٤- نامەخانەی دیراساتی بەرزی كۆلێجی ئەدەبیاتی زانستگای بەغدا.

٥- نامەخانەی زانستگای سلێمانی.

٦- مۆزەی سلێمانی.

ڕەنگە لە نامەخانەكانی تری وولآتیش كەم و زۆر دەسنووسی كوردی چنگ بكەون. بەلآم ژمارەی ئەم دەسنووسانە چەندە و ناوەڕۆكیان چی‌یە؟ ئەمەیان نازانرێ، لەبەر ئەوەیە جارێ ئەم كەرەستە خوێندەوارییانە بۆ كورد وەكو نەبوو وایە! جگە لەوەش تا ئێستا دەسنووسی كوردی لە دەسنووسی موسوڵمانی جیا نەكراوەتەوە، واتە هەموو دەسنووسێكی لە كوردستان نووسرابێتەوە یا خاوەنەكەی كورد بێ، یا لەلایەن كوردێكەوە ڕوونووس كرا بێ، بە تایبەتی ئەو بەرهەمە فۆلكلۆرییانەی خاوەنیان نی‌یە، بە كوردی دانراوە، ئەمەیان ڕاست نی‌یە. ئێمە لەو كاتەی شانازی بەوەوە دەكەین كە كورد بەشدارییێكی زۆری لە پێش خستنی سامانی عەرەب و ئیسلام كردووە، ناكرێ بەرهەمی لەم بابەتە بێنینە ناو بەرهەمی نەتەوەیی‌یەوە.

## جێگەی دەسنووس لە دەرەوەی وولآت

لەوانەیە نامەخانەی گشتی لە ئەورووپا نەبێ كە دەسنووسی كوردی تێدا نەبێ، گومانیش لەوەدا نی‌یە كە دەسنووسی كوردی گەیشتۆتە وولآتە یەكگرتووەكانی ئەمەریكاش. ئەو نامەخانە و دەسگایانەی بەشێكی زۆر لە دەسنووسی كوردی دەپارێزن و ئەو زانیارییانەی لە بابەت ئەو دەسنووسانە بلآو كراونەتەوە ئەمانەی لای خووارەوەن.

## لەشاری سانت پیترسبورگ لە رووسیا.

دەسنووسی كوردی لە شاری سانت پیترسبورگ لە دوو دەسگای زانستی پارێزراوە، یەكەمیان نامەخانەی گشتیی دەوڵەتی (سالیتكوف - شدرین)، دووەمیان نامەخانەی

ئامۆژگای ڕۆژهەڵاتناسیی ئەکادیمیەی زانستیی لە شاری سانت پیترسبورگ.

زانیاری لە بابەت ئەم دەسنووسانەوە لە پاش جەنگی دووەمی گێتییەوە کەوتۆتە ناوەوە لەم کارەدا کارگەری ئامۆژگای ڕۆژهەڵاتناسی سانت پیترسبورگ مارگریت بوریسێڤنا ڕوودێنکۆ (لە هاوینی ١٩٧٦ کۆچی دوایی کردووە) دەستێکی درێژی لەم کارەدا هەیە. بۆ یەکەمین جار وەسفی هەندێ لەم دەسنووسانە لە ووتارێکی دا لە ساڵی ١٩٥٧ بڵاو کراوەتەوە.

لە پاشانا لە ساڵی ١٩٦١ دووبارە وەسفێکی تری هەموو دەسنووسەکانی لە کتێبێکی تایبەتی دا بڵاو کردەوە.

## دەسنووسی کوردی لە نامەخانەی گشتی

کۆمەڵێکی یەکجار بە نرخ لە دەسنووسی کوردی لە بەشی دەسنووسی نامەخانەی گشتیی سانت پیترسبورگ پارێزراوە. ئەم دەسنووسانە هەموویان لە لایەن ئاوگوست (ئەلیکساندەر دێمێنتێیێڤچ) ژابا و بە هۆی ئەوەوە هاتووتە دی. ئەم کۆمەڵە دەسنووسە لە ماوەی نێوان ساڵانی ١٨٥٦ - ١٨٦٩ کۆکراونەتەوە و نووسراونەتەوە لەو کاتەی کە ژابا قونسوڵی ڕووس بوو لە ئەرزەڕۆم لە دەوڵەتی عوسمانلی. لە ساڵی ١٨٥٦ بە دوواوە لەسەر داوای دۆرن، ژابا دەستی کرد بە فێر بوونی زمانی کوردی و کۆکردنەوەی کەرەستەی ئەدەب و فۆلکلۆر و زمان و ئەتنۆگرافیای کورد، هەروەها کۆکردنەوەی کۆمەڵێک دەسنووسی کوردی لە کارە هەرە گرنگەکانی بوو. لەم ڕووەوە ڕۆشنبیری کورد مەلا مەحموودی بایەزیدی دەورێکی باڵای هەبوو لە یاریدەدانی.

کۆمەڵە دەسنووسەکانی ژابا بریتین لە (٥٤)دەسنووس، لەمانە (٤٤)ی بە زمانی کوردییە، (٤)ی بە زمانی فارسییە، (٣)ی بە زمانی فەرەنسییە، وە (٣)ی تری بە زمانی تورکییە.

جگە لەمە لەناو کۆمەڵە دەسنووسەکانی ئامۆژگای ڕۆژهەڵاتناسیش دا (٣) دەسنووس لە کۆمەڵە دەسنووسەکانی ژابان.

زۆربەی هەرە زۆری ئەم دەسنووسانە بە دیالێکتی کرمانجیی سەرووی زمانی کوردین. بەشێکی کەمیش بە دیالێکتەکانی تری وەکو کرمانجی خوواروو و گۆرانی و هی ترن.

لە ڕووی ناوەرۆکیشەوە بەسەر ئەم بەشانە دا دابەش دەکرێن:

١- فۆلكلۆر و ئەدەبی خەڵک یاخود ئەدەبی میللی.

ئەمە بریتی‌یە لە گۆرانی‌ی قارەمانی و شایی و زەماوەندی ژن هێنان و گۆرانی‌ی كچان و پەندی پێشینان و قسەی نەستەق و قسەی بۆ پێكەنین و گاڵتە و گەپ و هی تر. هەروەها بەشێكیش لە گۆرانی و ووردە چیرۆكی میللی وەكو «گەورێ و خەلیل» و هی تر. ئەم دەسنووسانە وەنەبێ تەنیا تێكستی فۆلكلۆری كوردی بن، بەڵكو دەسنووسی وای تێدایە كە لە زمانەكانی تری رۆژهەلاتەوە گۆڕراوەتە سەر زمانی كوردی، وەكو «در المجالس» و قسەی بۆ پێكەنین و گاڵتە و گەپ و ووردە چیرۆكی میللی لە فارسی‌یەوە گۆڕراوەتە سەر كوردی.

٢- ئەدەب

ئەو بەرهەمانەی لە دەسنووسی سەر بە ئەدەب دا تۆمار كراوون دەكرێن بە دوو بەشەوە:

(أ) سەرچاوە و بنج و بناوانی ئەم بەشە كوردی ڕەسەنە، وەكو كۆمەڵێک لە دەسنووسی «مەم و زین» و «نۆبار»ی ئەحمەدی خانی و مەولوود نامەی مەلای باتەیی و بەیتی فەقێ‌ی تەیران كە لەگەڵ ئاودا گفتوگۆ دەكا و قەلای «دمدم»ی فەقێ‌ی تەیران و قەولی ئەسپی ڕەشی عەلی‌ی حەریری و زەمیل فرۆش و هی تر.

(ب) سەرچاوە و بنج و بناوانی ئەم بەشە بێگانەیە، بەلام شاعیران و ئەدیبانی كورد توانیویانە وەستایانە بەرهەمێكی بەرزی كوردی لە جەوهەرێكی بێگانە دروست بكەن، لە ڕاستیش دا ئەو جەوهەرە هەوێنی داهێنان بووە لە ناو هەموو نەتەوەكانی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست و ئاسیای ناوەڕاست، شاعیرانی كورد بەرهەمی بە نرخی وایان داهێناوە: شێخی سەنعانی فەقێ‌ی تەیران، یووسف و زولەیخا لە لایەن دوو خوێندەواری كوردەوە دانراوە سەلیمی سلێمان و حاریسی بتلیسی، هەروەها لەیلا و مەجنوون دیسانەوە حاریسی بتلیسی دایناوە. دەسنووسێكی تریش مەلا مەحموودی بایەزیدی ئامادەی كردووە بریتی‌یە لە گۆڕینی بەرهەمێک لە توركی‌یەوە بۆ زمانی كوردی. هەروەها زیاتر لە دە كەشكۆڵی بە نرخ لەو نامەخانەیەدا هەیە بریتین لە بەیازی شیعری هەمەڕەنگ، گەلێ لەو پارچە شیعرانەی لەو بەیازانە دا تۆمار كراوون هێشتا بلاو نەكراونەتەوە و لە مێژووی ئەدەبی كوردی دا ئاشكرا نین.

٣- زمانەوانی

زۆربەی ناوەرۆكی ئەم دەسنووسانە لە لایەن مەلا مەحموودی بایەزیدی‌یەوە

نووسراونەتەوە. وە ئەوەی ئاشکراشە ئەوەیە کە تێبینییان بەرامبەر بە زمانی کوردی و دەستووری لە ژێر رۆشنایی دەستووری زمانی عەرەبی بووە، چونکە ئەوانەی ئامادەیان کردووە مەلا بوون و شێوەی خوێندەوارییان عەرەبی و مەلایانە بووە. ئەو بەرهەمانەی لە لایەن مەلا مەحموودی بایەزیدییەوە نووسراونەتەوە ئەمانەن:

«رسالة تحفة النحلان في الزمان كردان» و تەسریفی فرمانی کوردی و «صفحەی صبیان» ئەمە ئەلفو بێی کوردییە بۆ ئەو منداڵانەی تازە دەست بە خوێندن دەکەن. هەروەها کتێبی «العبارة»ی مەلا یوونسی حەلقەتەینی و هەندێ دەسنووسی تری کە ڕاستەوخۆ بە پێشنیازی ژابا و سەرپەرشتی ئەوەوە دانراوە و ڕێک خراوە.

٤- ئەتنۆگرافیا و مێژوو

دوو دەسنووسی بە نرخ لەم ناوەرۆکانەوە لە ناوەوەیە، یەکەمیان لە خوو و ڕەووشت و ژیانی کۆمەڵایەتیی کوردی دەدوێ بە ناوی «عادات و رسومات نامەء اکرادیە» لە سەر داوای ژابا لە لایەن مەلا مەحموودی بایەزیدییەوە نووسراونەتەوە (لە لایەن ڕوودێنکۆ بڵاو کرایەوە). دووەمیان گۆڕینی بەرگی یەکەمی شاکاری میر شەرەف خانی بتلیسییە «شەرەفنامە» لە زمانی فارسییەوە بۆ زمانی کوردی لە لایەن مەلا مەحموودی بایەزیدییەوە.

## دەسنووسی کوردی لە ئامۆژگای ڕۆژهەڵاتناسیی ئەکادیمیەی زانستیی لە سانت پیترسبورگ

کۆمەڵێک دەسنووسی کوردی بە نرخ لە بەشی دەسنووسی نامەخانەی ئامۆژگای ڕۆژهەڵاتناسیی ئەکادیمیەی زانستی لقی سانت پیترسبورگ پارێزراوە.

ئەوەی ئەو بەشە لەوانەی نامەخانەی گشتی جیا دەکاتەوە ئەوەیە ئەم دەسنووسانە بە هەموو شێوەکانی زمانی کوردین، وەکو: کرمانجیی سەروو و کرمانجی خوواروو و گۆرانی و لوڕ، ئەم دەسنووسانە لە لایەن هەندێ زانا و ڕۆژهەڵاتناس و کوردناسەوە پێشکەش بە مۆزەی ئاسیا (ئامۆژگای ڕۆژهەڵاتناسی) کراوون، لەمانە سێ دەسنووس هی ژابایە، ئەوانی تر لە لایەن ڤ. ڤیلیامینۆڤ - زیرنوڤ و ب. أ. دورن و ڤ. ف. مینۆرسکی و هی ترەوە پێشکەش کراوون. هەندێ لە دەسنووسەکان بەپێی ئەو شێوە زمانەی کە پێی نووسراوون، بەم جۆرەیە:

١- شێوەی گۆرانی

کۆمەڵێک دەسنووس بریتی‌یە لە چیرۆکە شیعری‌یە بە ناوبانگەکانی ئەدەبی کلاسیکی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست، وەکو ئەسکەندەرنامە کە لە فارسی‌یەوە کراوە بە شێوەی گۆرانی زمانی کوردی، هەروەها چیرۆکە شیعری‌یەکانی میرزا شەفیعی جامەڕێزی و گەلێکی تر لە شاعیرانی کورد.

٢- شێوەی کرمانجی‌ی خوواروو

پێشەکی‌ی گوڵستانی شێخی سەعدی بە پەخشان تەرجەمەی کرمانجی‌ی خوواروو کراوە، نوسخەیێکی دیوانی نالی لە سەرەتای ئەم سەدەیە ڕوونووس کراوە و لە لایەن مینۆرسکی‌یەوە پێشکەش کراوە.

٣- شێوەی کرمانجی‌ی سەروو

یەکێ لە دەسنووسە هەرە گرنگەکانی شێوەی کرمانجی‌ی سەروو ئەو کەشکۆڵەیە کە لە ساڵی ١٨٩٩ نووسراوەتەوە و دەست ڕۆژهەلاتناسی ئەڵەمانی مارتن هارتمان کەوتووە، ئەمە بریتی‌یە لە دە کاری ئەدەبی و فۆلکلۆری، گرنگترینیان تێکستێکی میللی مەم و زین یا «مەمی ئالان»ە.

(١) تێکستی «مەم و زین» یا «مەمی ئالان»ی فۆلکلۆری لە کۆکراوەکانی «مارتن هارتمان»، گۆڤاری کۆلێجی ئەدەبیات، ژمارە (١٦)، بەغدا، ١٩٧٣، ل ٥٩ - ٩٥.

هەروەها فێر بوونی گفتوگۆ بە زمانی کوردی و نامەی هەندێ جیاوازی لە نێوان شێوەکانی زمانی کوردی‌یەوە.

ئەم دەسگایە دەسنووسێکی گرنکی تری پاراستووە «دەستووری زمانی عەرەبی بە کوردی» عەلی‌ی تەرەماخی، بلاو کردنەوەی ئەم دەسنووسە و لێکۆڵینەوە لە سەردەمی نووسینەوەی و زانیاری لە بابەت خاوەنەکەیەوە گەلێ هەڵەی لە مێژووی سامانی نەتەوایەتی کورد ڕاست کردۆتەوە. ئەم بەرهەمە لەلایەن ئێمەوە بلاوکراوەتەوە (بەغدا،١٩٧١).

دەسنووسێکی تری زۆر گرنگ لەم ئامۆژگایە دا پارێزراوە، ناوی «گوڵشەن»ە و لە ساڵی (١١٩٨ هـ/ ١٧٨٣ - ١٧٨٤ز) نووسراوەتەوەو بریتی‌یە لە (٤٥٩) پەڕە، دیوانی شیعری گەلێ لە نەتەوەکانی ڕۆژهەلاتی تێدایە لەگەڵ هەڵبژاردەی بالاترین نموونەی

شیعری کلاسیکی فارسی، لەمە (٩) پارچە شیعری کوردیش تۆمار کراوە بە شێوەکانی کرمانجی‌ی سەروو و گۆرانی و لوڕی، هی شاعیرانی وەکو ئەحمەدی خانی، تەیفی هەکاری، مەلا حەسەنی کاشی، شێخ حەسەنی گۆرانی، کادی شەهمیری لوڕ.

جگە لەمانە بەشێکی تریش لە دەسنووسەکانی ئامۆژگا لە زمانانی بێگانەوە گۆڕراونەتە کوردی، وەکو پەندی پێشینان و قسەی نەستەق لە زمانی تورکی‌یەوە بۆ کوردی و هەندێ وورده چیرۆکی فارسیش گۆڕراوەتە سەر زمانی کوردی.

لە ئەرشیفی نیکیتین لە ئامۆژگای ڕۆژهەڵاتناسی بەشێکی بە نرخ لە دیوانی عەبدوڵڵا بەگی میسباح - ددیوان پارێزراوە. ئەم دەفتەرە لە کاتی خۆی دا لە ساڵانی جەنگی یەکەمی گێتی لە لایەن شاعیرەوە پێشکەش بە نیکیتین کرا بوو کە لەو سەردەمەدا قونسوڵی رووس بووە لە شاری تەورێز. ئەم برە شیعرەی میسباح لە ساڵی ١٩٧٠ لە بەغدا لە لایەن نووسەری ئەم کتێبەوە بڵاو کراوەتەوە.

## دەسنووسی کوردی لە ئەڵەمانیا

لە نێوان دووا ساڵانی سەدەی نۆزدەم و جەنگی یەکەمی گێتی کە ئەڵەمانیا بە ڕاستی قۆڵی لێ هەڵماڵی بوو و دەیویست جێ پێ‌ی خۆی خۆش بکا لە هەرێمی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بە تایبەتی ناوچەکانی وولاتانی عوسمانلی و ئێران. لەم ماوەیەدا کۆمەڵێک زانای بە ناوبانگی ئەڵەمانی وەکو پروفیسۆر ئۆسکارمان و پروفیسۆر فۆن لکۆک و پروفیسۆر مارتن هارتمان و پروفیسۆر ئەدوارد سەخاو و پروفیسۆر ئاوگوست پێتەرمان ڕوویان کردە کوردستان، ئەمانە لە ئەنجام دا توانیان لەگەڵ جموجۆڵی خوێندەواری و نووسینەوەی چەند باسێکی زانستی لەسەر زمان و ئەدەبیاتی کوردی ژمارەیێک دەسنووسی کوردی‌یان کۆکردەوە و هێنایانەوە بۆ ئەڵەمانیا. ئەمە بوو بە هۆی ئەوەی ئەم دەسنووسانە لە نامەخانەکانی بەرلین و توبینگین و ماربورگ بپارێزرێن. بەشی هەرە زۆری ئەم دەسنووسانە ئێستا کە لە نامەخانەکانی بەرلین و ماربورگ پارێزراوون، هەندێکیش لە دەسنووسەکانی ئۆسکارمان لە ئەکادیمیەی زانستی‌ی ئەڵەمانیا لە بەرلین چنگ دەکەوون.

دوکتۆر کەمال فوئاد لە کاتی خۆی دا لە ساڵی ١٩٧٠ کارێکی بەجێ‌ی کرد بەوەی وەسفێکی ئەم دەسنووسانەی بە شێوەیێکی زانستی‌یانە بڵاو کردەوە ئەمە بووە هۆی ئەوەی کە ئەم دەسنووسانە بە هەموو کوردناس و ڕۆژهەڵاتناس و خوێندەوارێکی کورد بناسێنی و دەرگای ئەم گەنجینەیەی لە ڕووی هەموو لایێک کردەوە.

لەبەر ئەوەی مەڵبەندی ئەم دەسنووسانە سەرانسەری کوردستانی ئێرانە، دەبینین دەسنووسەکان بە هەموو شێوەکانی زمانی کوردی تۆمارکراون، بەشی زۆری بە شێوەی گۆرانیی زمانی کوردییە، بەشەکەی دیکەش زۆربەی بە شێوەکانی کرمانجیی سەروو و کرمانجیی خوارووە، بە پێچەوانەی دەسنووسەکانی سانت پیترسبورگ کە بەشی هەرە زۆری بە شێوەی کرمانجیی سەرووی زمانی کوردییە.

لە ڕووی ناوەرۆکیشەوە بەسەر ئەم بەشانەی لای خوارەوە دابەش دەکرێ:

١- چیرۆکی شیعری (مەسنەوی)، ئەمە بریتییە لە حیکایەتی دڵداری و شەڕ و شۆڕ کە لە ئەدەبی هەموو نەتەوەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دا باوە، بە تایبەتی کوردی و فارسی و تورکی، سەرچاوەی ئەم چیرۆکانە یا میللی و نەتەوەیین، یاخود ئێرانین، یا لە بنج دا سامی و عەرەبین، بە گۆڕین و وەرگرتن لە ناو ئەدەبی ئەم نەتەوانە باوون، چیرۆکە کوردییەکان زۆربەیان لە فارسییەوە گۆڕراونەتە سەر زمانی کوردی، یا بە دەست کارییەوە وەرگیراوون، لەناو دەسنووسەکان دا ئەم چیرۆکە شیعرییانە دەبینرێن:

مەنیجە و بیژەن، شیرین و فەرهاد، خوسرەو و شیرین، ڕۆستەم و زۆراب، خورشید و خاوەر، حەیدەر و سنۆبەر، بارام و گوڵەنام، ئەسفەندیار و ڕۆستەم، سەنعان و تەرسا، وەرەقە و گوڵشا، یووسف و زولەیخا، لەیلا و مەجنوون و هی تر.

٢- دیوانی شیعر

بەشێکی بە نرخ لە دیوان و شیعری شاعیرە کلاسیکییە کوردەکان لە ناو ئەم دەسنووسانە دا پارێزراوون، هەندێ لەم غەزەل و قەسیدانە لە کوردستان نەماوون، هەتا ئەوانەی ئەگەر چنگیش بکەون لە نرخی ئەم دەسنووسانە کەم ناکەنەوە، بەڵکو ئەمانە نرخی خۆیانیان هەیە بۆ ساغ کردنەوە و ڕاست کردنەوەی تێکستی ئەو شیعرانەی نوسخەی دەسنووسیان لە یەکێک زیاترە، لە ناو دەسنووسەکان دا دیوان و شیعری ئەم شاعیرانە دەبینرێن:

مەلا پەرێشان (نیوەی دووەمی سەدەی چواردەم و نیوەی یەکەمی سەدەی پازدەمی زایین)، شێخ ئەحمەدی جزیری (سەدەی پازدەمی زایین)، وەداعی (سەدەی نۆزدەم)، نالی (١٨٠٠ - ١٨٥٦)، سالم (١٨٠٥ - ١٨٦٩)، کوردی (١٨١٢ - ١٨٥٠)، شێخ ڕەزا (١٨٤٢ - ١٩٠٩). وەفایی (١٨٤٤ - ١٩١٤)، ئەحمەدی کۆر (نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەم و سەرەتای سەدەی بیستەم)، حەریق (١٨٥٦ - ١٩٠٩).

جگە لەم تێکستە بە نرخانەی شیعری کلاسیکی بەشێکیش لە شیعرەکانی نالی و کوردی و شێخ ڕەزا و وەفایی و ئەحمەدی کۆر و هی تر تەرجەمەی فارسی کراوە و مێژووی ژیانیان بە فارسی نووسراوەتەوە.

(٣) حیکایەتی قارەمانی و پەند و ئامۆژگاری

ئەم کۆمەڵە دەسنووسە بریتی‌یە لە بەشێک لە ئەدەبی میللی‌ی تۆمار کراو و ئەدەبی کلاسیکی‌ی نووسراو کە بە شێوەی مەسنەوی دارێژراوە لەو کاتەی کە شیعر بێ، چونکە بەشێکی بە پەخشان دەگێڕرێتەوە. ناوەڕۆکی دەسنووسە هەرە گرنگەکانی ئەم بەشە ئەمانەن:

ئیسماعیل نامە، بەبری بەیان، بەهمەن و فەرامەرز، بەیتی شێخی سەنعان، جەنگنامەی شازادە محەمەد عەلی میرزا لەگەڵ کەهیا پاشا، حاتەمنامە (بەسەرهاتی حاتەمی تەی)، حیکایەتی ئیلان شاه، حیکایەتی گوربە و مووش، داستانی ئیمامی عەلی، داستانی گورگ و روبا، سوڵتان جومجومە، محەمەدی حەنیفە، «منطق الطیر»، مولوود نامە، نادر نامە، هەفت گونبەد، هەفت پەیکەر، وەفات نامە و هی تر...

(٤) دەسنووسی زمانەوانی

ئەم دەسنووسانە بریتین لە هەندێ فەرهەنگی نەتەوەیی کە بە شیعر رێکخراوە، وەکو «نۆبار»ی ئەحمەدی خانی و «ئەحمەدی»ی شێخ مارفی نۆدەیی. جگە لەمانە کۆمەڵێکیش دەسنووس لە ناوەوەیە لە بابەت دەستووری زمانی عەرەبی بە کوردی، یاخود دەستووری زمانی کوردی لە ژێر ڕۆشنایی دەستووری زمانی عەرەبی، وەکو دەسنووسەکانی «تصریف»، «ترکیب»، «ظروف» ی مەلا یوونسی هەلقەتەینی.

(٥) هەندێ دەسنووسی تر لە بابەت مێژوو و بە سەر هات و مێژووی ژیانی گەورە پیاوان، وەکو:

تاریخی شەش سەد و چل و یەک ساڵی مەملەکەتی کوردستان، شەرحی حاڵی عەبدوڵڵا خانی موکری، نامەی عەشایری دانیشتووانی دەوروبەری سابلاغی موکری.

## دەسنووسی کوردی لە لەندەن

### مۆزەی بەریتانیا

بە هۆی گەڕۆک و سیاسی و ڕۆژهەلاتناسە ئینگلیزەکانەوە هەندێ دەسنووسی کوردی بە

شێـوەی گۆرانی کەوتە لەندەن و لە مۆزەی بەریتانی پارێزراوون، بە تایبەتی هەندێ لەم دەسنووسـانە لە لایەن ڕۆژهەڵاتناس مـینۆرسکی‌یەوە پێـشـکەش کـراوون، پاش ئەوەی لە وولاتی خۆی رووسیە دوورکەوتەوە لە ئەنجامی شۆرشی ئوکتۆبەر و لە پێشانا لە پاریس و لە پاشانا لەندەنی کرد بە مەڵبەندی ژیانی.

دەسنووسەکانی لەندەن لە ڕووی ناوەرۆکەوە دەکرێن بە دوو بەشەوە:

١- چیرۆکی شیعری کە بە شێوەی مەسنەوی دانراوە. دەسنووسە هەرە گرنگەکانی ئەم ناوەرۆکە ئەمانەن:

خـورشـیـدی خـاوەر، لەیلا و مـەجنوون، خـوسـرەو و شـیـرین، فـەرهادو شـیـرین، بارام و گوڵەنام، هەفت خوانی ڕۆستەم، زۆراب و ڕۆستەم، خاوەران، محەمەد عەلی لەگەڵ کەهیا پاشا، جەنگی مەلەخ لەگەڵ ئاتەش مولووچ و هی تر.

هەوڵ دان بۆ بژار کـردنی زمـانی کـوردی و بەکـار هێنانی کـوردی پەتی لە نووسین دا دەگـەڕێتـەوە سەرەتای بیسـتـەکان، بە تایبـەتی کۆششـەکـانی ڕۆژنامـەی «پێشـکەوتن» (١٩٢٠ - ١٩٢٢)ی سلێمانی لەبەر چاوە.

٢- شیعری گۆرانی دە کەرتی

ئەم دەسنووسـانە بریتین لە کۆمـەڵە شـیـعرێک بە شێوەی گۆرانیی زمانی کـوردی هی کۆمەڵە شاعیرێکی پێش ساڵی ١٧٨٨ن کە دەسنووسەکان تێیدا نووسراوون، ئەوانەی لەو ماوەیەدا ژیاوون:

مەحزوونی (کاتبی قەسری خوسرەو خانی والی بووە ١٧٥٤ - ١٧٨٩)، شێخ ئەحمەدی تەختی (لە ١٦٤٠ ژیاوە)، مـحـەمـەد قـولی سـەلمان، مـیـرزا ئیـبـراهیم، مـەولانا قـاسم، یووسف یاسکە، شێخ لوتفوڵڵا، مەلا تاهیری هەورامی، ئەلیـاس بەگ، مەلا فـەزلوڵڵا، حاجی عـەلیی مـحەمەد بەگی تێلەکۆ، مەولانـا فەروخی بلنگانی، مەلا حافزی فەرهاد، ڕەزا بەگ، مـحـەمـەد بەگی هەورامی، شـێـخ یەعـقـووب خـان، ئیـوەیس بەگ، مـەولانا یووسف، شێخ حەسەنی دەرە هەردی، عـەبد، عومەری نزاری شێخ مستەفای تەختی، سۆفی عـەلیی کوانی، شێخ ئەحمەدی مووئی، لالۆ خوسرەو، شێخ شەمـسەددینی دەرە هەردی، ئوستاد میکائیل، خانای قوبادی (لە ١٧٦٠ مردووە)، مەلا مستەفا بێسارانی، سەیدی هەورامی (لە ١٥٢٠ مردووە)، مەلا ڕەحیمی تاوەگۆزی، ئەحمەد بەگی کۆماسی.

## کۆمەڵە رۆشنبیری و خوێندەوارییەکان

ئەو مێژووە تایبەتییەی کوردی تێدا تێپەڕ بووە وای کردووە جیاوازییێکی ئەوتۆ لە نێوان ڕێکخراوی سیاسی (پارتی) و ڕێکخراوی کۆمەڵایەتی و رۆشنبیری (کۆمەڵە = جەمعیەت) نەبێ، چونکە هەموو کۆمەڵەیێک ناوەرۆکی پارتییەتی تێدا بووە. کۆمەڵەی رۆشنبیری لە کۆمەڵی کورد دا پێش پارتی کەوتووە و دەوری ئەوی دیوە. لە کۆنەوە هەوڵی ئەوە دراوە کە کۆمەڵەی رۆشنبیری و لاوان و قوتابییان ڕێک بخرێ. کاری ئەم کۆمەڵە و ڕێکخراوانە ئاشکرایە لە پێش خستن و گۆڕرانی بزووتنەوەی کولتوور و ئەدەبی کوردی، بۆیە جێی خۆیەتی مێژووی هەندێ لەم کۆمەڵانە بخەینە ڕوو:

### ١- کۆمەڵەی هیوی قوتابیانی کورد

دامەزرێنەرانی بە تورکی ناویان نابوو «کرد طلبە هیوی جمعیتی»، بەڵام زیاتر بەناوی «هیوی» ناسرا بوو. ئەمە لەساڵی ١٩١٣ لە ئەستەموول لە لایەن کۆمەڵێک نیشتمان پەروەرانی کورد و قوتابیانی کوردی خوێن گەرم ڕێک خرا بوو. دیارترین جموجۆڵی ئەم کۆمەڵەیە لە کۆواری «ڕۆژی کورد» خۆی دەنواند کە بە زمانانی کوردی و تورکی بڵاو دەکرایەوە. «ڕۆژی کورد» و «هی وی» لە یەکتری جیا نەدەکرانەوە. وەکو دامەزرێنەرانیان خۆیان دەیان ووت... «ڕۆژی کورد» بایەخێکی تەواوی بە سامانی نەتەوایەتی دەدا، بە تایبەتی هونەرەکانی ئەدەبی کوردی. ئەوەی سەرنج ڕادەکێشێ لە کاری ئەم کۆمەڵەیە ئەوە بوو هەوڵی دەدا بە ناوی ئاسان کردنی نووسینی کوردی هەندێ دەسکاری لە ئەلفو بێی عەرەبی بکا کە لەگەڵ زمانی کوردی بگونجێ بۆ ئەوەی نووسینی کوردی بە تیپی عەرەبی ئاسانتر بکا.

### ٢- جەمعیەتی زانستی کوردان

لە ساڵی ١٩٢٦ لە لایەن هەندێ کار بە دەستی میری و رۆشنبیر و خوێندەواری کوردەوە لە سلێمانی بناغەی ئەم کۆمەڵەیە هەڵکەندرا. دیارترین دامەزرێنەرانی لە خوێندن پەروەر و رۆشنبیرانی کورد ئەحمەد بەگی تۆفیق بەگ و ڕەفیق حیلمی بوون. وەکو دەردەکەوێ کۆمەڵە دەیویست لە بنج و بناوانەوە دەست پێ بکا، بۆیە پێش هەموو شتێک بیری لە «بژاری زمانی کوردی» کردەوە. ئەوی ڕاستی بێ ووشە و لێکسیکۆنی زمانانی عەرەبی و فارسی و تورکی کاریان لە زمانی کوردی کرد بوو. جا هەر لە سەرەتاوە

خوێندەوارانی کورد هەستیان بەوە کردبوو کە دەبێ زمانێکی تر بکەوێتە ناوەوە، ووشەو لێکسیکۆنی بێگانە لە ناویدا زاڵ نەبێ، ئەو زمانەی کە هیواو ئامانجی خوێندەوارانی کورد بوو ناونرا «کوردی پەتی»، هەر چەندە کۆششەکانی کۆمەڵەی زانستی لەم رووەوە سەری نەگرت بەڵام خەڵکی ووشیار کردەوە و هەوڵی لەوە پێشتریشی هێناوە یاد و بوو بە بەرنامەیێک لە دووایی دا رۆشنبیرانی کورد لە شیعر و پەخشان دا هەوڵیان دا بە کوردی پەتی بنووسن، لە ناو ئەمانە لە شیعر دا نووری شێخ ساڵح و پیرەمێرد و گۆران و هی‌تر،لە پەخشان دا تۆفیق وەهبی و رەفیق حیلمی و حوسێن حوزنی‌ی موکریانی و جەمیل رۆژ بەیانی و رەفیق چالاک و هی‌تر.

کۆمەڵەی زانستی هەوڵێکی بێ ووچانی دا بۆ دامەزراندنی چاپخانە و نامەخانێکی کوردی چونکە ئەمانە بنکەی بنچینەیی بوون بۆ بڵاو کردنەوەی رۆشنبیری لە ناو کۆمەڵ دا، بەڵام دیارە لەبەر زرووفی سیاسی تایبەتی و کورتی تەمەنی کۆمەڵە نەیتووانی ئەم ئامانجە بهێنێتە دی.

گرنگترین کارێکی سەر شانی کۆمەڵە دیارە فێر کردن و بڵاو کرنەوەی زمانی کوردی بوو. بۆ ئەم مەبەسە نەوەکو تەنیا پیاوی هان دەدا، بەڵکو ژنیش جێگەی دیاری هەبوو لە بایەخی کۆمەڵە دا، بۆیە هەوڵی دەدا لقی ژنانیش لە کۆمەڵە بکاتەوە. ئەوەی پێویستە لەم رووەوە بووترێ ئەوەیە کە کەریم سەعید زانستی دەورێکی باڵای هەبوو لە ووتنەوەی وانەی کوردی.

کۆمەڵە چەند شانۆگەری‌یێکیشی پێشکێش کرد، لەمانە «نیرۆن و سووتاندنی رۆما» لە ساڵی ١٩٢٧ و «شۆرشی گەورەی فرەنسا» لە ساڵی ١٩٢٨، فوئاد رەشید و کەریم زانستی لە ئامادە کردن و پێشکێش کردنی ئەم شانۆگەری‌یانە دەوریان دیار بوو.

کۆمەڵە لە دووایی دا کەوتە کزی و کوژانەوە، گەلێ شت کۆتایی پێ هات پاش رۆژی ٦ی ئەیلوولی ١٩٣٠ یەکێکیش لەمانە کۆمەڵەی زانستی کوردان بوو.

## کوردناسی و زمان و ئەدەبی کوردی

### لێکۆڵینەوە لە زمان و ئەدەبی کوردی لە ئەوروپا

سەرەتای لێکۆڵینەوە لە کولتووری نەتەوەکانی رۆژهەڵات لە لایەن ئەوروپایی‌یەکانەوە دەگەرێتەوە بۆ نوێنەرانی ووڵاتە پێشکەوتووەکان، ئەوانەی لە سەدەکانی ناوەراستەوە

هەوڵی ئەوەیان دەدا کە بێنە ڕۆژهەڵات و سوودی لێ وەربگرن، لە پێشانا بە بەهانەی پرۆپاگەندەی ئایینی، ئینجا بە هۆی پێوەندیی ئاڵوێر و بازرگانی. بێ گومان کردەوە و جموجۆڵی میسیۆنێرە ئەوروپاییەکان کارێکی ڕاستەوخۆی دەکردە سەر سوود و چاکەی دەستەی بەڕێوەبەرانی ئەم وڵاتانە.

لە پاشانا پێوەندیی ئەوروپا لەگەڵ ڕۆژهەڵات فراوانتر بوو، بە هۆی گۆڕرانی پێوەندیی ئابووری. ئەم پێوەندییە لە قۆناغی پەرەسەندن و گۆڕرانی سەرمایەداری و دووا پلەی پەرەسەندنی کە ئەمپریالیزمە، یەکسەر بوو بە هۆی چەوساندنەوەی وڵاتەکانی ڕۆژهەڵات و نەتەوەکانیان و کەوتنە ژێر باری سەرمایەداری ئەوروپا. بۆ پەیدا کردنی یەکەمین پێوەندی لە نێوان ئەوروپا و ڕۆژهەڵات پێویست بوو نەتەوەکانی ئەم وڵاتە زۆر چاک بناسن: خوو ڕەووشت و عادەتیان، زمان و کولتووریان. بۆ ئەم مەبەسە بە تایبەتی لە ساڵی ١٢٤٥ لە کۆبوونەوەی گەورەی ڤیەنا بڕیاری ئەوە درا کە لە پاریس یەکەمین لیژنە دابنرێ بۆ لێکۆڵینەوە لە زمانی نەتەوەکانی ڕۆژهەڵات.

بە پێی کۆمەڵێک سەرچاوە، ڕێکخەر و بەڕێوەبەری قوتابخانەی زمانانی ڕۆژهەڵات لە پاریس، کولبێر، هەوڵی ئەوەی دەدا کادر پێ بگەیێنێ بۆ بانقی فەرەنسی لە ڕۆژهەڵات، ئەوانەی فێری زمانانی ڕۆژهەڵات دەبن.

نەتەوەی کورد وەکو نەتەوەییێکی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست لە کۆنەوە وڵاتەکەی بوو بووە مەیدانێک گەڕۆکە ئەوروپاییەکان و زانا و جوگرافی و میسیۆنێرەکان چاویان تێ بڕی بوو.

ئەم ئەوروپاییانە ژمارەییێکی زۆریان لە کتێب خستە ناو کولتووری جیهانییەوە، لە تێبینی و بینینی ڕۆژانە و وەسفی وڵات و خوو و ڕەووشتی نەتەوە، ئەمە کەرەستەییێکی یەکجار گرنگە بۆ لێکۆڵینەوە لە مێژوو و ئەتنۆگرافیای نەتەوەی کورد.

بەڵگەی سیاسی و ئابووری کە بۆتە هۆی ئەوەی لە نەتەوەی کورد بکۆڵرێتەوە لە لایەن ئەوروپاییەکانەوە زانایانی کورد ووشیار دەکاتەوە، چونکە ئەم کارە زانستییانە بە ڕاستی ڕەنگدانەوەی چاکە و سوودی چینەکانی سەرەوە و کار بە دەستانی ئەم وڵاتانەیە. بەڵام ئەم تێبینییە لە نرخی ئەم کارانە کەم ناکاتەوە لە مێژووی لێکۆڵینەوەی کولتووری نەتەوەیی کورد، بەم جۆرە ئەم کارانە لاپەڕەییێکی یەکجار بە نرخی لە کوردناسیدا تۆمارکردووە.

دەسنیشان کردنی کەمو کووڕی ئەم کارانە دەبێ ئەو کارە زانستییانە بگرێتەوە کە نرخێکی زانستییان هەیە، وە نابێ پشت گوێ بخرێن، وەکو ئەوەی هەندێ جار ئەم کارە ڕوو دەدا. گرنگیی کارەکانی ڕۆژهەلاتناسەکانی ئەوروپا تەنیا لەوەدا نییە کە نرخێکی زانستییان هەیە، بەڵکو لەگەڵ ئەویش دا ئەم کارانە پرۆپاگەندەییێکی سیاسیی گەورەیان گێڕاوە بۆ ناسینی کورد لە ناو کۆمەڵی نەتەوەکانی ئەوروپا.

## ناوەرۆکی کاری زانستیی ئەوروپاییەکان

وەکو لە بیبلیۆگرافیای کورد ناسەکان دا دەردەکەوێ، ئەدەبیاتێکی دەوڵەمەند لە بابەت کوردەوە لە ناوەوەیە، بەلام لەگەڵ ئەوەش دا تێبینیی گشتی بۆ دەرخستنی خاسیەتی ئەم کارانە ئەوەیە کە سەر پێیین و بە قووڵی نەچوونەتە ناو گێتی لێکۆڵینەوەی زانستی لە بابەت کوردەوە، بە تایبەتی لە مێژوو و ئەدەبی ئەم نەتەوەیە. زۆربەی ئەم نووسراوانە لە لایەن نوێنەرانی ئەو جۆرە دەوڵەتە ئەوروپاییانەوە نووسراونەتەوە کە لە سەر چاکە و سوودی کۆلۆنیالی دەوڵەتەکانیان دەکەنەوە لە ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست دا.

کارگەری زانستیی سۆڤیەتی ڤاسیلێڤسکی ڕاست دەکا کە دەڵێ ئەو کارانەی ئەوروپاییەکان لە بابەت کوردەوە هێناویانەتە ناوەوە نەک بە لای ئێمەوە بەهێز نییە، بەڵکو هەتا بەپێی بیروڕای بورجوازی خۆی لە پلەییێکی بەرز دا نییە.

گەڕۆک و جوگرافی و زاناو نوێنەرانی دیبلوماسییە ئەوروپاییەکان ئەوانەی دەنێررانە کوردستان بۆ لێکۆڵینەوە لە وولاتی کوردەواری و میللەتی کورد بایەخی بنچینەییان دەدایە جوگرافیا و ئەتنۆگرافیا و زمان و ئایین، هەرچی مێژووی خەباتی نەتەوایەتی و ژیانی کۆمەلایەتی و ئەدەبیشە لە کارەکانی ئەوان دا جێگەییێکی زۆر کەمی داگیر کردووە.

لێکۆڵینەوە لە ئەدەب و مێژوو و کولتووری نەتەوەی کورد لە ئەوروپا لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەمەوە دەست پێ دەکا، بە تایبەتی ئەمە لە دووا سالانی سەدەی نۆزدەم دا بەهێز بوو، لەو کاتەی وولاتە سەرمایەدارەکانی ئەوروپا بەرەو ئەمپریالیزمی دەچوون لە گۆڕڕانی مێژووییاندا. لە ئەدەبیاتی ڕۆژهەلاتی سەدەکانی هەڤدەم و هەژدەم زانیاری لە بابەت کوردەوە دەست دەکەوێ، بەلام زۆر کەمە.

چاو برسیەتی و دەم لستنەوەی ئینگلیز و فرەنسا و ئەڵمانیا و رووسیا، وای کرد بوو هەموو هەوڵدانێکیان بۆ قەپاندنی بەشی خۆیان بوو لە کاتی دابەش کردنی میراتی

ئیمپیراتۆریەتی عوسمانلی. ئەمە ڕێگەی بۆ خۆش کردن کە لە سیاسەتیان دا بایەخێکی تەواو بە هەندێ هەرێمی ئەم ئیمپیراتۆریەتە بدەن، یەکێک لەمانە وولاتی کوردستان بوو. لە هەموو ناوچەکانی کوردستان سیخوڕ و میسیۆنێر و نوێنەرانی بازرگانیی جیاواز دەبینران، ئەمانە تەنیا لە خوو و ڕەووشتی میللەتی کوردیان نەدەکۆڵی‌یەوە، بەڵکو دەورێکی بالآیان هەبوو بۆ هەموو کار و کردەوەیێکی کە چاکەی کۆمپانیاکان و خراپەی کوردی تێدا بێ.

پێویستە لەم ماوەیەدا بە کورتی لای کارەکانی زانایانی ئەوروپا بوەستین، بە تایبەتی ئەو کارانەی کە خاوەنەکانیان باس لە زمان و ئەدەبی کوردی دەکەن، بیروڕایان بەرامبەریان دەردەبڕن.

## باوکی کوردناسی لە ئەوروپا

جێی خۆیەتی ئەگەر ماوریزیو گارزۆنی ئیتالی بە باوکی کوردناسی لە ئەوروپا لە قەڵەم بدرێ. ئەو سەردەمەی گارزۆنی هاتە وولاتی کوردەواری و گەشتی تێدا کرد و تێیدا ژیا، بۆ ئیتالیا قۆناغی گۆڕانێکی بنچینەیی بوو. پەرە سەندن و بەرزبوونەوەی سەرمایەداری لە ئەوروپا پێویستیی بە بازاڕی زۆر و گەورە هەبوو. کلیسەی کاتۆلێکی فاتیکان پیاوانی خۆی لە میسیۆنێرەکان دەنارده ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست بۆ پرۆپاگەندە کردن بۆ مەزهەبی کاتۆلیکی. یەکێ لە میسیۆنێرەکانی پرۆپاگەندەی ڕۆما لە ئیمپیراتۆریەتی عوسمانلی ماوریزیۆ گارزۆنی دۆمنیکانی بوو، لە ئەنجامی مانەوەی هەژدە ساڵ لە کوردستان گارزۆنی یەکەمین کاری بە نرخی دانا، کە بریتی‌یە لە دەستووری زمانی کوردی و فەرهەنگی ئیتالی - کوردی.

لە پێشەکی‌ی کتێبەکەی دا گارزۆنی دەڵێ، مەبەس لە دانانی ئەم کتێبە ئەوەیە کە سەرچاوە بێ بۆ ئەو میسیۆنێرانەی لە دووا ڕۆژدا پرۆپاگەندە لە ناو کوردەکان دا دەکەن

وەکو گارزۆنی خۆی دەڵێ، گۆیا لیۆپۆلدۆ سولدینی دۆمنیکانی یەکەمین میسیۆنێر بووە کە چووە بۆ کوردستان و لە شاری ئامێدی نزیکەی ۱۷ ساڵ ژیاوە. هیچ کارێکی زانستی‌ی لە سولدینی‌یەوە بەجێ نەماوە.

مەبەسی هەرە بنچینەیی گارزۆنی لەم کارەی دا ئەوە بوو کە بەڵگەی پراکتیکی (تطبیقی) لە فێر بوونی زمانی گفتوگۆی کوردی بدا بە دەستەوە. کتێبەکە و

تێکستەکانی ناوی بە ئەلفو بێی لاتینی نووسراونەتەوە، بۆ مەبەسی ڕوونکردنەوەی تیپە لاتینی‌یەکانی ئەلفوبێی کوردی گارزۆنی بە ئەلفو بێی عەرەبی لێکیان دەداتەوە لەسەر شێوەی ئیملای فارسی. هەرچی فۆنێتیکی زمانی کوردیشە لە لایەن نووسەرەوە لە ژێر باری زمانی فارسی وون بووە، بەم جۆرە پیاو ناتووانێ لە کتێبەکەی گارزۆنی دا زمانی کوردی لە زمانی فارسی جودا بکاتەوە. ئەم بیر و ڕایە چەوتە بەرامبەر بە زمانی کوردی ماوەییێکی زۆر بەردەوام بوو لە لایەن زانایانی ئەوروپاوە.

## کاری دیکە لە بابەت زمانی کوردی‌یەوە

کارێکی تری پڕ سوود لەسەر کورد میسیۆنێرێکی دیکە دەستی دایە، ئەم ڕۆژهەلاتناسە ناوی هۆرنلی بوو، لە سەرەتای سەدەی نۆزدەم لە کوردستان کاری کردووە. ووتارێکی لە کۆواری میسیۆنێرەکان بلاو کردەوە، ئەمە لێکۆڵینەوەییێک بوو لە زمانی کوردی و هەندێ لایەنی ئەتنۆگرافی نەتەوەی کورد.

هۆرنلی دەڵێ زمانی کوردی و فارسی خزمی یەکترین. بەراوورد کردن بۆ ئەم خزمایەتی‌یە هۆرنلی دەبا بۆ ئەوەی بڵێ پێوەندی‌ی لە نێوان کوردی و فارسی وەکو پێوەندی‌ی نێوان شێوەی کرمانجی‌ی خوواروو و کرمانجی‌ی سەرووی زمانی کوردی‌یە، دەیەوێ لێرەدا ئەوە دەربخا کە ئەم دوو شێوەیە لە یەکتری جیاواز و دوورن. بێ گومان بە ئاسانی دەتووانین بڵێین کە هۆرنلی زانیاری‌ی سەر پێ‌یی هەبووە لە خاسیەتی ئەم دوو شێوەیەی زمانی کوردی.

لە نێوان سالانی ١٨٥١ - ١٨٦١ دا میسیۆنێری ئەمەریکی ڕیا Rhea لە ناو کوردەکانی هەکاری دا ژیا، وە بە چاکی فێری زمانی کوردی بوو بوو. لە ساڵی ١٨٧٠ دا کتێبی «دەستووری زمانی کوردی و فەرهەنگی هەرێمی هەکاری» دانا. ئەگەر ئەم کارە لەگەڵ کارەکانی تری پێش خۆی بەراوورد بکرێ، ئەمەیان لە هەموویان چاکتر و بە نرختر حسێب دەکرێ.

زانای خەڵکی ڤیەنا فریدریک میللەر لە ژێر ڕۆشنایی ئەو کەرەستانەی لەو سەردەمەدا لە ڕووسیا لە لایەن لێرخ و خۆدزکۆوە هاتبوونە کایەوە لێکۆڵینەوەییێکی بە کەڵکی بلاو کردەوە لە بابەت دیالێکتەکانی کرمانجی‌ی سەروو و زازای زمانی کوردی. مەبەسی هەرە گەورە و گرنگی میللەر لە نووسینەوەی ئەم باسە ئەوە بوو سەرنجی زانا و ڕۆژهەلاتناسەکان ڕابکێشێ بۆ زمانی کوردی وەکو زمانێکی سەربەخۆ و گرنگ. لە

باسەکەی دا ئەوە پیشان دەدا کە زمانی کوردی لە زمانی فارسیی تازەوە دروست نەبووە، بەڵکو خاسیەتی تایبەتیی خۆی هەیە و لەوەوە دوورە، جگە لەمەش لە فەرهەنگی زمانی کوردی دا ووشەیێکی گەلێ زۆر هەیە کە لە زمانە ئێرانییەکانی تر ناکەونە بەرچاو.

## کردەوەی زانایانی ئەڵەمان

لە دووا ساڵانی سەدەی نۆزدەم و سەرەتای سەدەی بیستەم زانایانی ئەڵەمان بایەخێکی تایبەتییان بە لێکۆڵینەوەی زمان و ئەدەبی کوردی داوە، لەو سەردەمەدا ئەمانە لە ڕیزی پێشەوە بوون لە ڕۆژهەڵاتناسی و کوردناسیی ئەوروپا. بەهێز بوون و فراوان بوونی چاکەی سەرمایەداریی ئەڵەمان لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، لە قۆناغی گۆڕانی ئابووریی ئەمپریالیی ئەڵەمانیا پێویستی بەوە دەکرد کە ئاگاداری ڕۆژهەڵات بێ. بۆ ئەم مەبەسە دەبوو لە وولات و نەتەوەکانی بکۆڵێتەوە، ئەوانەی کەوتبوونە ژێر باری سیاسەتی مۆنۆپۆلییە ئەڵەمانەکان.

ئیمپیراتۆر (ڤیلیهیلیم)ی دووەم بایەخێکی تەواوی بەم مەسەلەیە دەدا، بۆ ئەمە نێرراوی زانستیی دەنارده ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بە تایبەتی و وولاتانی ئێران و عوسمانلی و پارەیێکی زۆریشی بۆ ئەم مەبەسە تەرخان کرد بوو.

یەکێ لە ئەنجامەکانی ئەم سیاسەتەی ڤیلیهیلیم ئەوە بوو کە پرۆفیسۆر ئۆسکارمان نێررایە هەرێمەکانی باکووری ڕۆژئاوای ئێران. ئۆسکارمان لە ساڵی ۱۹۰۱ەوە تا ساڵی ۱۹۰۳ لە ژێر چاودێریی تایبەتی ئیمپراتۆری ئەڵەمان خەریکی فێر بوون و لێکۆڵینەوە و ساغ کردنەوە بوو لە زمان و فۆلکلۆری کورد. ئەو کەرەستانەی کۆی کرد بوونەوە بریتییە لە تێکستی شێوەکانی زازاو کرمانجیی خوارووی زمانی کوردی ناوچەی موکریان.

تێکستەکانی ئەم کتێبە لە لایەن هێمنی موکریانییەوە بۆ جاری دووەم لە دوو بەرگ دا بە تیپی عەرەبیی زمانی کوردی لە ساڵی ۱۹۷۵ لە بەغدا بڵاو کراوەتەوە، بەڵام بۆ مەبەسی لێکۆڵینەوە سەرچاوە ئەسڵەکەی ئۆسکارمانە.

ئەو کەرەستانەی لە ناوچەی موکریان کۆی کردەوە بە یارمەتیی گۆرانی بێژ و شاعیری میللی کورد ئاورەحمان بەکری سابلاغی بوو. وەکو لە تێکستەکان دا دەر دەکەوێ، گۆرانی بێژ لە کاتی بێژتنی بۆ ئۆسکارمان بۆ ئەوەی بینووسێتەوە لە خۆیەوە شتی تازەی دەخستە سەر گۆرانی و ئەو حیکایەتانەی دەیگێڕایەوە، بەم جۆرە لەگەلێ شوێن لە تێکستەکان دا

باس لە دەوڵەتی ئەڵەمان دەکرێ و مەبەسی ئۆسکارمان ئاشکرا دەکرێ وەکو کۆکەرەوەی تێکستی زمانی کوردی.

بۆ بەڵگە لە بەیتی «قەر و گوڵەزەر» لە دووایی دا ئاورەحمان بەکر ئەم دێڕانە دێنێتەوە:

ئەوە رەحمان بەکر بەناوە
ئەو بەندی کردووە تەواوە
خزمەت بە دەوڵەتی ئەڵمان کراوە

تێکستە کۆکراوەکانی ئۆسکارمان کە لە دوو بەرگ دا چاپ کراوە، کارێکی بێ هاوتا بوو لە کوردناسی دا، وەکو ئاشکرایە کەرەستە کۆکراوەکان بە گەلێ دیالێکتی زمانی کوردین، بەڵام ئەوەی گرنگ بێ بۆ ئێستا ئەوەیە کە بەشێکی زۆر لەو تێکستانە بە شێوەی کرمانجی‌ی خوواروون، ئەو شێوەیەی ڕۆژهەڵاتناسی‌ی ئەوروپا بایەخێکی ئەوتۆی پێ نەدا بوو لە سەدەی نۆزدەم دا. بەرهەمەکانی فۆلکلۆری وەکو «مەم و زین» و «دمدم» و «زەمبیل فرۆش» و هی تری کە بە شێوەی کرمانجی‌ی خواروو تۆمارکردووە، ئەم بەرهەمانە بەشێوەی کرمانجی‌ی سەرووش گەلێ تێکستی تری لە یەکچوو و جیاوازیان لە ناوەوە هەیە.

گرنگی‌ی ئەم کتێبەی ئۆسکارمان بووە هۆی ئەوەی هەر لە کۆنەوە هەندێ تێکستی کتێبەکە بهێنرێتە سەر ئەلفو بێ‌ی عەرەبی کە لە زمانی کوردی دا بەکار دەهێنرێ و دووبارە بڵاو بکرێنەوە، وەکو ئەو هەوڵەی گۆڤاری «دەنگی گێتی‌ی تازە» لە ساڵی ١٩٤٤ دا دای بۆ ئەم مەبەسە.

لە ڕووی نرخی ئەدەبی و زانستی‌یەوە ئەو کۆمەڵە کۆکراوە فۆلکلۆری‌یانەی لە لایەن زانایێکی تری ئەڵەمانەوە هۆگۆ ماکاش ئامادە کراوە قورسایی لە کارەکەی ئۆسکارمان سووکتر نی‌یە. بەشی یەکەمی ئەم کتێبە لە شاری هایدیلبیرگ لە ساڵی ١٩٠٠ بڵاو کرایەوە، کەچی لە پاش زیاتر لە چارەکە سەدەیێک، لە ساڵی ١٩٢٦ لە سانت پیترسبورگ بەشی دووەمی بڵاو کرایەوە بە یارمەتی‌ی و دڵسۆزی‌ی زانای ڕووسی (ئەرمەنی نەژاد) ڕۆژهەڵاتناسی. أ. ئۆربێلی، وە ئەوەی شایانی باسە لەم ڕووەوە ئەوەیە کە ئەم تێکستانە لە دووا ساڵانی سەدەی نۆزدەم لە لایەن هۆگۆ ماکاشەوە تۆمار کرا بوون.

هۆگۆ ماکاش کارێکی بچووکی پێ سپێررا بوو لە نامەخانەی زانستگای ڤیەنا، لە کاتی خۆی دا لە شاری برنۆ تێکستی کوردی لە زمانی بازرگانی‌ی کوردەوە محەممەد ئەمین

تۆمار کرد بوو بە شێوەی ناوچەی ماردین.

لە کۆمەڵە کۆکراوەکە دا حیکایەتی ئامۆژگاری و پەند و نەسیحەتی بە نرخ کۆکراوەتەوە لەگەڵ گۆرانیی جیاواز، هەموو ئەم تێکستانەش گۆڕراونەتە سەر زمانی ئەڵەمانی. ئەوەی نرخی ئەم کۆکراوانەی زیاد کردووە ئەوەیە نۆتەی مۆسیقی هەندێ لە گۆرانییە کوردییەکانیش تۆمار کراوون.

کە باس لە زانایانی ئەڵەمانی دووا سالآنی سەدەی نۆزدەم و سەرەتای سەدەی بیستەم دەکرێ لە بابەت کوردناسی و لێکۆڵینەوەی زمان و ئەدەبی کوردی پێویستە دوو زانای گەورەی ئەڵەمان لە یاد نەکەین، یەکەمیان (هارتمان) و دووەمیان (بیتنەر)ە. ڕۆژهەلآتناسی ناودار مارتن هارتمان بە هۆی یارمەتیی بالیۆزی ئەڵەمان لە ئەستەموڵ و ڕاوێژکاری بالیۆزخانەی ئەڵەمانیا هایس دەسنووسێکی گەورەی دەست خست لە زمانی کوردی. دەسنووسەکە یاخود کەشکۆڵەکە جگە لە دیوانی مەلای جزیری ئەم کارانەشی تێدا تۆمار کرا بوو:

١- چیرۆکی شیعری «مەم و زین»ی ئەحمەدی خانی (ل ٢٢٤ - ٤٠٣).

٢- نامەی پزیشکیی مەلا محەمەدی ئەروازی (ل ٤٠٤ - ٤١٠).

٣- لێکدانەوە لەسەر ووشەی عەرەبییەکانی نۆباری ئەحمەدی خانی (ل ٤١٢ - ٤٥٢). ئەم بەشە لە ساڵی ١٩٠٤ لە لایەن (فۆن لیکوک)ەوە لە بەرلین بلآو کراوەتەوە.

٤- عەقیدەی ئەحمەدی خانی (ل ٤٥٣ - ٤٦٧). عەقیدە و نۆباری ئەحمەدی خانی لە ئەستەموڵ لە ساڵی ١٨٩٢ بلآو کراونەتەوە ئەم دوو کارەی ئەحمەدی خانی لە کتێبی «یوسف ضیاءالدین الخالدي، الهدیة الحمیدیة في اللغة الکردیة، استانبول ١٣١٠ھ [١٨٩٢]» بلآو کراونەتەوە.

هارتمان هەوڵێکی زۆری دا بەشێک لەو دەسنووسە بلآو بکاتەوە، ئەمە و دیوانی مەلای جزیری بە شێوەی لیتوگراف بلآو کردەوە.

غەزەل و قەسیدەکانی مەلای جزیری کارێکی گرنگن لە ئەدەبی کلاسیکیی کوردی، دەمێکە ئەم کارە چاوەڕووانی زانایێکی شارەزایە بۆ ئەوەی لێکۆڵینەوەیێکی لەسەر بنووسێتەوە و بیگۆڕێتە سەر زمانێکی ئەوروپایی، ئەمە سەرچاوەیێکی گرنگە بۆ ناسینی حەقیقەتی ئەدەبی کلاسیکیی کوردی. مەکسیمیلیان بیتنەر یەکێ لە زانا ووشیارەکانی ئەوروپا بوو کە خۆی خەریکی کارێکی یەکجار قورس و سەخت کرد بوو، بەڵآم پڕ سوود و

بە کەڵک. ئەم زانایە توانی گەلێ لە نهێنییەکانی ئایینی یەزیدی ئاشکرا بکا بە هۆی دۆزینەوەی کلیلی ئەو ڕەمزانەی کتێبە پیرۆزەکانی یەزیدییانی پێ نووسرابوونەوە لە کتێبی «مەسحەفی ڕەش» و «کتێبی جیلوە». ئەمە کارێکی گەورە و داهێنانێکی ڕەسەن بوو لە کوردناسی دا.

## کردەوەی زانایانی ئینگلیز و ئەمەریکا

لە سەرەتای سەدەی بیستەمەوە تا دوایی جەنگی یەکەمی گێتی، کوردەواری ناوچەی جموجۆڵییێکی سیاسیی بەهێز بوو، وولاتە ئەوروپاییە پێشکەوتووەکان یارییان تێدا دەکرد بە تایبەتی بەریتانیا و ئەڵەمانیا و ڕووسیا. مۆنۆپۆلی ئینگلیز لە ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست بە ڕێگەییێکی ڕاست و دروستی دەزانی بۆ هیندستان، جگە لەوەی چاویشی بڕیبووە بیرەکانی نەوتی عیراق.

نوێنەرانی دیبلۆماسی و مۆنۆپۆلی ئینگلیز لە زۆرانبازی دا بوون لەگەڵ مۆنۆپۆلی ئەڵەمان لەم ناوچەیەدا، بایەخێکی تەواویان بە هەرێمەکانی خوارووی وولاتی عوسمانلی دەدا. بەم پێیە گەلێ لە کاری ئینگلیزەکان بۆمان ماوەتەوە، وەکو تێبینی گەشت و گەڕان. لەم کەرەستانە دا سەرچاوەییێکی دەوڵەمەند لە ڕووی جوگرافیا و ئەتنۆگرافیا و زمان و ئەدەبی کوردی هاتۆتە ناوەوە.

سۆن خەریکی لێکۆڵینەوە بوو لە زمانی کوردی، ئەمە ئینگلیزێکی بە ناوبانگ بوو لە کوردستانا، کارەکەی «دەستووری زمانی کوردی» بوو. جگە لە کاری زانستیی تر لە بابەت کوردەوە.

دەستووری زمانی کوردی سۆن بۆ مەبەسی پراکتیکی (تطبیقی) دانراوە، دیارە بۆ سوودی ئەو ئینگلیزانەی لە کوردستان کاریان دەکرد، بۆ ئەوەی فێری زمانی کوردی ببن پێی. گرنگیی ئەم کارە بۆ ئێمە لەوە دایە کە باس لە هەر دوو شێوەی کرمانجیی سەروو و کرمانجیی خوارووی زمانی کوردی دەکا. هەموو ئەو زانیاری و لێکدانەوانەی لە دەستوورەکە دا هاتوون دان بەوە دا دەنێن کە خاوەنی زمانی کوردی باش زانیوە.

هەروەها میسیۆنێرێکی ئەمەریکایی ل. و. فۆسووم بایەخێکی تەواوی بە زمانی کوردی داوە و لەم بابەتەوە کتێبی نووسیوە.

ئەو ڕێگە و ئوسلووبەی کە فۆسووم گرتوویەتی بۆ دانانی «دەستووری زمانی کوردی

پراکتیکی» لە دەستووری زمانی ئینگلیزییەوە وەرگیراوە، بەم جۆرە هەموو کاتەکانی فرمانی زمانی کوردی لە ژێر ڕۆشنایی فرمانی ئیگلیزی پێشان دەدا. بەڵگەکان لە شێوەی کرمانجیی سەروو و خوارووی زمانی کوردییەوە وەرگیراوون.

دەستووری جاردینی لەڕووی نرخی زانستییەوە لە ڕیزی دەستوورەکانی پێشوو رادەوەستێ. ئەم دەستوورە تایبەتییە بە شێوەی کرمانجیی سەرووی زمانی کوردی. لە دووایی کتێبەکە فەرهەنگۆکێکی بۆ دانراوە نزیکەی (٤٠٠٠) ووشە دەبێ.

## کردەوەی زانایانی فرەنسی

لە ساڵی ١٩٢٦، پۆل بایداری میسیۆنێری فەرەنسی کۆششی چەند ساڵێکی گەیاندە چاپ لە ژێر ناوی دەستووری زمانی کوردی.

ئەوەی گرنگ بێ لەم لایەنەوە ئەوەیە کە بەڵگەکانی بایدار لە قسەی نەستەق و پەندی پێشینان وەرگیراوون. لە پێشەکییەکەی دا دانەر بە چاوێکی بەرز تەماشای زمانی کوردی دەکا، وەکو زمانێکی گەلێ کۆن، دەڵێ زمانێکی خۆش و نەرمە، زمانێکی شیعری و پڕ ئاوازە، خاسیەتی تایبەتیی ڕستەی کوردی هەموو ژیان دەگرێتەوە، پێوەندییێکی بەهێزی لەگەڵ تەبیعەت و جووانی تەبیعەت دا هەیە، هەروەها دەچێتە ناو ناخی گێتیی ناوەوەی ئادەمزادەوە.

لە چلەکانی سەدەی بیستەم دا نامەخانەی کتێبی کوردی بە کتێبی تازەی بە نرخ دەوڵەمەند بوو. لە پاریس و لە پاشانا لە بێرووت دوو کتێبی ئەدەبی لە لایەن ڕۆژهەڵاتناس و کوردناسی فرەنسی ڕۆژێ لیسکۆوە بڵاو کرایەوە.

کتێبی یەکەم «تێکستی کوردی» لە ساڵی ١٩٤٠ بڵاو کرایەوە، بریتییە لە کۆمەڵێک لە فۆلکلۆری کوردی بە شێوەی کرمانجیی سەروو، ئەمە حیکایەت و پەندی پێشینان و قسەی نەستەق و هەڵهێن و هیتر، لەگەڵ گۆڕینی تێکستەکان بۆ زمانی فەرەنسی.

کتێبی دووەم هەمووی بریتییە لە تێکستێک لە تێکستەکانی «مەم و زین = مەمی ئالان»ی فۆلکلۆری لە ژێر ناوی «مەمی ئالان».

ئەو ترانسکریپتەی ئەو دایناوە بۆ تێکستەکان ڕەنگە لە ترانسکریپتی هەموو زاناو ڕۆژهەلاتناسەکانی پێش خۆی کە بۆ تێکستی کوردیان داناوە سەرکەوتوو تر بێ. لێرەدا دەبێ ئەوە بووتری کە یارمەتییە زانستییەکانی جەلادەت بەدرخان بۆ لیسکۆ ئاشکرایە.

پێویستە ئەوە لەم لایەنەوە بووترێ کە گرنگی تەنیا لەوەدا نییە کە کاری لەم بابەتە بڵاو بکرێتەوە، بەڵکو هەڵبژاردنی بابەتەکە ڕەنگە گرنگتریش بێ. جگە لەوەی لیسکۆ توانیویەتی بە سەر کارەکەی دا زاڵ بێ و لە هەڵە بە دوور بێ.

هەموو چیرۆکە شیعرییەکە لە سەرەتاوە تا دوایی لە سەر یەک قافیەیە (انە)، دەبێ ئەوەش بزانین کە بریتییە لە (٣٦٧٠) دێڕە شیعر. بۆ بەڵگە کوپلەی یەکەم و هەرە دوایی دەنووسینەوە.

کوپلەی یەکەم:

باژارێ مغربێ باژارەکی ئەزیم و پڕ گرانە،
ل سەر هەفت چیانە
ل سەر سێ سەد و شێست و شەش قاپییانە

کوپلەی هەرە دوایی:

چیرۆکا مە چوویە جەکەت و بەرەستانانە
ڕەحمەت ل سەر دێ و باڤێ گوهدارانە

## کردەوەی زانایانی ڕووس و سۆڤیەت

ئەوی ڕاستی بێ ئەوەیە کە لێکۆڵینەوە لە کورد و وڵاتی کوردەواری لە ڕووسیا بەهێز و ڕەسەن و بە پیت و زۆر و پڕ بەرهەم بوو، ئەمە لەگەڵ بەرز بوونەوەی وەزعی ئابووری و سیاسی ناوچە کوردییەکان لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست پەیدا بوو. دیارە بنج و بناوانی ئەم لێکۆڵینەوەیە بۆ مەبەسی سیاسی بوو، بەڵام لە زمانی کوردییەوە دەستی پێ کرد. پێش هەموو شتێکیش زمانی کوردی سەرنجی زاناکانی ڕاکێشا. کارێکی زۆر بەجێیە ئەگەر بە تەواوی لەگەڵ بیروڕای زانا و کوردناسی بە ناوبانگ مینۆرسکی بین کە لە ساڵی ١٩١٥دا. ووتوویەتی: «... پێویستە بە شانازییەوە بڵێین کە لێکۆڵینەوەی زانستی لە بابەت کوردەوە بەشی هەرە زۆری لە ڕووسیا کراوە».

یەکەمین کار لەم لایەنەوە لە ڕووسیا لە بابەت مەسەلەی ئەدەب و زمانی کوردییەوە، پەیدا بوونی «فەرهەنگی بەراووردی نێوان هەموو زمان و شێوەکان»ی پ. س. پالاس بوو لە ساڵی ١٧٨٧، لەو فەرهەنگە دا (٢٧٣) ووشەی کوردی هاتووە.

لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەم، ووتار و لێکۆڵینەوە لە بابەت کوردەوە پەیدا بوو، ئەم

ووتارانە گشتی بوون و ئامانجی نووسەرەکانیان ئەوە بوو کە کورد بە کۆمەڵ و خەڵکی ئەو سەردەمە بناسێنن، لەبەر ئەوەبوو ووتارەکانی بەرایی سەر پێیی و بە گیانێکی زانستیيانە نەنووسرا بوونەوە.

لە پاشانا بۆ مەبەسی لێکۆڵینەوە لە خوو و ڕەووشتی کورد و وولاتەکەی بە شێوەییێکی قوولّ و ڕێک و پێک، دەوڵەتی رووسیا زانا و ڕۆژهەلاتناسی رووسی دەنارده ناوچەکانی کوردستان و هەرێمەکانی تری ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست. نێرراوە بەراییيەکان هی وەکو ف. دیتیل. و پ. لێرخ و هیتر بوون. لە کارەکانیان دا زیاتر بایەخیان بە زمان و ئەتنۆگرافیای ئەو ناوچانە داوە کە لەسەر ڕێگایان دا بوون.

## ڕۆشنبیری ئەرمەنی ئابۆڤیان

لێکۆڵینەوەی زانستی لە بابەت کوردەوە بە ڕاستی لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەم دەست پێ دەکا لە رووسیا. ئەمە پێوەندیيێکی بەهێزی بە ڕۆشنبیری ئەرمەنیی بە ناوبانگ خاچاتۆر ئابۆڤیانەوە هەیە.

ئابۆڤیان خاوەنی دوو ووتاری یەکجار گرنگ و بە نرخی زانستیيە لەسەر کورد. ووتاری «کورد» بۆ یەکەمین جار لە ڕۆژنامەی «قەفقاس» لەساڵی ١٨٤٨ بلاّو کرایەوە.

ووتاری دووەمی «یەزیدی» دیسانەوە هەر لەو ڕۆژنامەیەدا بلاّو کرایەوە.

لەم دوو ووتارەدا تێبینی و ئەنجامی زانستی دەست دەکەوێ لە لایەن نەژادی کورد و ئەدەب و فۆلکلۆری دەوڵەمەندی کورد، هەروەها زمانی کوردی و گەلێ مەسەلەی تریش.

(٣) لە بابەت کارەکانی ئابۆڤیان دەربارەی کوردەوە کوردۆییڤ ووتارێکی بلاّو کردۆتەوە بە ناوی «ئابۆڤیان وەک کوردناس». خاوەن ووتار بە تایبەتی لە بیروڕا و لێکۆڵینەوەکانی ئابۆڤیان دەدوێ لە بابەت کوردەوە. ئەم ووتارە بە کوردی لە ڕۆژنامەی «کوردستان»ی ئۆرگانی حیزبی دیمۆکراتی کوردستانی ئێران بلاّو کراوەتەوە، زانین و زانیاریی ئابۆڤیان لە خوو و ڕەووشت و ئەتنۆگرافیای کورد لە ئەنجامی ئەوەوە بوو، ماوەییێکی زۆر لە ناو کوردە هاوسێکانی ژیا بوو لە گوندی (کەناکیر)ی نزیک شاری یەریڤان. لە پاشانا بە شێوەییێکی قوولّتر ئابۆڤیان خەریکی لێکۆڵینەوە بوو لە کورد بە تایبەتی لە ئەنجامی گەشتەکانی دا لەگەڵ زانا و ڕۆژهەلاتناس و گەڕۆکە ئەورووپاییيەکانی وەکو ئاییش و ڤاگنەر و بودینشتیدت و پاروت لە ناوچە شاخاویيەکانی ئارارات. تەنیا

خۆی ئاشنایەتی لەگەڵ کوردەکان دا پەیدا نەدەکرد، بەڵکو یاریدەیێکی یەکجار زۆر و بە کەڵکی پێشکەش بە زانا ئەوروپاییەکان دەکرد لە لێکۆڵینەوەکانیان دا، بەم جۆرە هەموو تێبینی و بیر و ڕاکانی خۆی بەرامبەر کورد و بە تایبەتی یەزیدییەکان پێشکەش بە ڤاگنەر کرد.

زانایێکی تری ئەڵەمان هاکسهاوزن دیسانەوە کەڵکی لە تێبینی و بیر و ڕاکانی ئابۆڤیان وەرگرتووە بە شێوەیێکی فراوان. بودینشتیدت لە کۆتایی کتێبەکەی کۆمەڵێک تێکستی ئەدەبی کوردی بڵاو کردەوە، ئەم تێکستانە لە لایەن ئابۆڤیانەوە بۆی نێررا بوو لە سەر داوای خۆی. هەروەها بە یارمەتیی ئابۆڤیان پرۆفیسۆر پارۆت توانی کارە گرنگەکەی لە بابەت شاخی ئاراراتەوە بنووسێتەوە.

گەلێ لە بیر و ڕاکان ئابۆڤیان لە بابەت کوردەوە تا ئێستا گرنگی و ڕاستیی خۆیان پاراستووە. کارێکی زۆر بەجێیە ئەگەر بڵێین ئابۆڤیان بۆ یەکەمین جار تەماشای کورد دەکا وەکو نەتەوەیێکی سەربەخۆ و دەورێکی باڵای بووە لە مێژووی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست. بیروباوەڕی لە بابەت زمان و ئەدەب و فۆلکلۆری کوردەوە کەرەستە و سەرچاوەیێکی یەکجار گرنگە. لەلایەن فۆلکلۆرەوە ئابۆڤیان نرخی ئەو فۆلکلۆرە دەردەخا بۆ کۆمەڵی کورد. لە بابەت خۆشەویستی و شەوقی کورد بەرامبەر بە شاخ و کێو و شیو و دەشت و سوواری سەرکەش و ئەسپی لووت بەرز و کچی جووانی چاوکاڵ... ئابۆڤیان دەڵێ: «شیعری میللیی کوردی هەنگاوی یەکجار گەورەی هاوێشتووە، وە گەیشتۆتە پلەی کامڵ بوون، هەموو کوردێک، هەتا هەموو کچە کوردێکیش بە خۆرسکی گیانی شاعیری هەیە».

ئابۆڤیان سەرنجی زاناکانی ئەوروپا ڕادەکێشێ کە لە ئەدەبی میللی کوردی بکۆڵنەوە، چونکە زۆر دەوڵەمەندە. ئەمە دەبێتە هۆی ئەوەی بە چاکی و بە ڕاستی لە کورد بگەن ئەوانەی «سووار چاکی ڕۆژهەڵات»ن.

## کردەوەکانی لێرخ

زانای ڕووس پیوتر لێرخ شوێنێکی دیاری هەیە لە مێژووی کوردناسی لە ڕووسیا. کارەکانی لە بابەت کوردەوە ئەنجامی کارێکی قووڵ لە ماوەیێکی درێژ کەوتە ناوەوە. سوودی لە کەرەستە و سەرچاوەیێکی ئەوروپایی و ڕووس زۆر وەرگرتووە. سەرچاوەی ئەو

تەنیا کاری نووسراوو تۆمار کراو نەبووە، بەڵکو زیاتر ژیانی لە ناو کوردەکان خۆیان دا بەرهەمەکانی بەهێزتر کردووە، واتە بە خوێندن و بە بینین لە مێژووی ڕۆشنبیریی کوردی کۆڵیوەتەوە.

لە ساڵی ١٨٥٦ لە ڕۆژنامەی «هەنگی باکووری» ووتارە گرنگەکەی میکیشین بە ناوی «کورد لە ناوچەی سمۆلێنسکی» بڵاو کرایەوە، ئەمە زانیارییێک بوو لە بارەی کوردە بە دیل گیراوەکانی جەنگی قرم. ئەکادیمیەی زانستی لە پیترسبورگ داوای لە لێرخ کرد کە پێویستە پێوەندی لەگەڵ ئەم کوردانە پەیدا بکاو لە زمانەکەیان بکۆڵێتەوە. لێرخ چەند مانگێک لە شاری روسلاڤل لە ناوچەی سمۆلێنسک لە ناو کوردە بە دیل گیراوەکان دا ژیا. ئەم کوردانە لە بنج دا لە ناوچە جیاوازەکانی ووڵاتی عوسمانلییەوە گیرا بوون، وەکو: ماردین، جزیرە، دەرسیم، مووش، دیاربەکر، مەلاتیە، ئەرزەڕۆم و هیتر... وەکو لە ناوی شوێنەکان دەردەکەوێ ئەم دیلانە نوێنەری هەموو ناوچەکانی سەرووی کوردستان بوون، بەم پێیە ئەم کوردانە گەلێ لە شێوە جیاوازەکانی زمانی کوردییان دەزانی.

لێرخ خاوەنی سێ بەرگ کتێبی بە نرخە لە بابەت کوردەوە «لێکۆڵینەوە لە کوردی ئێران و باپیریان خالیدییەکانی سەروو».

ئەم کتێبە سێ بەرگییە بریتییە لە تێبینی لە بابەت کولتووری کوردەوە، هەروەها ئەو تێکستە کوردییانەشی تۆمار کردووە ئەوەی خۆی کۆی کردوونەتەوە و بەراوورد و تێبینیش دەردەخا لە بابەت شێوەکانی زمانی کوردییەوە. لێرخ بیروڕای ڕاستی هەبوو لە بابەت زمانی کوردییەوە، بەم جۆرە بەلای ئێمەوە بیروڕای لێرخ زۆر بە نرخ بوو، چونکە بۆ یەکەمین جار ئەوەی دەربڕیوە کە شێوەی سلێمانی سەربەخۆ و تەنیا نییە، بەڵکو دەچێتە ناو شێوەی کرمانجی.

ئەم ڕایە بەلای گەلێ لە زانا و ڕۆژهەڵاتناسی و کوردناسانەوە شتێکی ڕاستە و لە دواییدا لە لایەن زانای کورد تۆفیق وەهبییەوە ساغ کراوەتەوە.

لەگەڵ ئەو تێکستانەی کە لێرخ لە زمانی کورد وەری گرتبوون، هەندێ چیرۆکی زمانە جیاوازەکانی ئەوروپاشی تەرجەمەی کوردی کردووە. نرخی ئەم تێکستە گۆڕاوانە لەوە دایە کە لێرخ ویستوویەتی پلە و گۆڕانی زمانی کوردی دەربخا، دەوڵەمەندی و فراوانی ئەم زمانە بخاتە ڕوو، ئەمە بووەتە هۆی ئەوەی کە بتوانرێ هەموو بەرهەمێکی ئەدەبی

ئەوروپا تەرجەمەی زمانی کوردی بکرێ.

تێکستی کوردی لە کتێبی لێرخ دا وێنەیێکی ڕاست و ڕەنگ دانەوەیێکی زمانی کوردی‌یە بە هەموو شێوەکانی‌یەوە. بەم جۆرە لە کتێبەکە دا حەوت چیرۆک بە شێوەی زازای زمانی کوردی تۆمار کراوە؟ وە بە شێوەی کرمانجی‌ی خوواروو پارچەیێک بە پەخشان لە گۆڕینی گوڵستانی شێخی سەعدی تۆمار کراوە.

هەندێ بەرهەمی شیعری شاعیرە کلاسیکی‌یەکانی گۆران بە شێوەی گۆرانی زمانی کوردی تۆمار کراوە.

دەوری لێرخ لە گۆڕرانی کوردناسی‌ی ڕووس دا ڕوون و ئاشکرایە لە هەموو کارەکانی لە بابەت کوردەوە. بە هۆی هەوڵ و کۆششی بەهێزی لێرخ فەرهەنگی کوردی - فرەنسی و فرەنسی - کوردی بڵاو کرایەوە، هەروەها کۆمەڵێک تێبینی و چیرۆکەکانی أ. ژابا. لە بابەت نرخی دەوری لێرخ لە کوردناسی‌ی ڕووس دا کوردۆیێڤ دەڵێ: «سوپاس بۆ کارەکانی زانایانی وەکو شارموا، ڤیلیامینوڤ - زیرنوڤ، ژابا، یوستی، سۆتسین و هی‌تر، وە بە تایبەتی کارەکانی لێرخ، لێکۆڵینەوە لە کورد وەکو بەشێکی گرنگی ئێرانناسی لە سەدەی نۆزدەم دا بە سەربەخۆیی خۆی پیشان داو دەستی کرد بە گۆڕران و پێشکەوتن».

بایەخ دان بە کۆششی زانستی لێرخ لە کوردناسی دا نابێ لە کۆششی زانا ڕووسەکانی پێش لێرخ و دەوروبەری ئەو جیا بکرێتەوە. کاری ئەمانە لەگەڵ کارەکانی لێرخ وێنەیێکی ڕوونی ڕاستەقینەی گۆڕرانی زمان و ئەدەبی کوردی و مێژووی کولتووری کۆنی ئەو نەتەوەیە دەدا بە دەستەوە.

## کردەوەی دوو قونسوڵی ڕووس

لێکۆڵینەوە لە یادگارە ئەدەبی‌یەکانی کورد مایەی کاری دوو قونسوڵی ڕووس بوو، یەکەمیان أ. ژابا لە ئەرزەڕۆم و دووەمیان أ. خۆدزکۆ لە پاریس.

ووتاری خۆدزکۆ لە بابەت مێژوو و هەندێ لە خاسیەتەکانی شێوەی سلێمانی بۆ ئێمە بایەخێک و گرنگی‌یێکی تایبەتی‌ی هەیە.

خۆدزکۆ وەکو مینۆرسکی ئەوە دەردەخا ئارەزووی لێکۆڵینەوەی گەلێ زۆر بووە. بەهۆی ئەوەی ناسیاوی لەگەڵ ئەحمەد پاشای بابان لە پاریس پەیدا کردووە توانیوبەتی لە شێوەی سلێمانی بکۆڵێتەوە. لەو سەردەمەی کە خۆدزکۆ خەریکی ئەم شێوەیە بوو، هەر لەو کاتە دا قونسوڵی ڕووس لە ئەرزەڕۆم أ. ژابا بایەخی بە شێوەی کرمانجی‌ی سەروو

دەدا. هەوڵێکی زۆری دا بۆ ساغ کردنەوەی گەلێ لایەنی شاراوەی ئەم شێوەیە. ژابا لە ئەرزەڕۆم هەڤدە ساڵ ژیا (١٨٤٨ – ١٨٦٦) لەوێ خەریکی لێکۆڵینەوە بوو لە زمانی کوردی.

بۆ ئەم کارە کۆمەڵێک لە خوێندەوار و ڕۆشنبیرانی ئەو سەردەمەی ئەرزەڕۆم یاریدەیان دەدا، پێوەندی‌یێکی بەهێزی لەگەڵ ئەم خوێندەوارە کوردانەدا هەبوو. بە هۆی ئەوانەوە بۆ یەکەمین جار ژابا توانی زانیاری لە بابەت شاعیرە کۆنەکانی کوردەوە دیار بکا. ژابا یەکەمین زانایێکی ئەوروپایی بوو کە بایەخێکی تەواوی بە ژیان و بەرهەمی شاعیرانی کلاسیکی کورد داوە. ئەو زانیاری‌یانەی ژابا خستوویەتی‌یە ڕوو بۆ ئێمە سەرچاوەی یەکەمە، بەڵام پێویستە هوشیارانە ئەو زانیاری‌یانە بەکار بهێنرێن و بە چاوێکی ڕەخنەوە تەماشا بکرێن، ڕەنگە ژابا بە ووردی سەرنجی ئەو زانیاری‌یانەی نەدابێ بە تایبەتی ئەوانەی پێوەندی‌یان بە سەردەمی ژیان و مردنی شاعیرەکانەوە هەیە.

لێرەدا پێویستە هەندێ بەڵگەی وا بهێنینەوە کە هەڵەی زۆر ئاشکراو زەقی تێدایە. بە تایبەتی ئەوانەی پێوەندی‌یان بە مێژووی لە دایک بوون و مردنی شاعیرەکانەوە هەیە. بەم جۆرە لە نووسینەکانیدا دەڵێ:

شاعیری کورد مەلای جزیری لە (٥٤٠هـ) لە دایک بووە و لە ساڵی (٥٥٦هـ) کۆچی دووایی کردووە. لەمە ئەوە دەردەکەوێ کە مەلای جزیری (١٦) ساڵ ژیابێ، هەروەها دەڵێ شاعیری کورد ئیسماعیل لە ساڵی (١٠٦٥هـ) لە دایک بووە و قوتابی‌ی ئەحمەدی خانی بووە کە لە ساڵی (١٠٦٣هـ) کۆچی دووایی کردووە، واتە لە پاش مردنی مامۆستای بە دوو ساڵ لە دایک بووە!

ژابا تەنیا تێکستی فۆلکلۆری و ئەدەبی لە زمانی کوردەکانی ئەو ناوە وەرنەگرتووە، بەڵکو گێڕانەوە و بیروڕای کوردەکان خۆشیانی وەرگرتووە لە بابەت هەندێ مەسەلەی مێژوویی‌یەوە. ئەمە بریتی‌یە لە (٤٠) حیکایەت و نرخێکی مێژوویی و زانستی گەورەی هەیە.

لەسەر بنج و بناوانی ئەو کەرەستانەی کۆی کردبووەوە، ژابا فەرهەنگێکی کوردی - فرەنسی - کوردی ئامادە کرد.

فەرهەنگی یەکەم لە پاش مردنی خاوەنەکەی لەلایەن فیردیناند یووستی‌یەوە لە ساڵی ١٨٧٩ بلاو کرایەوە. فەرهەنگی دووەم و هەموو کارەکانی تری ژابا لەلایەن نەوەکەیەوە

پێشکەش بە مینۆرسکی کرابوو لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا لە ساڵی ١٩١٣، ئیتر مینۆرسکی خەریکی ئەوەبوو کارەکان بڵاو بکاتەوە، بەڵام جەنگی یەکەمی گێتی ڕێگەی هێنانەدی ئەم ئامانجەی بڕی و بەم جۆرە ئەم کەرەستانە بڵاو نەکرانەوە.

ناوی ئاوگوست ژابا (ئەلێکساندەر ژابا) بە ئاوی زێڕ لە مێژووی لێکۆڵینەوە لە کورد دەنوسرێتەوە، ناوی هەمیشەیی‌یە لە مێژووی کولتووری نەتەوەی کورد. بە هۆی کۆشش و هەوڵی ژاباوە ژمارەیێکی زۆر لە دەسنووسی کوردی بە نرخ لە مێژوو و ئەدەب و ئەتنۆگرافیا و زمانی کوردی پارێزرا. لەو سەردەمەی کە ژابا قونسوڵی ڕووس بوو لە ئەرزەڕۆم بە هۆی کوردە خوێندەوارەکانی ئەم ناوچەیە (٧٤) دەسنووسی هەمەڕەنگی پاراست، ئەمانە بە شێوە جیاوازەکانی زمانی کوردی تۆمار کرا بوون، جگە لەوەی ناوەڕۆکیان هەموو ژیانی خوێندەواریی کوردی گرتبووەوە.

بەشی هەرە زۆری ئەم دەسنووسانە لە سەر داوای ژابا ئامادە کراوون. لە ناو ئەم کۆمەڵە دەسنووسانەدا شیعری شاعیرانی کلاسیکیی سەدەکانی ناوەڕاستی کورد دەبینرێ، وەکو فەقێ تەیران، چیرۆکی شیعری «مەم و زین»ی ئەحمەدی خانیی بە ناوبانگ لەگەڵ فەرهەنگی «نۆبار» و هی‌تر.

خزمەتی هەرە گەورەی ژابا بۆ زانستی لەوە دایە کە میراتێکی بە بەهای لە پاش خۆی بەجێ هێشتووە، ئەمە بریتی‌یە لە کەرەستە و سەرچاوەیێکی بە نرخی کوردی و دەبێتە خۆراکێکی گیانی بۆ هەموو ئەو کوردناسانەی کە لە دووای ئەودا هاتوون.

## بەرهەمی زانایانی بێگانە لە ڕووسیا

مەسەلەی ئەدەبی کوردی و زمانی کوردی لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەم دا لەلایەن دوو زانای ترەوە لە ڕووسیا بایەخی پێ دراوە ئەمانە سۆتسین و پریم بوون.

ئەو کەرەستانەی کە لە زمانی کورد و ئاسووری ناوچەی توور عابدین و بۆتان تۆماریان کرد بوو، نرخێکی تایبەتی‌یان هەیە لە مێژووی فۆلکلۆری کوردی دا.

لەگەڵ تێکستی گۆرانیی دڵداری لە کتێبەکانی سۆتسین و پریم دا گۆرانی قارەمانیی لە بابەت «دمدم» و «یەزدانی شێر» و «شەڕی سیسەبان» و هی‌تر بڵاو کراوەتەوە. ئەمە هەمووی بەڵگەی ڕابردووی قارەمانیی نەتەوەی کوردە لە ڕۆژگارانی مێژووی دا. سۆتسین لە لێکۆڵینەوەکانی دا لە بابەت زمانی کوردی‌یەوە ڕێگەیێکی زانستی‌یانەی گرتووە و

ئەنجامی باشیشی بە دەستەوە داوە، بەڵام هەندێ جار بڕیار لەسەر بڕێک مەسەلەی زمانی کوردی دەدا لە ژێر ڕۆشنایی دەستووری فارسی.

## کردەوەکانی ییێگیازارۆڤ

لە دووا ساڵانی سەدەی نۆزدەم، لە ژمارە ١٣ی بڵاوکراوەی کۆمەڵەی جوگرافی ئیمپیراتۆریەتی ڕووسیا (لقی قەفقاس) ووتارێکی بە نرخی ییێگیازارۆڤ بڵاوکرایەوە لە بابەت خوو و ڕەووشت و ژیانی کۆمەڵایەتی و ئابووریی کوردەکانی ناوچەی یەریڤان.

ییێگیازارۆڤ لە ووتارەکەی دا بایەخێکی زۆری بە یەزیدییەکان داوە، بە تایبەتی ئایین و ئەو کردەوانەی پێوەندییان بە ئایینەوە هەیە. ئەو بەڵگە ئەتنۆگرافییانەی کە لەلایەن ییێگیازارۆڤەوە هێنراونەتەوە گرنگ و سەرنج ڕاکێشەرن. ئەمە لە ئەنجامی لێکۆڵینەوە و کۆششێکی دوور و درێژی ئەم زانایە بوو لە بابەت کوردەوە. هەروەها وەک بەڵگە بۆ هەندێ لە بیر و ڕاکانی لە بارەی زمانی کوردی و فۆلکلۆری کوردییەوە گەلێ تێکستی بە نرخ دەهێنێتەوە.

## کردەوەکانی مینۆرسکی

لێکۆڵینەوە لە کورد لە سەرەتای سەدەی بیستەم لە ڕووسیا بەناوی زانای ڕووس مینۆرسکییەوە بەستراوە. ڕۆژهەڵاتناسی گەورە و بە ناوبانگ، کارێکی گەورەی لە لێکۆڵینەوەی ئێراناسی و تورکناسی و عەرەبناسی و کولتووری نەتەوەکانی قەفقاس کردووە، تا ئێستا بایەخێکی تەواوی داوەتە مەسەلەی کورد و لێکۆڵینەوە لە مێژووی کولتووری کورد و بووە بە سووار چاکێکی مەیدانی کوردناسی. مینۆرسکی دەستی داوەتە هەموو بەشەکانی کوردناسی وەکو زانستییێک و کاری بە نرخی لە پاش بەجێ ماوە. بایەخی بە جوگرافیا و ئەتنۆگرافیا و زمان و ئەدەب و مێژووی کۆن و خەباتی نەتەوایەتیی تازە و ئایین و ژیانی کۆمەڵایەتی و ئابووری داوە.

یەکەمین کاری مینۆرسکی لەم لایەنەوە بریتی بوو لە تێبینیی گەشتەکانی لەو ماوەیەی کە خەریکی وەزیفەی دیبلۆماسی بوو لە بالیۆزخانەی ڕووسیا لە ئێران. لە پێش جەنگی یەکەمی گێتی مینۆرسکی ڕاپۆرت و تێبینیی بڵاوکردەوە لە بابەت کوردەکانی ئێران لە ژێر ناوی «گەشتێک بۆ مەراغە» و «گەشتێک بۆ میرنشینی ماکۆ لە تشرینی یەکەمی ١٩٠٥» و هیتر.

له پاشانا مینۆرسکی خۆی خەریک کرد بە لێکۆڵینەوە لە ئایین، بە تایبەتی بایەخێکی تەواوی بە مەزهەبەکانی داو زانستی‌یانە بۆیان دەچوو.

نویشکی کارە زانستی‌یەکانی مینۆرسکی لە بارەی کوردەوە خرایە دوو توێی کتێبە بە ناوبانگەکەی «کورد».

لەم کتێبەدا هەوڵی ئەوەی داوە بە کورتی ئەدگارە گشتی‌یەکانی مێژووی کولتووری کورد و خوو و ڕەووشتی نەتەوە لە کوردستان پیشان بدا. یەکەمین خاسیەتی ئەم کارەی مینۆرسکی ئەوەیە کە مەوزووعی و زانستی‌یە. هەر لەو کاتەش دا زۆر ئیجابی‌یە و بە گیانێکی دۆستایەتی و خۆشەویستنی نەتەوەی کورد نووسیویەتی‌یەوە. ئەم کتێبە لە دووا ڕۆژ دا بوو بە بنج و بناوانی هەموو بیروڕاکانی مینۆرسکی لە بارەی کوردەوە، بە تایبەتی ووتاری کورد و کوردستانی ئەنسیکلۆپیدیای ئیسلام.

لە کتێبی «کورد» لە فەسلی «زمان و ئەدەب و نووسین» دا، مینۆرسکی وەرامی ئەو بیروڕایە دەداتەوە کە گۆیا زمانی کوردی «فارسی‌یێکی تێک شکاو و دەسکاری کراوە»، دەڵێ: «... بێ گومان زمانێکی سەربەخۆیەو دەستووری فۆنێتیکی تایبەتی‌ی خۆی هەیە، هەروەها دەستووری زمانی تایبەتی خۆی هەیە، پێوەندی‌ی زمانی کوردی لەگەڵ فارسی وەکو پێوەندی‌ی نێوان عەرەبی و رووسی وایە، یا پێوەندی‌ی زمانی لاتینی‌ی شاخاوی‌یەکانی سویسرە لەگەڵ زمانی ئیتالی».

مینۆرسکی بە چاوێکی بەرز تەماشای ئەدەبی کوردی دەکا. بە ڕاستی دەگاتە هەندێ تێبینی ئەویش ئەوەیە نەبوونی لێکۆڵینەوە لە ئەدەبی کوردی بۆتە هۆی ئەوەی نرخی تەواوی دیاری نەکرێ، هەروەها دەبێتە هۆی ئەوەی دەوری ئەدەبی کوردی لە ئەدەبیاتی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست ئاشکرا و ڕوون نەبێ، لەم لایەنەوە، دەڵێ: «... هۆی دەرنەکەوتنی نرخی ڕاستەقینەی ئەوەیە کە بەرهەمی لە ژێر دەست دا نی‌یە، هەروەها لێکۆڵینەوەیێکی تەواویش لە زمانی کوردی دا نەکراوە»

پێویستە ئەمەش بووترێ، کە ئەم ووتەیەی مینۆرسکی دەشێ ئەمڕۆ دووبارە بکرێتەوە: لە پاش لێکۆڵینەوەی نیو سەدەی ئەدەبی کوردی هێشتا هەنگاوی فراوانی زانستی لەم رووەوە نەهاوێشتراوە.

لەوانەیە هەر لەبەر ئەم هۆیە بوو بێ کە زانستگای پیترسبورگ بە پێویستی زانی داوا لە زانای لاوی هوشیار ی. أ. ئۆربێلی بکا کە بە تایبەتی خۆی ئامادە بکا بۆ ووتنەوەی

زمانی كوردی له زانستگای پیترسبورگ، مینۆرسكی هیوایێكی زۆری بەم كارە هەبوو: «... كارەكانی ئۆربێلی بنج و بناوانی سەرۆكایەتی ڕووس پتەوتر دەكا له مەیدانی لێكۆڵینەوەی كورد».

## كردەوەكانی ئۆربێلی

ئۆربێلی یەكێك بوو له زانا و پسپۆڕەكانی لێكۆڵینەوە له نەتەوەكانی قەفقاس، له كوردناسی دا بەرهەمی زۆر و بە كەڵكی هێنایە كایەوە، له هەر دوو قۆناغی پێش شۆرش و پاش شۆرش زانایێكی بەكار بوو له لێكۆڵینەوە و ڕۆژهەڵاتناسی دا.

له پێش شۆرش، له ساڵانی ١٩١١ - ١٩١٢ ئۆربێلی له ناوچەی مۆكس له شێوەی زمانی كوردەكانی ئەو ناوچەیەی دەكۆڵییەوە، بۆ ئەم مەبەسە فەرهەنگێكی كوردی - ڕووسی فراوانی دانا.

فەرهەنگی كوردی - ڕووسیی ئۆربێلی كە له ساڵی ١٩١٤ دا داینا بوو ئامادە كرا بوو بۆ بلاوكردنەوە تائێستا ڕووناكی نەدی، وە هۆی بلاو نەكرانەوەشی تا ئێستاكە نەزانراوە.

نرخی زانستیی ئەم فەرهەنگە لەوەدایە كە بۆ تۆمار كردنی ووشە و ڕستەی كوردی تەنیا له زاری ئەو ئەرمەنییانە وەرنەگیراوە كە كوردی باش دەزانن و یاخود زمانی كوردی مادەرزادیانە، بەڵكو لەزاری كوردیش خۆی وەرگیراوە. له پاشانا وەكو ئۆربێلی خۆی دەڵێ بەشی زۆری ئەم ووشەو ڕستانە له زمانی عەلی ئاغای یووسف ئاغا وەرگیراوون. بۆ زێدە دڵنیا بوون له ڕاستی و دروستی ووشەكان و نەبوونی هەڵە له ڕووی دەستووری زمانەوە، ئۆربێلی بۆ جاری دووەم له شاری وان لەگەڵ عەلی ئاغا خۆی جارێكی تر بە سەر هەموو كەرەستە كۆكراوەكانی چۆتەوە.

دەوری گەورەی ئۆربێلی له پێش خستنی كوردناسی دیار و ئاشكرا بوو، كاری له گۆڕرانی كولتووری كورد كرد بوو، بە تایبەتی كۆششی بێ ووچانی بۆ دانانی ئەلفو بێی تازە بۆ نووسینی كوردی. له ساڵی ١٩١٣ له سەر داوای كۆمەڵێكی ڕۆشنبیری كوردی له شاری (خۆی)یەوە عەبدولڕەزاق بەدرخان بەرەو پیترسبورگ كەوتە ڕێ. ئامانجی گرنگی بەدرخان ئەوە بوو كە ئەلفو بێی كوردی بە هۆی یارمەتیی كوردناسەكانی پیترسبورگ دابنێ.

هەندێ كەس له سەر ئەو باوەڕەن كە ئامانجی ئەم گەشتەی عەبدولڕەزاق بەدرخان

سیاسی بووه.

لەسەر داوای ئەکادیمیەی زانستی‌ی پیتەرسبورگ ئۆربێلی دەستی کرد بە بیرکردنەوە بۆ هێنانەدی و دانانی ئەلفو بێ‌یێکی تازە بۆ زمانی کوردی. بەڵام تا ئێستا بۆ ئێمە ئاشکرا نی‌یە ئەنجامی گەشتەکەی عەبدولڕەزاق بەدرخان بۆ ئەم مەبەسە بەچی گەیشت. بەهۆی گەلێ نووسراوی پارێزراو، پرۆژەی ئەلفو بێ‌ی کوردی ئەوەی ئۆربێلی داینا بوو لە بیستەکان دا بوو بە بنج و بناوان بۆ دانانی ئەلفو بێ بۆ کوردەکانی ڕووسیا (یەکێتی‌ی سۆڤیەتی ئەو سەردەمە) لە سەر بناغەی ئەلفو بێ‌ی لاتینی.

بۆ ئامادە کردنی کادری زانستی‌ی کوردی لە قوتابخانە و ئامۆژگا بەرزەکانی سانت پیترسبورگ، لە کۆمارەکانی قەفقاسەوە لە ساڵی ١٩٢٨ کۆمەڵێک لاوی کورد ژمارەیان (٥٠) کەس بوو، ڕوویان کردە شاری سانت پیتربورگ. بۆ دامەزراندن و پەروەردە کردنی ئەم کۆمەڵە لاوە ئۆربێلی دەورێکی بالای هەبوو. هەر بە یارمەتی‌ی ئۆربێلی، لە پاش کۆتایی هێنان بە زانستگا، کوردناسی دووا ڕۆژ ق. ک. کوردۆییڤ لە سانت پیتربورگ مایەوە بۆ تەواو کردنی خوێندنی بەرزی لەمەیدانی لێکۆڵینەوە لە کورد دا، جگە لەمە هەر لەو کاتەش دا بوو کە ئۆربێلی لەگەڵ کوردۆییڤ و دوو کوردناسی تریشی ئامادە کرد، ئەمانە ئاڤالیانی و تسووکەرمان بوون.

لە ساڵی ١٩٢٦، بە یارمەتی‌ی ئۆربێلی کۆمەڵێک تێکستی گرنگی زانای نەمساوی هۆگۆ ماکاش لە چاپ درا.

لە دووا ساڵانی ژیانی بایەخێکی یەکجار زۆری بە ئامادە کردنی کادری زانستی کوردی دەدا، کۆمەڵێک قوتابی‌ی خوێندنی بەرزی پێ گەیاند.

بۆ ئامانجی پێش خستنی کوردناسی لە وڵاتی ڕووسیا لە ساڵی ١٩٥٨ بەشی کوردی لە ئامۆژگای ڕۆژهەڵاتناسی‌ی ئەکادیمیەی زانستی سۆڤیەت لە سانت پیتربورگ کردەوە. ئەم کارە ناوەرۆکێکی زانستی و سیاسی‌ی پڕ مانای هەبوو. ئەمە یەکەمین بەشی سەربەخۆی زانستی بوو لە گێتی‌دا کە لە هەموو زانستی‌یەکانی کوردناسی دەکۆڵێتەوە.

سەرۆکی بەشی کوردی لە پێشانا ئۆربێلی خۆی بوو، لە پاشانا کوردۆییڤ دانرا. ئینجا پسپۆرەکانیش بریتی بوون لە کوردۆییڤ و تسووکەرمان لە زمانەوانی، وە مارگریت ڕوودێنکۆ لە ئەدەب و هی تریش.

## بابەت و ناوەرۆکی سەرچاوە ئەوروپاییەکان

سەرچاوە لە بابەت کوردەوە بە زمانانی ئەوروپا بریتییە لە بەرهەمی رۆژهەلاتناسی و کوردناسەکان لە کتێب، یا ووتار و باسی ناو کۆوار و رۆژنامەکان، لە کات و سەردەمی جیا و بە زمانە پێشکەوتووەکانی نەتەوەکانی ئەوروپا هاتۆتە کایەوە و بلاو کراوەتەوە. لە سەردەمی ئێستا بە هۆی زۆری ئەم سەرچاوە و کەرەستانە نەوەکو بۆ کورد بەڵکو بۆ هەموو نەتەوەییێک و هەموو لقێکی زانستی بەبێ بیبلیۆگرافیا لە تووانای هیچ کەسێک دا نییە بتووانێ دەست بەسەر هەموو سەرچاوەییێک بۆ مەبەسێکی دیاری کراو دا بگرێ. لەبەر ئەوەیە زانایان و دەسگا زانستییەکان کادرێکی باش بۆ ئەم مەبەسە رادەگرن و بایەخێکی زۆری پێ دەدەن. جا ئێمە لەم ماوەیەدا بە هیچ جۆر لە توانامان دا نییە باس لە هەموو ئەو سەرچاوانە بکەین، چونکە تەنیا ناو هێنانیان چەند بەرگ کتێبی گەرەکە لەبەر ئەوەیە باس لە هەندێ کاری گرنگی ئەوروپاییەکان دەکەین.

زانیاری لە بابەت کوردەوە لە ئەوروپا بە سێ شێوە خۆی دەنوێنێ:

١- زانیاریی گشتی لە بابەت کوردەوە کە لە کتێب یا ووتار دا بلاو دەکرێتەوە، لە بلاو کراوەییێک دا کە لە راستی دا بۆ کورد دانەنراوە، باسەکە لە بابەت شتێکی ترەوەیە، بەلام بە هۆی پێوەندییێک، دوور یا نزیک، باسی کورد دێتە ناوەوە.

٢- باسی کورد وەکو لقێک لە لێکۆلینەوە و دیراساتی ئێرانی، لە رۆژهەلاتناسیی ئەوروپای کۆن، کوردناسی بەشێکی سەربەخۆ نەبوو، بەڵکو وەکو بەڵگەییێک لە بەڵگەکانی ئێرانی تەماشا دەکرا.

٣- باسی کورد بە شێوەییێکی سەربەخۆ، وەک رووداوێکی زانستی لە وولاتی سۆڤیەتی کۆن لە هەموو جێگەییێکی تر ئاشکراترە.

ئەوی راستی بێ ئەوەیە کە رۆژهەلاتناسی ئەوروپا بە راستی لە ناوەراستی سەدەی رابردووەوە دەستی کردووە بە لێکۆلینەوە لەکورد. ئەگەر پێش ئەو ماوەیە کتێب بوو بێ، یا ناوی کورد بە سەر پێیی لە باس و ووتاری رۆژهەلاتناسەکان هاتبێ، ئەمە هەمووی بە رێکەوت بووە و لە ئەنجامی پرۆگرامێکی تایبەتی و دیاری کراو نەبووە.

بە گشتی ناوی کورد لە کۆنەوە، واتە لە سەدەکانی ناوەراستەوە لە کتێبی گەشتنامەی گەرۆکە ئەوروپاییەکان دا هاتووە بە زمانە پێشکەوتووەکانی ئەوروپا، وەکو: ئینگلیزی،

فـەرەنسـزی، ڕووسی، ئەڵەمـانی، ئیـتـالی و هیتر. هەروەها دەکـرێ نـاوی زمـانەکـانی ئەرمەنی و گورجی و ئازربایجانیش ببەین، ئەگەر کردەوەی زاناکانیان بە ڕۆژهەڵاتناسی و کوردناسی لە قەڵەم بدەین.

لەم ماوەیەدا هەوڵ دەدەین گەشتێکی کورت بە ناو هەندێ لەو سەرچاوە و کەرەستانەدا بکەین کە لە ئەنجامی کۆششی ئەوروپاییەکان هاتۆتە کایەوە بە پێی بابەتەکانی:

١- جوگرافیا: تێبینیی گەڕۆکەکان و وەسفی جێگەو ڕێگەی جیاوازی کوردستان، لە هەمـوو شـتـێـک زیاتر لەم جـۆرە ئەدەبیـاتە ڕەنگی داوەتەوە، سـەرچاوە لـەم ڕووەوە لە هەمـوو بـابەتێکی تری بەرهەمی ڕۆژهەڵاتـناسی زیاترە. هەر لە سـەردەمی مـارکـۆپۆلۆی ئیتالی (١٢٥٤ - ١٣٢٤) و زێڕنگەری باڤاری جۆهان شیلتبیرگەر (١٣٩٤- ١٤٢٧) و گـەڕۆکی هۆڵەندی لینندیرت راوولف (١٥٧٣ گـەشـتی کـردووە) کـەرەسـتـەیێکی زۆر کەوتۆتە ناوەوە لە بابەت جوگرافیای وڵاتی کوردەوارییەوە.

ئەو گـەڕۆکـانەی بـە گشـتی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و بـە تایبـەتی گـەشـتی کـوردسـتـانیـان کـردووە لـە نەتەوە جیـاوازەکانی ئەوروپا بوون، بەڵام زۆربەیان ئینگلیز بوون، بە تایبـەتی ئەوانەی گەشتی ناوچەکانی کوردستانی خوارووییان کردووە. لە ڕووی پیشە و کاریشەوە ئەمانە بازرگان و میسیۆنێر و سیاسی و سیخوڕ و نێرراوی بوون، لە ناو ئەمانەش دا هی وا هەبووە کە حەزیان بە سەفەر و گەشت بووە و بۆ مەبەسی تر نەهاتوون.

ئەو کەرەستانەی لە ژێر دەستمان دایە دەکرێ بەسێ بەشەوە:

(أ) بەشێکیان پێوەندییێکی ڕاستەوخۆیان بە کورد و کوردستانەوە نییە، گەڕۆکەکان مـەبەسـیـان بە تەنیـا گـەشـتی وڵاتـی کـوردەواری نەبووە، بەڵکو بە سەری دا تێپـەر بوون، ئەمانە وەکو دەردەکەوێ شارەزاییشیان لە کورد نەبووە، بۆیە کەوتوونەتە هەڵەی گەورەوە. لە گـەشـتـەکـانیـان دا زۆر بـاسی کـوردییان نەکـردووە، بەڵام ئەوەندە هەیە ئەم جـۆرە کەرەستەیە لە ڕۆژهەڵاتناسی دا لە هەموو کەرەستەیێکی تر زیاترە.

(ب) بەشـەکەی تریان، مـەبەسیـان چەند وڵاتێک بـووە، لەمانە کـوردسـتـانیشی تێدا بـووە، لەبەر ئەوەیە فـەسڵ و باسی تایبـەتییان بۆ وڵاتی کـورد تەرخـان کـردووە و زانیـارییێکی زۆریان داوەتە دەست، بۆ بەڵگە گـەشـتنامـەکـانی راولینسـون و فـرەیزەر و نیبۆر و دانیبێکوڤ و دیتیل و بیریزین و خانیکۆڤ لەم بابەتەن.

(ج) بەشێکی تری گەڕۆکەکان مەبەسی بنچینەییان وڵاتی کوردەواری بووە و سەر

پێ‌یی باسی وولاته‌کانی دیکه‌یان کردووه که له ده‌وروبه‌ری کوردستان بوون. زۆربه‌ی گه‌ڕۆکی له‌م بابه‌ته ئینگلیز ده‌گرێته‌وه وه‌کو: ریچ و سۆن و ئێدمۆندس و هی‌تر.

ئه‌و گه‌ڕۆکانه‌ی زانیاری و تێبینی‌ی ناماقوولیان له بابه‌ت کورده‌وه بلاوکردۆته‌وه ئه‌گه‌ر چی ژماره‌شیان که‌مه. به‌لام تا پله‌یێک ته‌ئسیری له سه‌ر ئه‌و رۆژهه‌لاتناس و کوردناسانه کردووه که له دووای ئه‌وانا په‌یدا بوون، ئه‌م ته‌ئسیره به زۆریش سه‌لبی و ره‌شبینی بووه، به‌لام هۆی ئه‌م زانیاری‌یانه به زۆری ده‌گه‌ڕێته‌وه سه‌ر ئه‌وه‌ی ئه‌م گه‌ڕۆکانه ئه‌وروپایین و به ئایین دیانن، هه‌رچی چۆنێ بێ سۆزی مه‌زهه‌بی‌یان بووه، جا له‌به‌ر ئه‌وه‌ی زۆربه‌ی هه‌ره زۆری کوردیش موسولمانن، ئه‌مه بووه‌ته هۆی ئه‌وه‌ی به چاوێکی راسته‌وه ته‌ماشای کورد نه‌که‌ن، وه ئه‌وه‌ی زیاتریش بووه‌ته هۆی ئه‌مه ئه‌وه‌یه که کورده‌کان هاوسێ‌ی ئه‌رمه‌نه‌کانن، یاخود له‌و سه‌رده‌مانه‌دا و تا پاش جه‌نگی جیهانی‌ی یه‌که‌میش ئه‌رمه‌ن له وولاتی کورده‌واری ده‌ژیان، ئیتر له‌به‌ر ئه‌وه‌ی ئه‌مانه دیانن گه‌ڕۆکه‌کان له سه‌ر حسێبی چاکه‌ی ئه‌رمه‌نه‌کان بیروڕای خراپیان به‌رامبه‌ر کورد ده‌ر ده‌بڕی، خۆ ئه‌گه‌ر خراپێک له‌گه‌ل گه‌ڕۆکێک بکرایه مه‌سه‌له‌ی ئایینی و مه‌زهه‌بی ده‌هاته ناوه‌وه. دیاره کوردیش زۆر جار به چاوی ڕێزه‌وه ته‌ماشای هه‌ندێ له گه‌ڕۆکه‌کانی نه‌کردووه، له‌ناو ئه‌مانه میسیۆنێره‌کان ئه‌وانه‌ی پڕۆپاگه‌نده‌یان بۆ ئایینی دیانی ده‌کرد و کورد ئه‌مه‌ی به دژی ئیسلام له قه‌له‌م ده‌دا.

٢ - مێژوو

له سه‌ده‌ی هه‌ژده‌مینه‌وه زانایانی ئه‌وروپا خه‌ریکی مێژووی کورد بوون. ره‌نگه له‌م لایه‌نه‌وه کاریان له هه‌موو مه‌به‌سه‌کانی تر زیاتر بوو بێ، به‌لام به گشتی نه‌یانتووانیوه مێژووی میلله‌تی کورد به درێژایی رۆژگار بنووسنه‌وه، ئه‌وه‌ی کردبێتیان ئه‌وه بووه مه‌سه‌له‌ی بچووکی ناوچه‌یی‌یان وه‌رگرتووه، ئه‌گه‌ر هه‌مووی کۆبکرێته‌وه دیسانه‌وه وێنه‌ی راسته‌قینه‌ی مێژووی کورد ناکه‌وێته به‌رچاو. هۆی ئه‌مه که‌م شاره‌زایی‌یان بووه. جگه له‌وه له سه‌ره‌تاوه پسپۆری وایان نه‌بووه شاره‌زای مێژووی کورد بوو بێ. ته‌نیا له‌م دووایی‌یه‌دا نه‌بێ زانای وا هه‌لکه‌وتووه که تا پله‌یێک له مه‌سه‌له‌که بگه‌ن. ئه‌مانه له یه‌کێتی‌ی سۆڤیه‌تی کۆن و به‌ریتانیا ده‌بینرێن ئه‌گه‌ر چی بیروڕای ئه‌م زانایانه له هه‌ندێ شت یه‌کتری ناگرێته‌وه.

له بابه‌ت مێژووی کۆنی کورده‌وه، یاخود راستتر کولتووری کۆنی کورده‌وه کارێکی تایبه‌تی که بۆ ئه‌م مه‌به‌سه ته‌رخان کرا بێ نه‌هاتۆته ناوه‌وه. کوردناس و رۆژهه‌لاتناسه‌کانی

ئەوروپا هەمــوویان ئەوانەی باسی مـێـژووی کـوردیان کـرد بێ، یاخـود بە گـشــتی بـاسی کـوردیـان کـرد بێ لە مـێـژووی کـۆنی کـورد دوواوون، بەڵام کـەمـیـان شـتی تـازەی داوەتە دەستەوە، زۆربەیان زانیـاری‌یان لە یەکتـری وەرگرتووە، زانیـاری‌یەکـانیش هەر ئەوانەن کە هەمـوو لایێـک دەیزانن. تا ئێـسـتـا کـارێکی تایبـەتی بۆ مـێـژووی کـۆنی کـورد نەهـاتۆتە ناوەوە. ئەوە نەبێ لە کـاتی خـۆی دا ن. ی. مـاڕی بە ناوبانـگ نامـەیێکی زانسـتـی لە بابەت نەژاد و کولتووری کۆنی نەتەوایەتی‌ی کوردەوە بڵاو کردەوە. بەناوی "جارێکی تر لە بارەی ووشـەی «چەلەبی»یەوە" (هەندێ تێـبـینی لەسـەر مـەسـەلەی تەئسـیـری کـولتـووری نەتەوەی کورد لە مێژووی ئاسیای ناوەڕاست)، (١٩١٢).

هەروەها أ. ل. ڤیلچێڤسکی‌ش کتێبێکی تایبەتی‌ی بۆ ئەم مەبەسە دانا بەناوی "کورد - تێبینی لە مێژووی نەژادی میللەتی کورد، (مۆسکۆ - لینینگراد، ١٩٦١). ئەم کتێبە لە رووسی‌یەوە کـراوە بە کـوردی و لەلایەن دوکـتـۆر رەشـاد مـیـرانەوە لە سـاڵی (١٩٩١) بڵاوکراوەتەوە.

هەرچی مـێژووی تازەشە کـەرەستە و سـەرچاوەییێکی یەکـجار زۆر لە ناوەوەیە، نەوەکو تەنیا باس و ووتار لە سەر هەندێ شتی بچووکی ناوچەیی بەڵکو باسی گەورەشی تێدایە. جگە لەوەی کـە بە کـتـێـبـیش بڵاوکـراونەتەوە. لەمـانە کـوردناس و ڕۆژهەڵاتناسانی وەکـو مینۆرسکی و نیکیتین و ئەدمۆندس و سافراستیان و دوگلاس و خالفین و لازاریڤ دەوری باڵایان بووە.

هەر لە پاڵ مـەبەسی مـێـژووی کـورد کـوردناسـەکـان بایەخـێکی تایبـەتی‌یان بە ژیـانی کۆمـەڵایەتی و ئـەتنۆگـرافـیـای کـورد داوە، ئەمـەیان ئەدگـاری ناوچەیی سـەربـەخۆی پێوەیە، واتە هەر ناوچەیێـک گـەورە بێ یا بچـووک، کـۆمـەڵێک کـولتـووری مـادی و گـیـانـی‌ی تایبـەتی‌ی خۆی هەیە لە جیـاوازی‌ی جل و بەرگ و کەلوپەل و نـاومـاڵ و شێـوەی ژیان بە گشـتی. لێرەدا کورد بە تایبەتی و نەتەوەکانی ڕۆژهەڵات بە گشتی ئەم لایەنەی کولتووری نەتەوەیان پشـت گـوێ خسـتـبـوو، تا ئێـسـتـاش بایەخێکی ئەوتۆی پـێ نەدراوە، ئەگەر چی کـورد هەر لە پـاش جـەنگی گـێـتی یەکـەمـەوە دەرکی بەوەش کـرد کـە دەبێ فـۆلکلـۆری نەتەوەیی خۆی بناسێ. دەرکی بەوەش کرد کە ئەتنۆگرافیـا ڕووداوێکی مادی و گیانی‌ی ڕاستـە لە هەمـوو نەتەوەییێـک دەبێ بپـارێزرێ و لێ‌ی بکـۆڵرێتـەوە. بەڵام بە داخـەوە ئەگـەر هەنگاوی لێکۆڵـینەوە لە فۆلکلۆر هەندێ فـراوان بوو بێ، دەتووانین بڵێین لە ئەتنۆگرافیـا هەر نەبووە. ئەوەی هەشبێ وەکو هەوڵەکەی مـەلا مەحمـوودی بایەزیدی ئەوا لە سەر داوای

ژابا بووە، ژاباش وەکو دەزانین ئەوروپایی‌یە و نرخی ئەم جۆرە شتانەی زانیوە بۆ دووا ڕۆژ.

٣- بزووتنەوەی نەتەوایەتی‌ی تازە و ژیانی سیاسی وکۆمەڵایەتی‌ی تازەی کورد:

سەرچاوەی ئەوروپایی لەم لایەنەوە بە گشتی بریتی‌یە لە ووتاری سیاسی‌ی کە لە ڕۆژنامەکانی ئەوروپا دا بڵاوکراونەتەوە، لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەمەوە ئەگەر ڕووداوێک لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست رووی دابێ کەوتۆتە سەر لاپەڕەی ڕۆژنامەکانی ئەوروپا، لەو ساوە پەیامنێریان بووە، پسپۆری تایبەتی‌یان بووە لە سیاسەتی ڕۆژانەی ئەو سەردەمەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست. ئەگەر چاوێک بە ڕۆژنامەکانی ئەو سەردەمەی ئەوروپا بە تایبەتی بەریتانیا دا بگێڕین باسی شەڕ و شۆڕەکانی لە نێوان ئێران و عوسمانلی، ڕووس و ئێران و عوسمانلی و هی‌تر دەخوێنینەوە..

کورد لەم مەیدانە دا دەوری باڵای بووە. کەرەستە لەم لایەنەوە وەنەبێ تەنیا ڕۆژنامەگەری بێ، بەڵکو باس و ووتار و جارجارە کتێبیش بۆ ئەم مەبەسە بڵاوکراوەتەوە. جا بە گشتی ئەگەر بمانەوێ سوود لەم سەرچاوانە وەربگرین دەبێ ووشیارانە وەریان گرین و تێ‌یان بگەین و بەکاریان بهێنین. وە بەپێ‌ی ئەوەی ئەم باسانە سیاسین دەبێ خاوەنەکانیان ڕەچاوی چاکەی خۆیان یا ئەو لایەی بۆی دەنووسنەوە بکەن، گەلێ هۆی تریش هەیە کە ئەم بیر و ڕایانە زۆر جار لەگەڵ بیروڕای خوێندەوار و ڕۆشنبیری کورد یەک نەگرنەوە. لەبەر ئەوە پێویستە لەسەرمان ڕەچاوی ئەم شتانە لە نووسینەکانیان دا بکەین:

١- لە بنج دا بۆ چاکەی دەوڵەتێک دەنووسرێتەوە، واتە سیاسەتی ئەو سەردەمەی دەوڵەتێکی دیاری کراو چی‌یە، دانەر بە تایبەتی ئەگەر هاووڵاتی ئەو دەوڵەتە بێ ڕەچاوی چاکەی ئەو دەکا.

٢- ئەگەر وا ڕێک بکەوێ کە چاکەی دەوڵەت لە کار و کردەوەیێکی دا لەگەڵ چاکەی کورد یەک بگرنەوە، ئەوا نووسەر لەو کاتەدا لایەنگری کوردەو لە دووایی دا فڕ و فێڵ دەردەکەوێ و دەکەوێتە ڕوو. خۆ ئەگەر چاکەی دەوڵەت لەگەڵ کورد ڕێک نەکەوێ ئەوا بیروڕاکان هەموویان دژی چاکەی کورد دەبن.

٣- هەندێ جار خۆ ماندوو ناکرێ لە نووسین، هەروەها زانیاری هەڵە وەردەگیرێ، لە غەیری کورد، یا دوژمنانی کورد، ئەمە دەبێتە هۆی هەڵخەڵەتاندن، کە ڕەنگە ئەو دەوڵەتە ئەوروپایی‌یەی مەبەسیشی بێ کە ڕووداوەکان دەبێ وابن وەکو نووسراونەتەوە بەڵام لەبەر ئەوەی ڕاست نین، بە چاکی نازانێ.

٤- ئایین

لەوانەیە ئەوروپاییەکان لە هەمووی کەمتر باسی ئایینی موسوڵمانییان کرد بێ، کە پێوەندییێکی زۆری بە کوردەوە هەیە و زۆربەی کوردیش لە سەر ڕێ و شوێنی ئەو ئایینەن، ڕەنگە ئەمەش لەبەر ئەوە بێ چونکە باس کردنی ئەم ئایینە لەگەڵ عەرەب دا بەجێ تر بێ، چونکە ئایینەکە لە عەرەبستان سەری هەڵداوە و هەموو شەعائیرێکیشی بە زمانی عەرەبییە.

کوردناسانی ئەوروپا دەورێکی باڵایان بینیوە لە لێکۆڵینەوە لە ئایینی ئێزدی و ئەهلی هەقی یارسان. ئەم لێکۆڵینەوانە تەنیا نرخی ئەوەیان نییە کە لایەنی گیانی هەندێ لە کوردەکان ڕوون دەکەنەوە، بەڵکو نرخێکی یەکجار زۆریان هەیە لە لێکۆلینەوەی ئەدەبی کوردی چونکە زمانی ڕەسمی ئەم ئایینانە بووە، هەروەها نرخێکی گەورەتریشیان هەیە بۆ لێکۆڵینەوە لە زمانی کوردی، چی مێژووی زمانی کوردی، وە چی تەرکیبی ناوەوەی زمان و دەستووری زمان، چونکە ئەو تێکستە ئایینییە کۆنانە سەرچاوەی یەکەمن بۆ ئەم مەبەسە.

## بیر و ڕامان بەرامبەر کردەوەی ئەوروپاییەکان

لە دووای پیشان دانی جموجۆڵی لێکۆڵینەوە لە کورد لە ئەوروپا و دەست نیشان کردنی کارە گرنگە بنچینەییەکان، بێ گومان دەتوانین وێنەی مێژووی ئەم مەسەلەیە بخەینە ڕوو. دیارە لە کوردناسی دا کەموکووڕی هەبووە، زۆر یا کەم، ئەمەش لە ئەنجامی هۆی تایبەتی و دیاری کراو بووە.

بەلای ئێمەوە هۆی ئەمە بە گشتی دووانن:

١- بیروڕای گشتی ئەو زانایانەی خەریکی ئەم مەسەلەیە بوون.

٢- پلە و جۆری زانینیان و زانیارییی گشتییان لە زمانی کوردی و مێژووی کولتووری کورد.

لە یەکەم دا زاناکان ڕەچاوی چاکەی چینی دیاری کراو دەکەن، بە ئانقەست و هوشیاری ڕاستیی مێژووی کولتووری نەتەوەی کوردیان دەرنەدەخست، ئەمەیان هەمووی بە سوود و چاکەی سیاسی و ئابووریی وولاتەکانی خۆیان دەبەستەوە.

لە دووەم دا زانایانی ئەوروپا لە دەوری زانینی کەم و دیاری کراوی خۆیان دا

دەسوورانەوە، ئەم زانیاریيانەيان نەوەكو كەم بوو، بەڵكو سەر پێيی و قووڵيش نەبوو، بۆيە بە تەواوی مێژووی كولتووری كورد لە مێشكيان دا نەچەسپی بوو. ئەمە هەمووی بوو بە هۆی ئەوەی گەلێ هەڵە لە لايەن زانايانی ئەوروپاوە بكرێ لە بابەت زمان و ئەدەبی كوردی و بە گشتی كولتووری نەتەوايەتی.

بەم جۆرە ئێمە دەتووانين لە بارەی كاری ڕۆژهەڵاتناسانی ئەوروپا لە مەيدانی كوردناسی دا بگەينە ئەم بيروڕاو ئەنجامانە:

١- هەندێ لە زانا ئەوروپاييیەكان بە تەواوی لە زمانی كوردی نەگەيشتبوون، لەبەر ئەوە بوو لە بنج و بناوانيشی نەگەيشتبوون، بۆيە كەوتبوونە هەڵەوە، وايان دەزانی زمانی كوردی شێوەيێكی زمانی فارسیيە. ئەو كتێبانەی بۆ فێر بوونی زمانی كوردیيان دانا بوو لە ژێر ڕۆشنايی دەستووری زمانی كوردی دانرا بوو، هەندێ لە زانا ئينگليزەكان لە ژێر ڕۆشنايی دەستووری زمانی ئينگليزی دەيانڕووانیيە زمانی كوردی. بە هۆی نەزانينيان نەيانتووانی ئەدەبی كوردی بگەيێننە ئەو پلەيەی هەيەتی. ئەمە و نەبوونی سەرچاوەی ئەدەبی كوردی لە ژێر دەستيان بووە هۆی ئەوەی بەڵگەی فۆلكلۆری بەكار بهێنن بۆ مەبەسی زمانەوانی و دەستووری زمانی كوردی. ئەمە هەمووی بوو بە هۆی ئەوەی بيروڕای ڕاستيان نەبێ لە بابەت ئەدەبی كوردیيەوە و لە پلەی تايبەتیی خۆی داينەنێن.

٢- لێكۆڵينەوەی زمانی كوردی لە لايەن زانايانی ئەوروپا لە بنج دا بۆ مەبەسی زانينی جۆری دروست بوونی زمانی كوردی نەبوو بە گشتی، بەڵكو بۆ مەبەسی هەندێ لايەنی تايبەتیی زمانەكە بوو، يا هەندێ مەسەلەی بچووكی زمانەوانی يا دەستووری زمان، بۆيە زانياریيان لە بابەت زمانی كوردی وەكو ڕووداوێك ڕێكوپێك نەبوو.

جگە لەمە ماوەی لێكۆڵينەوە لە زمانی كوردی تەسك بوو، ئەمە ناوچەی جوگرافی بچووكی گرتبووەوە، لە ديالێكتە بچووكەكانيان دەكۆڵیيەوە. ئەگەر بێت و هەموو ئەم لێكۆڵينەوانە كۆبكەينەوە بە ڕاستی ئەمانە هەموو ناوچەكانی كوردستان ناگرنەوە، هەروەها بە تەواوی دەستووری زمانی كوردی و هەموو مەسەلەكانی زمانناسی نادەن بە دەستەوە. لەگەڵ ئەوەش دا ئەمە ئەوە ناگەيێنێ كە ئەم كارانە نرخێكی گەورەيان نیيە، بە پێچەوانە دەورێكی باڵايان بووە لە پێش خستنی كوردناسی، هەروەها وەكو كەرەستەيێكی بنچينەيی دەمێننەوە بۆ لێكۆڵينەوەی زياتر لە دوواڕۆژدا. هەرچی ئەدەبيشە،

ئەوتێکستانەی بۆ بەڵگەی زمانەوانی و دەستووری زمان بەکار هێنراوون لە مەیدانی لێکۆڵینەوەی ئەدەبیدا گەلێ گرنگن، چونکە پارێزراوون و خاسیەتی زمانی کوردی سەردەمی تۆمار کردنیان لەگەڵ خۆیان دا پاراستووە، ئەمانە دەبنە سەرچاوە بۆ مێژووی ئەدەبی کوردی.

٣- لەو کاتەی کە بە چاوێکی شانازییەوە تەماشای ئەو تێکستە فۆلکلۆرییانە دەکەین کە کوردناس و ڕۆژهەڵاتناسە ئەوروپاییەکان تۆماریان کردووەو بڵاویان کردۆتەوە، پێویستە ئەوەش بزانین کە هەندێ جار ئەم تێکستانەیان لە زاری کوردەوە وەرنەگرتووە، جگە لەمە شێوەی تۆمار کردنیشیان قورسە، چونکە هەر زانایێک ترانسکریپتی تایبەتی خۆی لە سەر بنچینەی ئەلفو بێی لاتینی داناوە، واتە ئەلفو بێیێکی تایبەتی نەبووە تێکستەکانیان پێ تۆمار بکەن، ئەمەش دیارە هەندێ جار دەبێتە هۆی ئەوەی شێوانێک لە ڕووی فۆنێتیکەوە پەیدا ببێ. هەر لەبەر ئەوەش بوو بۆ ماوەیێکی زۆر زماناناسەکان نەیانتووانی تەحلیلی فۆنێتیکی زمانی کوردی بکەن. بەلای ئێمەوە چاکترین ترانسکریپت بۆ زمانی کوردی دانرابێ ئەوەیە کە ڕۆژهەڵاتناسی فرەنسی ڕۆژی لیسکۆ تێکستەکانی پێ تۆمار کردووە.

٤- ناوچە جیاوازەکانی کوردستان بە پێی چاکە و دەسەڵاتی وولاتە پێشکەوتووەکانی ئەوروپا دابەش کرا بوون، واتە ئەو ناوچەیەی کەوتبووە ژێر دەسەڵاتی وولاتێکی پێشکەوتووی ئەوروپا زانایان و ڕۆژهەڵاتناسانی ئەو وولاتە خەریکی ناوچەکە بوون. بەم پێیە هەرێمەکانی خوارووی کوردستان کەوتبوونە ژێر تەئسیری زانا و ڕۆژهەڵاتناسە ئینگلیزەکان، هەرچی ناوچەکانی سەرووش بوو کەوتبوونە ژێر تەئسیری زانا و ڕۆژهەڵاتناسە ڕووس و ئەڵەمان و فەرەنسزەکان.

لە پاش شۆرشی ئوکتۆبەر لێکۆڵینەوە لە کورد لە وولاتی سۆڤیەتی کۆندا لە پێشانا خەریکی کوردەکانی وولاتی سۆڤیەت خۆی بوو، ئینجا کوردناسی سۆڤیەت دەستی کرد بە لێکۆڵینەوە لە مێژووی کولتووری کورد وەکو نەتەوەیێک. جگە لەمەش لە وولاتی سۆڤیەت زانا و کوردناس لە ناو کوردەکان خۆیان دا هەڵکەوت و شان بەشانی کوردناسەکانی تری سۆڤیەت کەوتنە کار، ئەمانە ڕۆڵەی نەتەوە جیاوازەکانی وولاتی سۆڤیەتی پان و فراوان بوون.

٥- دیالێکتی گۆرانی و لوڕی زمانی کوردی بایەخێکی ئەوتۆی پێ نەدراوە لە

کوردناسی‌ی ئەوروپا، ئەو بەرهەمە کەمەی لەم ڕووەوە هاتۆتە ناوەوە هەندێ تێبینی و بیروڕای زانستی‌یانەی ئەم کوردناس و ڕۆژهەڵاتناسانەن: ژووکۆڤسکی، مینۆرسکی، سۆن، ئەدمۆندس و هی‌تر.

٦- لە ساڵانی جەنگی دووەمی گێتی و پاش جەنگ بەگشتی زانایان و ڕۆژهەڵاتناسانی ئەوروپا ئەوانەی خەریکی کورد بوون پێوەندی‌یان لەگەڵ زانایان و ڕۆشنبیرانی کورد لە کوردستان دا نەبوو، کەچی بە پێچەوانەوە هەندێ لە زانایانی کورد ئاگاداری‌یان لە هەموو ئەدەبیاتێکی کوردناسی‌ی ئەوروپا هەبوو، ئەمە بووە هۆی ئەوەی کارەکانیان زانستی و بەهێز بێ.

لە دوواییی دا دەڵێین: بۆ بەهێز بوونی کوردناسی‌ی ئەوروپا پێویستە پێوەندی‌یێکی زانستی‌ی بەهێز لە نێوان کوردناسەکان و زانایانی کورد خۆیان دا هەبێ، بەمە بەرهەمی زانستی و نزیک لە ڕاستی دەکەوێتە ناوەوە.

## ڕۆژنامەگەری کوردی

لە دووا ساڵانی سەدەی نۆزدەم و سەرەتای سەدەی بیستەم نەتەوەی کورد یەکێک بوو لە نەتەوە دوواکەوتووەکانی هەر دوو دەوڵەتی عوسمانلی و ئێران، زیاتر لە میللەتانی تری ژێر دەست ژەهراوی چەوساندنەوەی دەچێشت، ئەمە بووە هۆی ئەوەی عاشقی سەربەستی و ڕزگاری بێ. ڕۆشنبیر و خوێندەواری کورد ڕێبەری ئیدیۆلۆجیەتی بزووتنەوەی ڕزگاری‌ی نەتەوایەتی‌ی کورد بوون، ئەمانە لە ئەستەموول و ناوچە جیاوازەکانی نیشتمانیان خەباتیان دەکرد، هەندێ کۆمەڵە و ڕێکخراویان پێکەوە نا. لەگەڵ ئەوەی ئامانج و بەرنامەی ئەم ڕێکخراوانە جیاواز بوو، بەڵام هەموویان لە ژێر دروشمی «ڕزگاری‌ی خاک و بەختیاری‌ی نەتەوە» کۆدەبوونەوە.

### پەیدا بوونی ڕۆژنامەی کوردی

لەگەڵ پەرەسەندنی بزووتنەوەی ڕزگاری نەتەوایەتی کورد ڕۆژنامەگەری کوردیش پەیدا بوو. ڕێکخراوی کۆمەڵایەتی - سیاسی و ڕۆشنبیری بایەخیان بە مەسەلەی سەربەستی‌ی سیاسی کورد دەدا و لەگەڵ لێکۆڵینەوەی مێژووی و کولتووری میللەتی کورد و ئەدەب و زمان و فۆلکلۆر بە یەکتری‌یان دەبەستەوە. جگە لەمە بایەخیان بە بڵاوکردنەوەی یادگاری ئەدەبی کۆن دەدا چونکە ڕەنگدانەوەی مێژووی بەرزی میللەت بوو، لە دووایی‌دا ئەمە

دەبوو بە هۆی چاندنی هەستی نیشتمان پەروەری لە گیان و دەروونی رۆڵەی میللەت دا.

بڵاوکردنەوەی شیعری نیشتمانی کە بە سەر میللەت و وڵات هەڵدەڵێ، ووتاری هەمەجۆر لە بابەت ژیان و بەسەر هاتی ناودارە گەورەکانی کورد وەکو سەلاحەدین و کەریم خانی زەند و بەدرخان پاشا و ئەورەحمان پاشای بابان... هتد، ووتار لە بابەت پێویستی‌ی دروست کردنی ئەلفو بێ‌ی کوردی و گەلێ شتی تریش... ئەمانە هەموویان لە پێناوی مەسەلەی نیشتمانی کورد بوون، مەبەس لەمە ئەوە بوو کە میللەتی کورد میللەتێکی سەربەخۆیە، مێژوو و زمان و ئەدەبی تایبەتی‌ی خۆی هەیە.

لە دایک بوونی رۆژنامەگەری کوردی دەگەڕێتەوە ساڵی ١٨٩٨ لەو کاتەی کە لە قاهیرە یەکەمین رۆژنامەی سیاسی کوردی بە ناوی «کوردستان» بڵاوکرایەوە. لەو سەردەمەدا هێشتا رێکخراوی سیاسی - کۆمەڵایەتی‌ی گەورە و پتەوی کوردی پەیدا نەبوو بوو. لەم ماوەیەدا وورده کۆمەڵەی کوردی لەم لاو ئەولا پەیدا بوو بوون بەڵام پێوەندی‌یێکی ئەوتۆ لە نێوانیان دا نەبوو. رۆژنامەی «کوردستان» بووە شانۆی هەموو هێزە نیشتمان پەروەرەکان.

لە دووایی دەیەکانی سەدەی بیستەم بەم لاوە هەندێ رۆژنامە و کۆواری تری کوردی پەیدا بوون. وەزعی نالەبار و سەختی ژیانی رۆژنامەی «کوردستان» رەنگی دابووەوە لە ژیانی رۆژنامەگەری کوردی بە گشتی. بڵاوکەرەوەکانی سەربەست نەبوون لە هەڵسوکەوتیان، پێویست بوو رێبازێکی وا دەست نیشان بکەن تا رادەیێک لەگەڵ ئیدیۆلۆجیەتی کاربەدەستانی سەرەوەی دەوڵەتی عوسمانلی رێک بکەوێ، بۆ ئەمە دەبوو زۆر ووشیار و ئاگادار بن. هەموو شتێکی دەوڵەت بوو بوو بە چاو و شوێن چاپەمەنی‌ی کوردی کەوت بوو، بەڵام خەڵکی کورد بە گیانی نیشتمان پەروەری چاپەمەنی و بڵاوکراوەی خۆی پەروەردە دەکرد. رۆشنبیر و خوێندەواری کورد بە هەموو هێز و تووانایانەوە هەوڵیان دەدا پارێزگاری‌ی رۆژنامە و کۆواری کوردی بکەن و پێشی بخەن. گەلێ جار هەوڵیان دەدا کە هەندێ لاپەڕەی بەشێ لە رۆژنامە و کۆوارەکان بە زمانی تریش بنووسن، نووسەری رۆژنامەکان هەلیان دەرەخساند بۆ ئەوەی باسی ئایین بکەن، وەکو ئەوەی کە کوردیش موسوڵمانە و یەکێکە لەو نەتەوانەی کە کۆمەڵە (جامعە)ی ئیسلامی پێک دێنن، لەبەر ئەوە وا چاک بوو کە هەندێ جار رۆژنامە و کۆواری کوردی ووتار و هەواڵ بە تورکیش چاپ بکەن. ئەم دیاردەیە لە رۆژنامە و کۆوارەکانی «کوردستان -

۱۸۹۸» ، «کـورد - ۱۹۰۷» ، «ڕۆژی کـورد - ۱۹۱۳» ، «بانگی کـوردسـتـان - ۱۹۲۲» و «ڕۆژی کوردستان -۱۹۲۲» دەردەکەوێ.

لە ناوەڕاستی بیستەکانی سەدەی بیستەم کە کوردستان پارچە کراو سنووری سیاسی دانرا، پێوەندیی لە نێوان مەڵبەندەکانی چاپ کردنی ڕۆژنامە و کۆواری کوردی پچڕا. لە تورکیا بە تەواوی چاپەمەنیی کوردی قەدەغە کرا.

## ڕۆژنامە و کۆواری کوردی ئێران

لە بیستەکانی سەدەی بیستەم ڕۆژنامەگەری کوردی لە ئێرانا نەبوو، تەنیا ئەوە ناڵێین هەندێ چاپەمەنیی نهێنی ڕێکخراوە جیاوازەکانی کوردی نەبێ.

عـەبدولڕەزاق بەدرخـان لە سـاڵی ۱۹۱۲ لە شـاری وورمێ هەوڵی داوە کـۆواری «کوردستـان» بڵاو بکاتەوە، بەڵام تا سـەر نەیتووانیوە کاری تێدا بکا، ئیـتر کاروباری کۆڤارەکە کەوتۆتە ئەستۆی دەسەڵاتی سمکۆ ئاغای شکاک، تا ساڵی ۱۹۱٤ بەردەوام بووە.

ڕۆژنامەگەری کوردی لە کوردستـانی ئێران دا لە ماوەی جەنگی دووەمی گێتیدا پەیدا بوو، لەو کاتەی کە بزووتنەوەی ڕزگاریی نەتەوایەتیی بە تایبەتی لە ناوچەی مەهاباد دا بەهێز بوو. لەو سەردەمەدا لە کوردستانی ئێران هەندێ ڕۆژنامە و کۆواری نەتەوایەتیی کوردی دەرچوو، لە ناو ئەمانەدا کۆواری «نیشتمان» جێگەی دیاری هەبوو.

لە ماوەی هەڵچوونی بزووتنەوەی نەتەوایەتیی کورد لە ئێران و تەمەنە زۆر کورتەکەی کـۆمـاری کـوردسـتـان، کـۆمـەڵێکی زۆر لە کـۆواری کـوردی بڵاوکـرانەوە، زۆریان تاقـە ژمـارەیێک یا یەک دوو ژمـارەیان لێ دەرچووە. لە ناو ئەو ڕۆژنامـە و کـۆوارانەی تا ڕادەییێک خزمەتی ڕۆشنبیری و ئەدەبی کوردییان کردووە پێویستـە پەنجە بۆ «گڕوگاڵی منداڵانی کورد -۱۹٤٥» درێژ بکرێ، ئەوەی جێی سەرنج ڕاکێشانە لەم ماوەیەدا ئەوەیە کـە ئەم کـۆوارە پێـوەندیی بە منداڵانەوە نییە، هەر وەکـو ڕۆژنامـە و کـۆوارەکـانی ترە. هەروەها کـۆواری «کـوردسـتـان -۱۹٤٥» دەورێکی دیاری هەبوو لە ووشـیـار کـردنەوەی خەڵکی و پیشـان دانی داهێنانی هەرە جووان لە ئەدەبی کوردی. لە ۲۱ی مارتی ۱۹٤٦ لە شـاری بۆکـان گـۆواری «هەڵاڵە» بڵاوکـرایەوە، ئەمـە ئۆرگـانی لقی ڕێکخـراوی لاوانی کوردستانی ناوچەی بۆکان بوو.

له پاش ڕووخاندنی کۆماری کورد و له سێدارەدانی سەرۆکەکانیان باری ژیانی کورد له هەمــوو ڕوویێکەوه کـەوته لێـژییەوه. تیـرۆری بنەمـاڵەی پەهلەوی زیاتر باڵـی بە سـەر کـۆمـەڵی کـورد دا کـێشـا ، بەم جـۆره ڕۆژنامـەگـەری و چاپەمـەنـیی کـوردی ئێـران کـەوته ئاوارەیی له دەرەوەی خاکی نیشتمان.

## ڕۆژنامه و کۆواری کوردی عیراق

ڕۆژنامـەگـەریی کـوردی له عـیـراق هەمـیـشـه له پێش چاو بووه، هەڵبـەز و دابەزی بووه بەڵام قـەت نەکـوژاوەتەوه. سـانسـۆری مـیـری چاوی نەترووکـاندووه له عـاست ڕۆژنامـه و کـۆواری کـوردییەوه، دەسـەڵاتی مـیـری بـۆی نه دەکـرا به تەواوی قـەدەغـەی بکا هەروەها نەشی دەویست به ئارەزووی خۆی بکەوێته کار. به تایبەتی میری زیاتر ڕەچاوی ئەو بیر و ڕایانەی دەکرد که پێوەندییان به هەستی نەتەوایەتییەوه هەیه.

ڕۆژنامه و کۆواری کوردی له سەرەتای سەدەی بیستەمەوه به تیپ و ئەلفو بێی جیاجیا بڵاو دەکـرایەوه، ئەمه بـووه هۆی ئەوەی له هەمـوو ناوچەکـانی کـوردسـتـان دا سـوودیان لێ وەرنەگـیـرێ. تـا بیسـتـەکـانی سـەدەی بیسـتـەم له وڵاتی عـوسـمـانلی (له ئێـران و عـیـراق تائێـسـتـا ) ڕۆژنامـەگـەری کـوردی ئەلفـو بێی عـەرەبی بەکـار دەهێنا له نووسـینی زمـانی کـوردی دا. کـەچی ڕۆژنامـەگـەری و چاپەمـەنی کـوردی له سـووریا و چاپەمـەنـیی کـورده ئاوارەکـانی کوردسـتـانی تورکیا له دەرەوه ئەلفو بێی لاتینییان بەکار دەهێنا له نووسـینی کـوردی دا. کـوردی یەکـێتـیی سـوڤـیـەت له پاش شـۆرشی ئۆکـتـوبەرەوه تـا جـەنگی دووەمی گـێـتی ئەلفو بێی لاتینییان بەکـار دەهێنا ، له پاش جەنگی دووەمەوه چوونه سەر ئەلفو بێی سیریلی.

ڕۆژنامـەگـەری کـوردی گـشـتی بوو ، واته هەمـوو کـۆوارێکی کـوردی له یەک کـات دا کـۆمـەڵایەتی - سـیـاسی، ئەدەبی و زمـانەوانی، زانسـتی و هونەری بوو ، مـەیدانی هەمـوو زانسـتی و زانیارییەکان بوو. له هیچ لایێکی کوردستـان تا سـاڵی ١٩٥٩ ڕۆژنامەیێکی کـوردی ڕۆژانەی سـیـاسی بڵاونەکـراوەتەوه. له چلەکان و پەنجـاکـان دا، هەندێ ڕۆشنبـیـری کـورد، خـەباتێکی بێ ووچانیـان کـرد بۆ ئەوەی ڕۆژنامـەیێکی سـیـاسی - کـۆمـەڵایەتی وەدەست بێنن، بەڵام هەرگـیـز نەیانتـوانی ئەم ئـاواتـه بهـێـننەدی. تەنیـا له پاش شـۆرشی ١٤ی تەمـووزی ١٩٥٨ حـوکـومـەتی تازەی عـیـراق ڕێگەی ئەوەی دا کـه دوو ڕۆژنامـەی سـیـاسی - کـۆمـەڵایەتی به زمـانی کـوردی بڵاو بکرێنەوه، ئەمـانه یەکـەمـیـان ڕۆژنامـەی

«خەبات» بوو - ئۆرگـانی پارتی دیموکـراتی کـوردسـتـان - ژمـاره یەکـەمی لە ٤ی مـارتی ١٩٥٩ لە بەغـدا بڵاوکـرایەوە. دووەمـیـان ڕۆژنامـەی «ئازادی» بوو - ئۆرگـانی پارتی کـۆمـۆنیـسـتی عـیـراق - ژمـاره یەکـەمی لە ڕۆژی ١ی مـایسی ١٩٥٩ لە کـەرکـووک بڵاوکرایەوە. لە پاش تێپەڕ بوونی دوو ساڵ ئەم ڕۆژنامانە داخران.

بەشێکی زۆر لە ڕۆژنامەگەریی کوردی لە چلەکان و پەنجاکان بە شێوەییێکی نهێنی لە عـیـراق دا بڵاو دەکرانەوە، ئەم ڕۆژنامـانە بە ڕێکوپێکی دەرنەدەچوون، لە کـاتی خـۆی دا بڵاو نەدەکـرانەوە، بە تـایبـەتی لەو سـەردەمـانەی کـە دەسـەڵات بە هەمـوو هێـزی بەر بەرەکـانیی نیـشـتـمـان پەروەرانی کـوردی دەکـرد. دەوری کـۆمـەڵایەتی - سـیـاسی ئەم چاپەمەنییانە یەکجار گرنگ و بەرز بوو، ئەم ڕۆژنامانە مەسەلەی ستراتیجی و تاکتیکی خەباتی جەماوەریان بە ڕوونی دەخستە ڕوو، ئەمە کارێکی گەورە بوو بۆ پڕوپاگەندە لە ناو خەڵک و دەبووە هۆی تێگەیاندن و فراوان کردنی هەست و خوێندەوارییان. لەم ماوەیە دا دەتووانین ناوی هەندێ لەم چاپەمەنییە نهێنییانە ببەین:

١- کۆواری «شۆرش» - ئۆرگانی پارتی کۆمۆنیستی کورد بوو.

٢- کۆواری «ڕزگاری» - ئۆرگانی پارتی ڕزگاریی کوردستان بوو، لە ساڵی ١٩٤٦ بڵاو دەکرایەوە.

٣- ڕۆژنامەی «ئازادی» - ئۆرگانی پارتی کۆمۆنیستی عیراق بوو لە ساڵی ١٩٤٥ بڵاو دەکرایەوە، لە ساڵی ١٩٥٦ ناوی بوو بە «ئازادیی کورد».

٤- ڕۆژنامەی «خەباتی کورد» - ئۆرگانی پارتی دیمۆکراتی کوردستان بوو لە ساڵی ١٩٥٦ بڵاو دەکرایەوە.

یەکێ لە ئەدگارەکانی تری ڕۆژنامەگەریی کوردی ئەوە بوو هەندێ ڕۆژنامە و کۆوار بە دوو یا سێ زمان چاپ دەکران و بڵاو دەکرانەوە، بۆ ڕێکخراوە کوردییەکان ئاسانتر بوو کە کۆوار و ڕۆژنامە بە زمانی میریش چاپ بکەن، ئەمە دەبووە هۆی ئەوەی کەمتر دەسەڵاتدار حەساسیەتی هەبێ بەرامبەر بە کورد، مەبەسێکی گرنکی تریش بەم هۆیەوە دەگەیشتە ئەنجام ئەویش ئەوە بوو کە ڕۆژنامە و کۆوارە کوردییەکە بە دوو یا سێ زمان دەردەچوو دەبووە هۆی ئەوەی نەتەوەی ئەم زمـانانە شـارەزایی لە ژیان و مـێـژوو و ئەدەب و خوێندەواری و مەسەلەی نیشتمانی کورد لە کوردستانا پەیدا بکەن.

بۆ بەڵگە ڕۆژنامەی «بانگی کوردستان -١٩٢٢» لە سلێمانی بە زمانانی کوردی و

فارسی و تورکی بلاو دەکرایەوە، سەر نووسەری ئەم ڕۆژنامەیە مستەفا پاشا یامولکی بوو، نووسەری بەشی تورکی ڕەفیق حیلمی و نووسەری بەشی فارسی عەلی کەمالی باپیر بوو. یەکەمین ژمارەی ئەم ڕۆژنامەیە لە ڕۆژی ٢ی ئاغستۆسی ١٩٢٢ بلاو کراوەتەوە. کۆواری «دیاری کوردستان» (١٩٢٥) لە بەغدا بە زمانانی کوردی و عەرەبی و تورکی لەلایەن سالح زەکی ساحیبقرانەوە بلاو دەکرایەوە.

کۆوار و ڕۆژنامەی کوردی ڕەنگدانەوەی هیواو ئامانج و چاک کردنی باری ژیانی زۆربەی هەرە زۆری خەلکی کوردستان بوو، بۆ هێنانەدی ئەم ئامانجە دەبوو بەربەرەکانی دوژمن بکا بەوەی جێگەی نیشتمان پەروەری لە ناو دلی خەلکی کورد بکاتەوە. وەکو نەتەوەییێکی چەوساوە هەمیشە مافی ئەوەی بووە چەوسێنەرەکانی ریسوا بکا و مافی خۆی لە پێش مافی هەموو کەسێکی ترەوە بێ با ئەو کەسە لەویش زیاتر تووشی نالەباری بوو بێ.

لە ماوەی جەنگیی دووەمی گێتی و پاش جەنگ ڕۆژنامە و کۆواری کوردی زیاتر پێش کەوت و پەرەی سەند. لەو سالانە دا ڕێبازی پێشکەوتنخوازی زیاتر بەهێز بوو لەسەر لاپەڕەکانی چاپەمەنی دا.

مەسەلەی خەباتی ڕزگاریی نەتەوایەتیی میللەتی کورد زیاتر بایەخی پێ دراو قوولتر تەماشای دەکرا و لێی دەکۆلرایەوە.

هەر لەو کاتە دا بەشی ئەدەبی ڕۆژنامە و کۆوارەکان بەهێزتر بوو لە ڕووی ناوەرۆکەوە. ئەوەی شایانی باسە ئەوەیە کە لەم ماوەیەدا گەلێ لە بەرهەمی نووسەر و شاعیر و خوێندەوارانی ئەورووپا وەردەگێڕدرایە سەر زمانی کوردی و لە چاپەمەنی دا بلاو دەکرایەوە.

لە پاش شۆرشی ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨ دەرگاییێکی تر کرایەوە، ڕێڕەوی ئەو کۆوار و ڕۆژنامانەی کە پێش شۆرش دەردەچوون گۆڕرا و گەلێ کۆوار و ڕۆژنامەی تازەش کەوتە ناوەوە. بەم جۆرە دەبینین شۆرش تەنیا کارێکی گەورەی لە ڕۆشنبیری کوردی عیراق نەکرد، بەلکو بوو بە هۆی ئەوەی ئێران دەست بکا بە بلاوکردنەوەی ڕۆژنامەییێکی هەفتەیی بە ناوی «کوردستان -١٩٥٩» بە تیپی عەرەبی لە تاران چاپ و بلاو دەکرایەوە، ئەم ڕۆژنامەیە لە دژی هەموو بیر و باوەڕێکی کۆمەلایەتیی نوێ خوازی بوو، هەولی دەدا خەباتی چینایەتی و ڕزگاریی نەتەوایەتی لە ئێران کپ بکا. بەلام لەگەل ئەوەش دا ووتاری زانستی و ئەدەبی و هونەریی بە کەلکی بلاو دەکردەوە. ڕۆژنامەی

«کوردستان» ووتار و بەرهەمی بە هەموو دیالێکتە جیاوازەکانی زمانی کوردی بڵاو دەکردەوە، ئەمە بووە بنچینە و سەرچاوە بۆ هێنانەدی مەسەلەی بەراووردی لە نێوان شێوەکانی زمانی کوردی، هەروەها مەسەلەی دروست بوونی زمانی یەکگرتووی ئەدەبی کوردی و دەستووری ڕاست نووسین.

پێویستە لێرەدا ئەوەش بووترێ کە بەشی هەرە زۆری مەسەلەی کولتوور و ڕۆشنبیری کوردی بە تایبەتی مەسەلەی زمانی کوردی لە سەر لاپەڕەکانی ڕۆژنامە و کۆواری کوردی دا تەماشایان کراوە و جێ بەجێ کراوون. لەبەر ئەوەی کتێبی کوردی کەم و دەگمەن بوو ڕۆژنامەگەری کوردی ئەرکی کتێبی کوردی خست بووە سەر شانی خۆی. هەروەها ڕۆژنامە و کۆواری کوردی دەوری کتێبی قوتابخانەیی دەدی بۆ فێر کردنی زمانی کوردی بۆ نەخوێندەوار و نیوە خوێندەواری کورد.

## ڕۆژنامە و کۆوارە گرنگەکانی کوردی

لەم ماوەیەدا باس لە هەندێ لە ڕۆژنامە و کۆوارە گرنگەکانی کوردی دەکەین بە تایبەتی ئەوانەی لە ڕوخسار و ناوەڕۆک ئەدگارێکی تایبەتی‌یان هەیە و زیاتر بایەخیان بە زمان و ئەدەبی کوردی داوە.

### کوردستان (قاهیرە ١٨٩٨)

کوردستان یەکەمین ڕۆژنامەی کوردی‌یە، ڕۆژنامەگەری کوردی لەوەوە دەست پێ دەکا.

بۆ مێژوو دەبێ دوو قسەی ڕاست بخرێتە ڕوو: لە سەرەتای شەستەکان کە خاوەنی ئەم کتێبە لە ئامۆژگای ڕۆژهەڵاتناسی ئەکادیمیەی زانستی رووسیا خوێندنی بەرزی تەواو دەکرد ژمارە یەکەمی ڕۆژنامەی «کوردستان»ی لە نامەخانەی بەشی تورکە - مەنگۆلی لە ئامۆژگای ڕۆژهەڵاتناسی دا دۆزی‌یەوە. دوور وولاتی و باری ژیانی سیاسی نیشتمان لەو سەردەمەدا، بڵاو کردنەوەی هەواڵی ئەم دۆزینەوەیەی دووا خست تا گەڕانەوەی بۆ نیشتمان لە سەرەتای ساڵی ١٩٦٨، وا بوو ڕۆژی ٢٢ی نیسانی ١٩٦٨ بە زمانانی عەرەبی و کوردی لە ڕۆژنامەی «التآخي = برایی» ئەم هەواڵە ڕۆشنبیری‌یە گرنگەی بڵاو کردەوە، پێشنیازیشی کرد کە ڕۆژی ٢٢ی نیسانی هەموو ساڵێک بکرێ بە جەژنی ڕۆژنامەگەری کوردی. لە پاش ئەمە دوکتۆر کەمال فوئاد لە هاوینی ساڵی ١٩٦٨ زۆربەی

هەرە زۆری ژمارەکانی لە ئەڵەمانیا دەست خست و لە ساڵی ١٩٧٢ بە ڕێگەی ئۆفسێت بڵاوی کردەوە.

ژمارە یەکەمی «کوردستان» لە ڕۆژی ٢٢ی نیسانی ساڵی ١٨٩٨ لە قاهیرە دەرچووە، خاوەنی میقداد مەدحەت بەدرخان بووە، دووا ژمارەی ئەوەی تائێستا لەبەر دەست دایە لە جنێڤ لە ١٤ی نیسانی ١٩٠٢ بڵاوکراوەتەوە.

لە ژمارە شەشەمەوە کە جێی دەرکردنی لە قاهیرەوە گوێزراوەتەوە جنێڤ تا دووا ژمارەی لەلایەن عەبدولرەحمان بەدرخانەوە بڵاوکراوەتەوە. چارەنووسی ئەم ڕۆژنامەیە ئەوەبوو کە گەشتی شارەکانی قاهیرە و جنێڤ و لەندەن و فۆلکستۆن بکا. دەبوو لەو جێگە دوورانەوە لەو سەردەمەدا - کە هاتوچۆ کردن ئاسان نەبوو - بگاتە دەست خوێنەرانی کوردی لە کوردستان، چونکە بۆ ئەوان چاپ دەکرا.

بێ گومان ڕۆژنامەی کوردستان دەورێکی دیاری بووە نەک تەنیا لە ووشیار کردنەوەی لاوی کورد لە ڕووی کۆمەڵایەتی و سیاسی‌یەوە، بەڵکو کوردی فێری پیشەی ڕۆژنامەگەری کرد. دیارە دەوری هەرە باڵاشی خزمەت کردنی ئەدەبی کوردی بووە، نموونەی بەرهەمی ئەدەبی کوردی بڵاو کردۆتەوە، ئاشنایەتی لەگەڵ شاعیر و ڕۆشنبیرانی کورد پەیدا کردووە، زانیاری‌ی بە نرخی لە بابەت زمان و ئەدەبی کوردی‌یەوە پێشکێش کردووە.

## ژین (ئەستەموول ١٩١٩)

ژین ڕۆژنامەیێکی هەفتەیی بوو، یەکەمین ژمارەی لە ڕۆژی ٢٧ی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩١٨ لە ئەستەموول دەرچووە. ڕۆژنامەکە بە زمانی کوردی و تورکی بڵاو دەکرایەوە، ووتارە سیاسی و کۆمەڵایەتی و مێژوویی‌یەکانی بە تورکی بڵاو دەکردەوە، لە بەشی کوردی‌یەکەش دا بایەخی بە تێکستی ئەدەبی دەدا بە تایبەتی شیعر. ئەم ڕۆژنامەیە لەلایەن کۆمەڵێک خوێندەواری کوردەوە دەردەهێنرا ئەوانەی لە ئەستەموول دەژیان و دەیانخوێند. دووا ژمارەی ئەم ڕۆژنامەیە (ژمارە ٢٥) لە ٢ی تشرینی یەکەمی ١٩١٩ بڵاو کراوەتەوە. ڕۆژنامەی «ژین» زمانی بزووتنەوەی ڕزگاری‌ی نەتەوایەتی کورد بوو، لە بەرنامە و تاکتیک و ستراتیجی‌ی گشتی ئەم بزووتنەوەی دەکۆڵی‌یەوە.

## ژیانەوە (١٩٢٤) – ژیان (١٩٢٦) – ژین (١٩٣٩) - (سلێمانی)

ژیانەوە ڕۆژنامەیێکی هەفتەیی بوو، بە زمانی کوردی و تیپی عەرەبی لەلایەن دەسەڵات بە دەستانی پاش ڕووخاندنی حوکوومەتی خوارووی کوردستان لە سلێمانی بڵاو دەکرایەوە. ژمارە یەکەمی لە ١٨ی ئەیلوولی ساڵی ١٩٢٤ بڵاوکرایەوە، تاکو ساڵی ١٩٢٥ بەردەوام بوو، لە سەرەتای ساڵی ١٩٢٦ ناویان گۆڕی و کردیان بە «ژیان»، ژمارە یەکەمی لە ٢١ی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٢٦ بڵاوکرایەوە. تا ساڵی ١٩٣٤ زمانی شارەوانی شاری سلێمانی بوو. لە پاشانا لە ژمارە (٤٠٦)ەوە مافی چاپ کردنی درایە پیرەمێرد، ئەویش تا ساڵی ١٩٣٨ ژمارەی گەیاندە (٥٥٣) ئیتر میری ڕۆژنامەکەی داخست. لە پاشانا لە ساڵی ١٩٣٩ پیرەمێرد دەستی کردەوە بە دەرکردنی ڕۆژنامەکەی بە ناوی «ژین»، بە ڕاستی ئەم ڕۆژنامەیە بەردەوامی ڕۆژنامەکانی «ژیانەوە» و «ژیان» بوو.

یەکەمین ژمارەی ژین لە ٢٦ی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٣٩ بڵاوکرایەوە، دووا ژمارەی لە پێش کودەتای ڕۆژی ٨ی شوباتی ١٩٦٣ کەوتە دەست خوێندەوارانیەوە.

ڕۆژنامەی ژین لەم ناوەدا و لەو سەردەمەدا تاقە ڕۆژنامەیێکی ئاشکرای کوردی بوو کە سەر بەهیچ ڕێکخراوێک و پارتی‌یێک نەبوو، بڵاوکەرەوەی کە پیرەمێرد بوو مەسەلەی سیاسی و نەتەوایەتی‌ی تیژی ڕۆژانەی باس نەدەکرد، بۆ ئەوەی ڕۆژنامەکەی لە داخستن بپارێزێ و بتوانێ خزمەتی میللەتی کورد بکا.

پیرەمێرد پرۆپاگەندەیێکی باشی ڕۆشنبیری و خوێندەواری و تەنویری‌ی لە سەر لاپەڕەکانی ڕۆژنامەی ژین دا دەکرد. ڕۆژنامەکە ووتاری لە بابەت ژیانی خوێندەواری، پاک و خاوێنی و جووانی‌ی شار بە تایبەتی شاری سلێمانی، جەژنە نەتەوەیی و ئایینی‌یەکان، بە تایبەتی جەژنی نەورۆز و شتی تریش بڵاو دەکردەوە، ڕۆژنامەی ژین بایەخێکی تەواوی بە کچ و ژنی کورد دەدا، هانی دەدان بۆ خوێندن، بۆ زانستی. جێگەیێکی دیاری لە سەر لاپەڕەکانی تەرخان کرد بوو بۆ مێژووی نەتەوەی کورد، بە سەر نیشتمان پەروەری و نوێ خوازی و ئازادی خوازی میللەتی هەڵدەووت، بەڵگەی لە ڕابردووی میللەت وەردەگرت.

ڕۆژنامەی ژین بایەخێکی تەواوی بە ئەدەبیات دەدا، غەزەل و قەسیدەی شاعیرە کلاسیکی و تازەکانی کوردی بڵاو دەکردەوە، ووتار و چیرۆکی لە چاپ دەدا، بەرهەمی

ئەدەبی مـیللی (فـۆلکلۆری) کـوردی بڵاو دەکـردەوە. نووسـەری بنچـینەیی ڕۆژنامـەکـە پیرەمێرد خۆی بوو، بەرهەمێکی زۆری قەڵەمی خۆی تێدا بڵاو دەکردەوە.

گەلێ مەسەلەی پەیدا بوون و پەرەسەندن و گۆڕانی ئەدەبی کوردی تازە لە ژین دا بڵاو دەکرایەوە. پیـرەمێرد تەماشای ڕۆشنبیـری و خوێندەواریی کوردی دەکرد وەکو شـتێکی یەکـانە و پتـەو و سـەربەخۆ، ئەمـە کـارێکی گـرنگ بـوو بۆ دووا ڕۆژی کـورد. پیـرەمـێـرد شـارەزای دیالێکتـەکـانی زمـانی کـوردی بوو، یا بە شـێـوەیێکی تر بایەخی بە ئەدەبیـاتی دیالێکتـەکـان دەدا و لە سـەر لاپەڕەکـانی ژین وەکـو خـۆی یا بە دیالێکتی سلێـمـانی دەیخستە ڕوو.

لە پاش کـۆچی دووایی پیـرەمـێـرد (١٩٥٠)، ڕۆژنامـەی ژین پارێزگـاری ڕەووشت و ڕێڕەوی خـۆی کـرد تا مـاوەیێـک، بەڵام لە تشـرینی دووەمی سـاڵـی **١٩٥٢** بەم لاوە سـەر نووسـەریی ڕۆژنـامـەکـە درایە شـاعـیـری کـورد عـەبدوڵڵا گـۆران. لەگـەڵ هاتنی گـۆران و وەرگرتنی ڕۆژنامەی ژین گۆڕانێکی بنچینەیی بەسەر ڕۆژنامەکەدا هات، ڕۆژنامەی ژین بە ئاشکرا بۆ پارێزەری و چاکـەی کـرێکار (پرۆلـیـتـێـر) و ڕەنجـبـەر و جـووتیـاری عـیـراق قـەڵەمی لە گـەڕ دا بـوو، پرۆپاگـەندەیێکی پان و بەرین و تیـژی دەکـرد لە دژی دەرەبەگی کورد و هێزی کۆنەپەرست لە ناوووڵات و هێزی ئەمپریالیزمی لە گێتی دا. گۆران خۆی یەکێک بوو لە دامەزرێنەرانی ئەنجوومەنی ئاشتی لە عیراق دا. هەمیشە لە خەبات دا بوو لە پێناوی ئاشـتی، ئەمە بە ئاشکرا لە سـەر لاپەڕەکـانی ڕۆژنامەی ژین ڕەنگی دابووەوە. بەڵام لە پاش ساڵێک گۆران ناچار بوو لە ژین دوور بکەوێتەوە و میـراتگرانی پیرەمێرد دەستیان بە سەر ڕۆژنامەکە داگرت و گەڕانەوە دۆخ و سیاسەتی چاپکراوەکە.

ڕێڕەوی ڕۆژنامـەی ژین و هەمـوو ڕۆژنامـە و کـۆوارەکـانی تری کـوردی پێـوەندییێکی بەهێزی لەگـەڵ ژیانی سیـاسـیی ووڵات داهەبوو. هەڵبەز و دابـەزی بزووتنەوەی رزگـاریی نەتەوایەتی و بزووتنەوەی کۆمەڵایەتی - سیاسی کـاری گەورەی دەکردە سەر چاپەمەنیی کوردی. لە پێش بەرپا بوونی شۆڕشی ١٤ی تەمووزی ساڵی **١٩٥٨** لە عیـراق ڕۆژنامەکە هەوڵی دەدا ڕێبازی بێ لایەنی بگرێ لە سیاسەتی ووڵات دا. لەبەر ئەوە بڵاو کەرەوەکانی بە ئاشکرا نەیان دەویست بیروڕای خۆیان دەربڕن لە سەر مەسەلەی سیاسی و نیشتمانی و نەتەوایەتی دا. لە پاش شۆڕش دەست بەجێ ڕۆژنامەکە دیمۆکراتیزمی خۆی جاڕ داو بوو بە زمـانی چاکـەی هەمـوو هێزە شـۆڕشگێـڕەکـانی عـیـراق، بە تایبـەتی ئـیـدیۆلۆجیـەتی دوو

پارتی‌یە بەهێزەکانی ئەو سەردەمەی وولات کۆمۆنیستی عیراق و دیمۆکراتی کوردستانی عیراقی بڵاو دەکردەوە، بە ووردی ڕەچاوی ئەوەی دەکرد کە لەنگەر ڕابگرێ و هیچ لایێک هەست نەکا لایەکەی تر بەشی زیاترە.

لە نیوەی دووەمی ساڵی ١٩٦١ەوە، کە عەبدولکەریم قاسم دەستی کرد بە ڕاونان و ئازار دانی هێزە دیمۆکراتی‌یەکانی وولات و دامو دەزگای میری کەوتە بەربەرەکانی داوا ڕەواکانی میللەتی کورد بۆ مافی نەتەوایەتی، ڕێبازی ڕۆژنامەکە جارێکی تر گۆڕرایەوە و ترس دایگرتەوە و ناچار بوو مێچکە بۆ میری بکا. بەڵام لە ساڵی ١٩٦٣، لە پاش ٨ی شوبات لە ووزەی هیچ ڕۆژنامەیێکی کوردی دا نەبوو بتووانێ بەردەوام بێ، لەبەر ئەوە ژینیش داخراو هیچ ڕۆژنامە و کۆوارێک لە ناوەوە نەما.

## ڕیا تازە (یەریڤان ١٩٣٠)

ڕیا تازە ڕۆژنامەیێکی هەفتەیی‌یە، ئۆرگانی لیژنەی ناوەندی پارتی کۆمۆنیستی ئەرمەنستان و ئەنجوومەنی بەرزی سۆڤیەت و ئەنجومەنی وەزیرانی کۆماری ئەرمەنستانی سۆڤیەتە. لە سەرەتا دا بە زمانی کوردی و تیپی لاتینی لە شاری یەریڤانی پایتەختی ئەرمەنستان دەردەچوو. ژمارە یەکەمی لە ٢٥ی ئازاری ساڵی ١٩٣٠ بڵاوکرایەوە. لە پاش دەرچوون و بڵاو کردنەوەی (٦١٢) ژمارە لە ڕۆژنامەکە ئیتر پەکی کەوت و لەلایەن دەوڵەتەوە داخرا. دووبارە لە ساڵی ١٩٥٥ دەست کرایەوە بە بڵاو کردنەوەی، بەڵام ئەم جارەیان بە ئەلفو بێ‌ی سیریلی. ژمارە یەکەمی دەورەی دووەمی لە ١ی شوباتی ١٩٥٥ بڵاوکرایەوە. لەم ساڵانەی دوایی‌یە هەفتەی بوو بە دوو ژمارە، لە هەموو هەفتەیێک دا لە ڕۆژانی شەموو و چووارشەموو ڕۆژنامەی ڕیا تازە بڵاو دەکرێتەوە. ماوەیێک قاچاغی مراد سەرنووسەری بوو، ئێستا میرۆی ئەسەد سەرنووسەریەتی و عەمەریکی سەرداریش دەوری دیاری لە ڕۆژنامەکەدا هەیە.

ڕۆژنامەی ڕیا تازە لە بنج دا بۆ مەبەسیی بڵاو کردنەوەی بیر و باوەڕی سۆسیالیزمی و ئەنتەرناسیۆنالیزمی لە ناو کۆمەڵانی کوردی یەکێتی‌ی سۆڤیەت دامەزراوە. زیاتر خەڵکی پەروەردە دەکا بۆ کار کردن و بەرهەم هێنان و ناسینی وولاتی سۆڤیەت بە نیشتمانی ڕاستەقینەی ئەو کوردەی لەوێ‌یە. دیارە ژیانی ئابووری و کۆمەڵایەتیش کە وێنەی لە کۆلخۆز و سۆفخۆز دا دەبینین جێگەی دیاری لە سەر لاپەڕەکانی ڕیا تازە دا هەیە. ڕەنگدانەوەی ژیانی ئەدەبی و هونەری و خوێندەواری و ڕۆشنبیری کوردی لە سەر

لاپەڕەکانی ڕیا تازە دەبینرێ. دروشمی بنچینەیی ڕۆژنامەکە لە بارەی ئەدەب و هونەری داهێنانەوە نەک تەنیا بۆ کوردی ئەوێ و ڕیا تازە بەڵکو بۆ هەموو نەتەوەکانی سۆڤیەت و چاپەمەنی‌یەکانی وولات ئەمەیە «بە ڕوخسار نەتەوەیی و بە ناوەرۆک سۆسیالیزمی» واتە ڕیا تازە بە زمانی کوردی کۆمەڵی سۆسیالیزمی دروست دەکا.

## هاوار (شام ١٩٣٢)

کۆواری هاوار لە ناو ڕۆژنامەگەری کوردی دا جێگەیێکی تایبەتی‌ی هەیە بەوەی بایەخێکی دیاری بە مەسەلەی ئەدەبیاتی کوردی و زمانەوانی دەدا. لە ساڵی ١٩٣٢ لە شام لەلایەن جەلادەت بەدرخانەوە دامەزراوە، مانگی دوو جار بە زمانی کوردی و تیپی لاتینی بلاو دەکرایەوە. ژمارە یەکەمی لە ١٥ی مایسی ١٩٣٢ بلاو کراوەتەوە. بلاو کەرەوەکان جەلادەت بەدرخان و کامەران بەدرخان مەبەسی بنچینەیی‌یان لە دەرکردنی کۆوارەکە چەسپاندنی ئەلفو بێ‌ی لاتینی بوو لە ناو خوێندەوار و نەخوێندەواری کوردا. بێ گومان خۆشیان دەورێکی دیاریان هەبوو لە دانانی ئەم ئەلفو بێ‌یە، بە تایبەتی بۆ چاپەمەنی‌یەکانی خۆیان ئەم کۆوارە دەورێکی باڵای هەبوو لە بلاو کردنەوەی ئەلفو بێ‌ی لاتینی ئەوەی لە هەموو ئەلفو بێ‌یێکی تر زیاتر لەگەڵ زمانی کوردی دەگونجێ و پڕ بە پێستیەتی.

کۆواری هاوار دەورێکی دیاری هەبوو لە بلاو بوونەوەی زمانی ئەدەبی کوردی تازە و ڕزگار کردنی زمانی کوردی لە ووشەی ناقۆلای بێگانە. ئەم مەسەلەیە لە سالانی سی‌یەکانەوە کارێکی پێویست بوو و پێوەندی‌یێکی ڕاستەوخۆی بە مەسەلەی خوێندەواری و ڕۆشنبیری‌یەوە هەبوو. ئامانجی کۆوارەکە ئەوە بوو کە زمان و ئەدەب لە زۆربەی خەڵکی کوردەوە نزیک بێ و خەڵکەکە چێژی لێ وەربگرێ. هاوار بە زۆری بەرهەمی شاعیرانی کلاسیکی و هاوچەرخی بە دیالێکتەکانی کرمانجی‌ی سەروو و خوواروو بلاو دەکردەوە. ووتاری نووسەرانی هاوچەرخ و بەرهەمی فۆلکلۆری و لێکۆڵینەوەی لە بابەت ئەدەبی کوردی لە چاپ دەدا، بە شێوەیێکی فراوان چوو بووە ناو لێکۆڵینەوە لە خوێندەواری و ڕۆشنبیری‌ی کوردی بە گشتی.

## گەلاوێژ (بەغدا ١٩٣٩)

گەلاوێژ کۆوارێکی مانگانەی ئەدەبی و کۆمەلایەتی بوو، بە زمانی کوردی و تیپی

عـەرەبی لە بەغـدا بڵاو دەکـرایەوە. لە کـانوونی یەکـەمی سـاڵی ١٩٣٩ یەکـەمین ژمـارەی دەرچوو، تا ئاغستۆسی ساڵی ١٩٤٩ لە ناوەوە بوو، لەو دەمەدا توندوتیژی حوکوومەتی عیراق بەرامبەر بە کورد گەیشت بووە پلەییێک «گەلاوێژ» لە خۆیەوە لە دەرچوون بوەستێ.

ئەم کۆوارە لەلایەن کۆمەڵێک خوێندەوار و ڕۆشنبیری کوردەوە دەردەهێنرا، هەندێکیان سەر بە پارتی و ڕێکخراوی سیاسی‌ی کوردی بوون، بەشێکی تریان بێ لایەن و سەر بە هیچ لایێک نەبوون، کوردایەتی ئەمانەی لە دەوری کۆوارەکە کۆ کرد بووەوە. گەلاوێژ سەر بە بیـر و باوەڕی نوێ خـوازی بوو لە کـۆمـەڵی کـورد دا. هەمـیـشـە هەوڵی دەدا خـۆی لە سانسۆر لابدا، وە بڵاوکەرەوەکانی هەوڵیان دەدا وا پیشان بدەن کە سەر بە هیچ لایێکی سیـاسی نی‌یە. ئیبـراهیم ئەحمەد دامەزرێنەر و خـاوەن ئیـمـتـیـازی کۆواری گـەلاوێژ بوو، عەلائەدین سەجادی سەرنووسەر و دەرهێنەر و بڵاو کەرەوەی بوو.

کۆواری گـەلاوێژ بۆ ئامـانجی ئاڕاسـتـە کردنی لاوانی کـورد ووتاری هەمەجـۆر و ڕەنگاو ڕەنگی بڵاو دەکـردەوە، دەورێکی باڵای هەبوو لە بەهێز کردنی بزووتنەوەی ئەدەبی کوردی لە کـۆمـەڵی کـورد دا. لە هەمـوو ژمـارەییێک دا نموونەی شـیـعـری کـلاسـیکی کـوردی بڵاو دەکردەوە، هەروەها بایەخێکی زۆری بە ئەدەبی پەخشـانی نووسەری کوردی هاوچەرخ دەدا و بەرهەمـیـانی بـڵاو دەکردەوە. جگە لەوە بایەخـێکی زۆری بە ئەدەبی بەرزی نەتەوەکـانی گـێـتـی دەدا. گـەلێ جـار نموونەی ئەدەبی بێگانەی بڵاو دەکـردەوە، لە نـاو ئەمـانەش دا بەرهەمی ئەدەبی نووسەرانی ئەوروپا جێگەی دیاریان هەبوو لەسەر لاپەڕەکانی گەلاوێژ. بێ گـومـان وەرگـێڕانی بەرهەمی بەرزی نووسـەر و شـاعـیـرانی گەورەی ئەوروپا کـارێکی گـەورەی دەکـردە سـەر پەرەسـەندن و گـۆڕانی پەخـشـانی هونەری کـوردی و پتـەو بوونی چیرۆک و ڕۆمانی کوردی.

لە پاش جەنگی دووەمی گێتی گەلاوێژ ڕێڕەوی سیاسی‌ی خۆی ئاشکراتر کرد، ئازایانە لە سەر بیروڕای ئەنتەر ناسیۆنالیزمی دەکردەوە، هەروەها بیروڕای نەتەوایەتی کوردایەتی فەرامۆش نەدەکرد. بایەخی تایبەتی بە ژیان و ئەدەبیاتی یەکێتی‌ی سۆڤیەتی کۆن دەدا چونکە خەڵکی کەمیان لەم بابەتەوە دەزانی. ئەمانە هەمووی بوونە هۆی ئەوەی لە سـاڵی ١٩٤٩ حوکـوومـەتی عـیراق ئـەوەی لە ژێر چاودێری بێگـانەی ئینگلیـز و ئەمـەریکا دەژیا هێرش بباتە سەر هەموو هێزە دیمۆکراتی و نیشتمـانی و نەتەوەیی‌یەکانی عـیراق، لەمەدا شتێکی ئاسایی بوو کە گەلاوێژیش بوەستێ.

## ڕۆناهی (شام ١٩٤١)

ڕۆناهی کۆوارێکی هەفتەیی کۆمەڵایەتی - سیاسی و ئەدەبی و زانیاری بوو،

لە شام بە دوو زمانی کوردی - تیپی لاتینی و زمانی فرەنسی بڵاو دەکرایەوە. یەکەمین ژمارەی کۆواری ڕۆناهی لە ساڵی ١٩٤١ کەوتە دەست خوێندەوارانەوە، هەڵسووڕێنەر و بەڕێوەبەری جەلادەت بەدرخان و کامەران بەدرخان بوون.

کۆواری ڕۆناهی بایەخی تایبەتی بە وولات و نەتەوەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دەدا، لە ناو ئەمانەش دا کورد جێگەی دیاری هەبوو. ڕێبازی سیاسی ڕۆناهی ڕەنگدانەوەی ئیدیۆلۆجیەتی بۆرجوازیی نیشتمانی بچووکی کورد بوو. هەوڵی دەدا سوود لە ئەنجامی جەنگی دووەمی گێتی وەربگرێ لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بۆ ئەوەی مافی نەتەوایەتی کورد دەست بخا. کۆوارەکە کەرەستەیێکی زۆری لە بابەت ڕووداوەکانی جەنگی دووەم بڵاو دەکردەوە، بایەخێکی زۆری بە دەوری سوێندخۆرەکان دەدا، بە تایبەتی دەوری فرەنسا لەم جەنگەدا. زیاتر نموونەی ئەدەبی کوردی تازە و فۆلکلۆری لە سەر لاپەڕەکانی بەدی دەکرا

بڵاو کەرەوەکان هەوڵیان دەدا کەرەستەی کۆوارەکە بە جۆرێک بڵاو بکەنەوە کە هەموو کەسێک تێیان بگا لە ڕووی زمانەوە، لەبەر ئەوە زمانێکی میللیی ساکاریان لە نووسینەکانیانا بەکار دەهێنا.

لە پاش کۆتایی جەنگی دووەم، کۆواری ڕۆناهی هێشتا هەر بەردەوام بوو تا ساڵی ١٩٤٧ کۆتایی هات و داخرا.

## دەنگی گێتیی تازە (بەغدا ١٩٤٣)

دەنگی گێتیی تازە کۆوارێکی مانگانەی کۆمەڵایەتی - سیاسی و ئەدەبی - زمانەوانی بوو. لە مانگی نیسانی ساڵی ١٩٤٣ ژمارە یەکەمی لەلایەن بەشی پێوەندیی گشتیی بالیۆزخانەی بەریتانی دا لە بەغدا بڵاو کرایەوە، بە زمانی کوردی و تیپی عەرەبی چاپ دەکرا، هەوڵی مەشقێکی کەمیش دەدرا بۆ نووسینی هەندێ تێکستی کوردی بە تیپی لاتینی.

لە ڕاستی دا کۆواری دەنگی گێتیی تازە زمانی دەوڵەتە سوێندخۆرەکان بوو ئەوانەی لە جەنگ دا بوون لە دژی فاشیزم، بە گشتی هەواڵ و دەنگوباسی سیاسی و جەنگی گێتیی بڵاو دەکردەوە، وە بە هۆی ئەوەی لەلایەن ئینگلیزەوە بڵاو دەکرایەوە دیاربوو زیاتر

بایەخی بە دەوری بەریتانیا دەدا لە جەنگی گێتی دژ بە ئەڵەمانیای هیتلەری.

ئەوەی پێویستە لێرەدا بووترێ ئەوەیە تۆمار کردنی ڕووداوی جەنگی و سیاسی و بڵاو کردنەوەی دوکومێنتی دیبلۆماسی لە سەر لاپەڕەکانی ئەم کۆوارە بووە هۆی گۆڕران و دەوڵەمەند بوونی زمانی کوردی بە تایبەتی لە ڕووی لێکسیکۆن و زاراوەی جەنگی و سیاسی و دیبلۆماسییەوە.

سەر نووسەری کۆوار تۆفیق وەهبی بوو، یەکێ لە نووسەرە هەرە دیارەکانی حوسێن حوزنیی موکریانی بوو. یەکەمیان وەکو پسپۆری زمانەوانی و مێژوو نووس، دووەمیان وەکو ڕۆژنامەنووس و مێژوو نووسێک جێ پەنجەیان لە سەر لاپەڕەکانی بڵاو کەرەوەکە دیار بوو. ئەم کۆوارە بە شێوەیێکی فراوان بایەخی دەدایە مەسەلەی پێشکەوتنی خوێندەواری و ڕۆشنبیری کوردی، هەروەها بڵاو کردنەوەی خوێندەواری لە ناو خەڵکی کورد دا. ئەدەبی نووسراوی کلاسیکی جێگەیێکی دیاری هەبوو لە سەر لاپەڕەکانیدا، بەرهەمی کلاسیکیی ئەدەبی کوردی و ئەدەبی تازەو ووتاری ئەدەبی و هونەری و فۆلکلۆر و وەرگێڕان لە عەرەبی و فارسی و زمانەکانی ئەوروپا بە ڕێکوپێکی جێگەی خۆیان لە سەر لاپەڕەکانیدا دەدۆزیەوە. کۆواری دەنگی گێتیی تازە کەرەستەی ئەتنۆگرافیشی بڵاو دەکردەوە، بە تایبەتی تێبینی و بیرەوەریی گەڕۆکەکانی ئینگلیز و زانا و ڕۆژهەڵاتناسەکانی تر لە بابەت کوردەوە. گەورەترین پرسیش بە لای ئەم کۆوارەوە گفتوگۆ و دووان و وەرام دانەوە لە بابەت زمانی ئەدەبی یەکگرتووی کوردی و زمانی پەتیی کوردییەوە بوو.

لە پاش کۆتایی جەنگی دووەمی گێتی مافی بڵاو کردنەوەی کۆواری دەنگی گێتیی تازە درایە پارێزەری کورد فایق تۆفیق. ئیتر لە پاش ئەمە دەنگی گێتیی تازە هەندێ جار لە قەوارەی کۆوار و هەندێ جاری تریش بە شێوەی ڕۆژنامە بڵاو دەکرایەوە، ژمارەی لاپەڕەکانیشی لە چاو جاران کەمتر بوو بووەوە. لەم سەردەمەی ژیانی دا کۆوارەکە بایەخێکی زۆری بە ئەدەبی کوردی دەدا بە تایبەتی بەرهەمی دیالێکتی گۆرانیی زمانی کوردی. دیارترین نووسەری کۆواری دەنگی گێتیی تازە لەم ماوەیەدا جەمیل بەندیی ڕۆژبەیانی بوو، هەواڵ و ووتاری لە سەر شیعر و شاعیرانی دیالێکتی گۆرانی بڵاو دەکردەوە. لە ساڵی ١٩٤٧ کۆواری دەنگی گێتیی تازە پەکی کەوت و داخرا.

## نیشتمان (مەهاباد ١٩٤٣)

نیشتمان کۆوارێکی مانگانەی کۆمەڵایەتی و ئەدەبی و خوێندەواری کوردی بوو، لە مەهاباد لەلایەن کۆمەڵەی «ژ. ک.»ەوە چاپ و بڵاو دەکرایەوە.

ژمارە یەکەمی لە مانگی تەمووزی ساڵی ١٩٤٣ بڵاو کرایەوە. کۆمەڵێک شاعیر و نووسەر و هەڵکەوتووی لاوی کورد کە ئەندامی کۆمەڵەی «ژ. ک.» بوون لە دەوری ئەم کۆوارەدا کۆ بوو بوونەوە. زیاتر کۆوارەکە بایەخی بە ئەدەبی کوردی دەدا و تەماشای مەسەلەی کوردی وەک مەسەلەی میللەتێک دەکرد. لەبەر ئەوە بایەخێکی زۆری بە کوردی دەرەوەی ئێران دەدا و باس و هەواڵی شاعیران و ڕۆشنبیرانی کوردی دەرەوەی ئێرانی بڵاو دەکردەوە. بەرهەمی ئەدەبی‌یانی چاپ دەکرد و هەندێ جار ئەگەر چاپکراوێکی دەرەوەی دەست بکەوتایە بۆ سوودی گشتی دووبارە چاپی دەکردەوە.

ئەم کۆوارە دەورێکی گرنگی گێڕا لە پەروەردە کردنی لاوی کورد و ئاراستە کردنی بۆ ڕێی ڕاستی و باوەڕ کردن بە ناوەڕۆکی دیمۆکراتی و خەبات کردن بۆ دامەزراندنی کۆمەڵێکی سەربەست و بەختیار. ئەم کۆوارە وەکو هەموو ڕۆژنامە و کۆوارەکانی تری کوردی تەمەنی درێژ نەبوو، تەنیا نۆ ژمارەی لێ بڵاو کرایەوە و لە ساڵی ١٩٤٥ پەکی کەوت.

## کوردستان (مەهاباد ١٩٤٦)

کوردستان ڕۆژنامەیێکی سیاسی - کۆمەڵایەتی - ئەدەبی بوو، ئۆرگانی حیزبی دیمۆکراتی کوردستانی ئێران بوو. بە زمانی کوردی و تیپی عەرەبی لە مەهاباد لەلایەن حوکوومەتی کۆماری کوردستان بڵاو دەکرایەوە. ژمارە یەکەمی لە ڕۆژی ١١ی کانوونی دووەمی ١٩٤٦ دەرچووە، ١١٣ ژمارەی لێ بڵاو کرایەوە، لە پاش دامرکاندنەوەی هەڵسانی کورد لە ئێران و ڕووخاندنی کۆماری کوردستان لە ساڵی ١٩٤٧ ڕۆژنامەی کوردستان بووە ئۆرگانی نهێنیی حیزبی دیمۆکراتی کوردستان.

لە ساڵی ١٩٤٧ بەم لاوە بە هۆی یەکخستنی هەوڵ و کۆششی سیاسیی نیشتمان پەروەرە ئاوارەکانی کورد و ئازربایجانی‌یانی ئێرانی تووانی‌یان لە دەرەوەی نیشتمان (باکۆ) ڕۆژنامەی کوردستان دووبارە بژیێننەوە. بەم جۆرە ڕۆژنامەی «کوردستان - ئازربایجان»یان دامەزراند. بەشی «کوردستان» بە زمانی کوردی و تیپی عەرەبی و بەشی «ئازربایجان» بە زمانی ئازربایجانی و تیپی عەرەبی چاپ دەکران. یەکەمین ژمارەی ئەم ڕۆژنامەیە لە ڕۆژی ٦ی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٤٧ بڵاو کرایەوە، بە هەمووی لە

وولاتی ئاوارەیی ١٣٣٧ ژمارەی لێ بڵاو کرایەوە.

ڕۆژنامەی «کوردستان - ئازربایجان» یەکێ لە ڕۆژنامە هەرە گرنگەکانی سیاسی بوو لە ژیانی ڕۆشنبیریی کوردی دا. ئاگاو ڕووداوی لە بابەت هەواڵی سیاسی و ڕۆشنبیری بڵاو دەکردەوە لە هەموو ناوچەکانی کوردستان. سیاسەتی ناهەمواری ئەمپریالیزمی بێگانەی دەخستە ڕوو لە بابەت هەموو وولاتەکانی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستەوە، پیلانە نهێنی‌یەکانی تورکیا و ئێران و عیراقی لە سەر لاپەڕەکانی ئاشکرا و ڕیسوا دەکرد. بێگومان کردەوەکانی پەیمانی بەغدا زیاتر لە دژی بزووتنەوەی ڕزگاریی نەتەوایەتی‌ی کورد بوو. ئەم ڕۆژنامەیە بایەخی بە کەرەستەی ئەدەبیش دەدا، بۆ ئەم ئامانجە شیعر و چیرۆک و هونەرەکانی تری ئەدەبی لە سەر لاپەڕەکانی دا دەبینران.

ڕۆژنامەی «کوردستان - ئازربایجان» لە مانگی مارتی ١٩٦١ لە دەرچوون وەستا، داخستنی ڕۆژنامەکە هێنانەدی بڕیارێک بوو کە ساڵی پێشتر لە کۆنفرانسی نێوان سێ پارتی‌یە سیاسی‌یەکانی ئێران درابوو، لەم کۆنفراسەدا پارتی دیمۆکراتی ئازربایجانی ئێران هەڵوەشێنرا بووەوەو تێکەڵ بە پارتی توودە کرا بوو. ئیتر کار بە دەست و دەسەڵاتدارانی پارتی کۆمۆنیستی ئازربایجانی سۆڤیەت ئامادە نەبوون یارمەتی‌ی پەنابەرە سیاسی‌یەکانی کوردی ئێران بدەن بۆ ئەوەی بە تەنیا ڕۆژنامەی کوردستان دەربکەن.

## هیوا (بەغدا ١٩٥٧)

هیوا کۆوارێکی مانگانەی ئەدەبی کۆمەلایەتی بوو، ئۆرگانی «یانەی سەرکەوتنی کوردان» بوو، بە زمانی کوردی و تیپی عەرەبی لە بەغدا بلاودەکرایەوە. ژمارە یەکەمی لە مانگی تەمووزی ساڵی ١٩٥٧ بلاوکرایەوە. بڵاو کەرەوەکانی ئەم کۆوارە لە سەرەتادا نوێنەری ئەو کوردە نیشتمان پەروەرانە بوون کە لە میری‌یەوە نزیک بوون ئەندامی پەرلەمانی عیراق بوون. بەڵام هیوا لە ڕووی سیاسی‌یەوە دوورە پەرێز بوو، تەنیا دەستی بۆ مەسەلەی ئەدەبی و خوێندەواری و ڕۆشنبیری گشتی درێژ دەکرد. بڵاو کەرەوەکان دەیانویست لاسایی کۆواری گەلاوێژی ناودار بکەنەوە، بۆ مەبەسی بڵاو کردنەوەی ئەدەب و رۆشنبیری‌ی کوردی.

لە پاش شۆرشی ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨ی عیراق، کۆوارەکە کەوتە دەست ڕۆشنبیر و خوێندەواری کوردی پێشکەوتن خواز، ئیتر بوو بە زمانی خەباتی نەتەوەکانی کورد و عەرەب لە پێناوی دیمۆکراتی و پێشکەوتنی کۆمەلایەتی. بەرهەمی کۆواری هیوا ٣٦

ژماره بوو، له سەرەتای دامەزراندنییەوە گەلێ خوێندەوار و ڕۆشنبیری کورد بە بڕیاری دەستەی بەڕێوەبەری یانەی سەرکەوتنی کوردان سەرپەرشتی دەرهێنان و کاریان تێدا کردووە، لەمانە: حافز مستەفا قازی، هاشم دۆغرەمەچی، موکەڕەم تاڵەبانی، کەریم زانستی، کامیل ژیر و محەمەدی مەلا کەریم.

کە هێزە دیمۆکراتی و نەتەوەیی و پێشکەوتن خوازەکان لە ساڵی ١٩٦١ کەوتنە لێژییەوە و تیرۆری عەبدولکەریم قاسم هەموو سووچێکی وڵاتی گرتەوە ترس باڵی بە سەر گۆواری هیوا داکێشا. ئازاد نەبوو لە بڵاو کردنەوەی هەموو بیر و باوەڕێک، بە ڕێکوپێکی دەرنەدەچوو، تا وای لێ هات ساڵی ژمارەیێکی بۆ دەر نەکرێ و لە دووایی دا لەگەڵ ٨ی شوباتی ١٩٦٣ بە یەکجاری ئاوا بوو و کۆتایی هات.

## شەفەق (کەرکووک ١٩٥٨)

شەفەق کۆوارێکی مانگانەی ئەدەبی - ڕەخنەیی بوو، لە مانگی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٥٨ لە کەرکووک دامەزرێنرا بە زمانی کوردی و عەرەبی لەلایەن کۆمەڵێک ڕۆشنبیری پێشکەوتن خوازی کوردەوە بڵاو دەکرایەوە، ئەمانە ئیبراهیم ئەحمەد و مارف بەرزنجی و حوسێن بەرزنجی و عەبدولسەمەد خانەقا و عەبدولعەزیز خانەقا و عومەر عارف و کەمالی باپیر ئاغا و نووسەری ئەم کتێبە بوون، بڵاو کەرەوە و خاوەنی ڕەسمی «شەفەق» عەقیدی خانەنشین شێخ عەبدولقادری بەرزنجی بوو، دەبێ ئەوەش لە یاد نەکەین کە حوسێن بەرزنجی و عەبدولعەزیز خانەقا ماوەیێکی کەم لە کۆوارەکەدا کاریان کرد و زوو خۆیان کشاندەوە.

خاسیەتی هەرە دیاری ئەم کۆوارە ئەوە بوو کە بایەخێکی زۆری بە لێکۆڵینەوەی ئەدەبی دەدا، بەلایەوە ڕەخنە و هونەری پەخشان لە شیعر گرنگترە، ئەمە دروشمێکی زۆر ڕاست بوو و لە داخوازییەکانی ئەو سەردەمەوە هەڵقوڵا بوو. جگە لەمە ئازایانە داوای ڕێکخراو و یەکێتیی نووسەرانی کوردی دەکرد، لە ماوەی ئەو شەش مانگەی تەمەنی کە بەر پێش شۆڕشی ١٤ی تەمووزی ساڵی ١٩٥٨ کەوت پیرۆزبایی مەلیکی نەکرد لە جەژنەکانی بنەماڵەی هاشمی. شەفەق بە ڕێکوپێکی بەرهەمی تازەی شاعیر و نووسەرانی کوردی بڵاو دەکردەوە، بە تایبەتی چیرۆکی تازەی کوردی سەرپشک بوو بۆ بڵاو کردنەوە لە سەر لاپەڕەکانی چونکە چیرۆک لە سەرووی بەرنامەی کۆوارەکە دا بوو. بۆ ئەم مەبەسە گرەوی دادەنا و پاداشی دەدایە چیرۆک نووسە سەرکەوتووەکان و چیرۆکە هەڵبژاردەکانی بڵاو دەکردەوە.

کۆواری شەفەق دەورێکی دیاری هەبوو لە پەرەسەندن و گۆڕران و بڵاو بوونەوەی ئەدەبی کوردی تازە.

لە پاش شـۆڕشی ١٤ ی تەمـووزی ١٩٥٨ کـۆوارەکـە بوو بە کـۆوارێکی سـیـاسی - کۆمەڵایەتی. لە ساڵی ١٩٦١ کۆواری شەفەق گوێزرایەوە سلێمانی.

* * *

ژیانی کـۆمـەڵایەتی - سـیـاسیی تایبـەتی کـورد بووە هۆی ئەوەی ڕۆژنامـەگـەری دیاردەییێکی گـرنگ بێ لە کـۆمـەڵی کـوردەواری دا. ڕۆژنامـە و کـۆواری کـوردی خـزمـەتی خوێندەوارییان دەکرد، واتە لە باتی کـتـێب و قـوتابخـانە بوون. ئەوەی پێویسـتـە بووترێ ئەوەیە کە منداڵی کورد بە زمانی زگماکی خۆی نەیدەخوێند، تەنیا لە هەندێ قوتابخانە لە عـیـراقـا نەبێ، لەوێش دا تەنیـا چەند وانەییێک بە کـوردی دەخـوێندرا یا هەفـتـەی دوو سەعات بۆ زمانی کوردی تەرخان دەکرا.

لەبەر گرنگی ڕۆژنامـەگەری بۆ کورد بڵاو کەرەوەکان بە پێویستییان دەزانی کە بایەخ بە ئەدەبیـات بدەن، زۆربەی هەرە زۆری سـەرچاوە بۆ بڵاو کـردنەوەی بەرهەمی ئەدەبی ئەو دەسنووس و بەیازانە بوون کـە هێـشـتـا بڵاو نەکـرابوونەوە، لێـرەدا بایەخـێکی زۆر بە بەرهەمی شاعیرە کلاسیکییە گەورەکانی کورد دەدرا.

هەروەها لاپەڕەکانی ڕۆژنامەگەری کوردی بوو بە مەیدان بۆ مەشقی نووسەر و شاعیرانی هاوچەرخ، بەرهەمی شیـعـر و پەخشـان و ووتاری ڕەخنەی کۆمـەڵایەتی و ئەدەبییان تێدا بڵاو دەکردەوە، بزووتنەوەی ئەدەبی کوردی تازە جـێگەی دیاری هەبوو. کـۆوار ورۆژنامەی کوردی یەکـەمین سەرچاوە بوو بۆ خوێندەواری کـورد بۆ ئەوەی شـارەزایی لە بـابەت ئەدەبی بێگانەوە پەیدا بکا، لە سـەرەتا دا بەرهەمی نووسـەرانی ئەورووپایان وەردەگـێـڕایە سـەر زمـانی کـوردی لە ڕێگەی زمـانی تورکییەوە، لە پاشانا یەکـسەر لە زمـانی بەرهەمەکـان خۆیانەوە. شـارەزایی پەیدا کردن لە ئەدەبی ئەورووپی کارێکی یەکجار گەورە بوو لە ژیانی خوێندەواری و ڕۆشنبیـری لە کۆمەڵی کـورد دا، چونکە دەبووە هۆی بزووتنەوە و گۆڕڕانی زمانی ئەدەبی و ئاسۆی بیری خوێندەواری کوردی فراوانتر دەکرد و فـێری شێوە و هونەر و بابەتەکانی ئەدەبی کۆن و تازەی ئەورووپی دەکرد.

دیارە دەوری کۆوار و ڕۆژنامەی کوردی لە ژیانی کۆمەڵایەتی دا زۆر گرنگ بوو، چونکە ڕەنگدانەوەی ئامانجی نەتەوەی کورد بوو بۆ سەربەستی و سەربەخۆیی.

# بەشی حەوتەم
# سەرەتاکانی ئەدەب
# و
# ئەدەبی گێتیی کۆن

لە سەرەتا دا ئەدەب تەنیا بەرهەمی شیعری بوو، هەر لەو کاتەش دا شیعر یا هونەر هەستی ناوەوەی ئادەمزادە بەرامبەر بە سروشت، ئادەمزاد بەشێکە لە سروشت، بوون و نەبوونی سروشت ئادەمزاد دیاری دەکا. شیعر شەپۆلێکی نهێنیی گیانی‌یە، کزە باییێک یا خورپەییێک لە مێشکەوە هەڵی دەقولێنێ و لە پێچ و پەنای دڵ و دەروون شنە دەکا؛ شیعر بینینی تایبەتی‌ی وێنەی «بوون»ە چاوی شاعیر هەستی پێ دەکا. ئەمە رووداوە، رووداویش لە جێگە و کات پەیدا دەبێ. لە پاشانا لە جێگەو کات دەچێتە دەرێ و دەبێ بە بوونێکی هەمیشەیی (مطلق) و هەرو هەر بە کار دەهێنرێ و کۆن نابێ و لە کەڵکیش ناکەوێ. بەم پێ‌یە شیعر «هەست»ە و «ووشە» نی‌یە.

شیعر هەست کردن بە جووانی‌یە، دروست کردنی جووانیش لەگەڵ پەیدا بوونی ئادەمزاد لە سەر رووی زەوی کەوتۆتە ناوەوە و بووە بە بەشێک لە بوونی گەلێ میلیۆن ساڵ ئەم دیاردەیە لە ناوەوە بووە، بێ ئەوەی ئادەمزاد رێگەییێک یا کەرەستەییێک بدۆزێتەوە بۆ تۆمار کردنی. ئەمە هەمووی ئەو دەورو سەردەمە دوور و درێژەیە، لە رۆژانی پەیدا بوونی ئادەمزادەوە تا رۆژگاری داهێنانی کەرەستەی تۆمار کردن، ئەو رۆژگارە گەورەترین جەژنی مەدەنیەتی ئادەمزاد بوو، دروشم و نیگار و شکڵی ئەندازیاری بوو بە وێنەی «دەنگی قسە»، لە پاشانا ناویان نا «تیپ»، ئەو رۆژگارە دوور و درێژە «پێش مێژوو»ی پێ دەڵێن.

بەم پێ‌یە مێژووی داهێنانی ئادەمزاد لە هەموو سووچێکی ژیان دا دەکرێ بە دوو بەشەوە:

(١) داهێنانی پێش مێژوو.

(٢) داهێنانی پاش مێژوو.

## داهێنانی پێش مێژوو

پێش مێژوو ئەو رۆژگارە دوور و درێژەیە کە ماوەییێکی یەکجار فراوان دەخاییێنێ لە مێژووی پەیدا بوونی ئادەمزاد لە سەر رووی زەوی، ئەمە لەو رۆژگارەوە دەست پێ دەکا کە

ئادەمزاد خۆی لە سەر ئەم ئەستێرەیە دیوە تا ئەو سەردەمەی کەرەستەی تۆمار کردنی بیر و هەستی داهێناوە.

بە مەزەندە و تاقی کردنەوە دەتووانین هەست بە ژیانی گیانیی ئادەمزادی ئەو ڕۆژگارانە بکەین و لە سەردەمی ئێستامان دا دەری برین، چونکە هیچ هەواڵێکی ئەو دەورە تۆمار نەکراوە لەبەر نەبوونی کەرەستەی تۆمار کردن. بەم پێیە وەکو دەردەکەوێ ئادەمزاد تاقی کردنەوەییێکی یەکجار پان و بەرینی بووە، ڕاستە تەمەنی داهاتنی «وێنەی بۆ تۆمار کردن» لە پێنج هەزار ساڵ کەمتر و لە شەش هەزار ساڵ زیاتر نییە، وە ئەم ماوەیە لە ڕووی پێشکەوتنەوە شایانی ئادەمزادی بلیمەت و بە تووانایە، بەڵام دیارە ئەو سیو شەش هەزار ساڵەی کە لە ئادەمزادی نیاندرتاڵەوە دەست پێ دەکا تا سەرەتای پەیدا بوونی وێنە و بەڵگەی تۆمار کردنی «مانای شت» و «دەنگی قسە» کە لە ساڵی ٣٦٠٠ی پێش مەسیح دا هاتووە، دەڵێین ماوەی ئەو سی و شەش هەزار ساڵە سەردەمی مەشقێکی یەکجار قووڵ و بەرز و پڕ لە تاقی کردنەوەیە، بە میرات لە نەوەییێک بۆ نەوەییێکی تر ماوەتەوە بەبێ ئەوەی تۆمار بکرێ.

ئیتر زیاتر لە پێنج هەزار ساڵ پێش ئێستا کە ئادەمزاد لە پلەییێکی بەرزی زانستی دابووە، نەک بە بەڵگەی ئەو پاشماوەیەی ئەرکیۆلۆجی (آثار) بۆمانی دەگێڕێتەوە، بەڵکو بەوەی کە ئەلفو بێی داهێناوە بۆ تۆمار کردن.

بێ گومان داهێنانی ئەلفو بێ لووتکەی پێشکەوتن و گۆڕران و پەیدا بوونی مەدەنیەتی نوێ بووە.

ئەگەر بەشێکی مێشکی ئادەمزاد بیر و هۆش و عەقل بوو بێ و هەمیشە بۆ چاک کردنی باری ژیان و گوزەران بەکاری هێنابێ، بە تایبەتی دژی سروشت بۆ سوود وەرگرتن لێی، بەشەکەی تری هەست و نەست و دەروون بووە، ئەمە شاعیرێکی بەرزی لێ دروست کردووە. لەو ڕۆژەوە کە مێیینە و نێرینە بۆنی یەکترییان کردووە و هەر یەکەیان بوە بە تەواوکەری ئەویتریان، دڵداریی یەکەم دروست بووە. ئەم دڵدارییە لە ناو خۆشی و ناخۆشیی ژیان تەواوەتەوە. ئینجا هەست کردن بە جوانیی سروشت هاتۆتە ناوەوە: شەوی تاریک و ئاسمان و ئەستێرەکانی، ڕۆژهەڵاتن و ڕۆژئاوا بوون لە لووتکەی شاخ و ئاسۆی بیابان و زەریاو ئۆقیانووسەکانەوە، مانگ و ڕۆژ، شاخ و کێو و هەردو دەشت و دەر، ئەشکەوت و دۆڵ و دارستان، جۆگەلە و زێ و ڕووبار و قەڵبەز و سولاوکە، بەفرو

باران، بروسکه و هەورەتریشقە و تۆفان و بوومەلەرزە و بورکان، ڕۆژ و مانگ گیران...
ڕەنگە شیعر لە یەکەم بینینی جوانی ئادەمزاد و گوڵ دروست بوو بێ، ئادەمزاد کە چاوی بە جووانیی ئادەمزاد (بە تایبەتی مێیینە) و گوڵ کەوتووە خورپە لە دڵی هەڵساوە و بزە لە سەر لێوی نیشتووە، ئەمە یەکەمین شیعری تۆمار نەکراو بووە، چونکە لە بنەڕەت دا شیعر هەستە پێش ئەوەی ووشە و قسە بێ.

ئەگەر ئادەمزاد هەر لەو ڕۆژەی کە هەستی کردووە و خۆی ناسیوە شاعیر نەبوو بێ، لەگەڵ سروشتی دروست بوونی ڕێک ناکەوێ، چونکە ئادەمزاد بەبێ هەست ئادەمزاد نییە هەر لەبەر ئەوەشە ئەو تاقی کردنەوە دوور و درێژە بۆتە هۆی ئەوەی توانایێکی تەواوی هەبێ بۆ داهێنان و بەرهەمی نایابی دەوری کۆن تۆمار بکا، لە وولاتانی میزۆپۆتامیا (عیراق)، میسر، هیندستان و چین ئەدەبێکی بەرز بێنێتە کایەوە.

## داهێنانی پاش مێژوو

داهێنانی پاش مێژوو کە بە ڕاستی دەتووانین ناوی بنێین «ئەدەبی ئەنتیکی» یا «ئەدەبی گێتیی کۆن» ئەو ئەدەبەیە کە تۆمار کراوە، واتە ئەو داهێنانەی لە پاش پەیدا بوونی کەرەستەی تۆمار کردن کەوتۆتە ناوەوە تا دەوروبەری بڵاو بوونەوەی ئایینی ئیسلام. ئەدەبی ئەنتیکی بە زمان و دیالێکتی جیاوازی هۆز و میللەت و نەتەوەکانی ئەو سەردەمانە پەیدابووە، هەر لە سەردەمی سەرهەڵدانی کەرەستەی تۆمارکردن لە دەوروبەری ئیسلام گەلێ زمان و دیالێکتی زمان لە ڕۆژگارێک سەردەمێکی تردا دووایییان هات و ڕێگەیان بۆ زمان و دیالێکتی زمانی تر خۆش کرد و بەرهەم بەم زمانانەش کەوتنە ناوەوە، ئەمانەش دووایییان هات و زمان و دیالێکتی زمانی تر کەوتنە ناوەوە.

ئەم بەرهەمە کۆنانە بە زمانی سەردەمی خۆیان تۆمار کران و ئێستا باویان نەماوە و بوون بە سامانی مێژوو و بە میرات بۆ خەڵکی هەموو ئەو زمان و دیالێکتانە مانەوە کە لە بنج دا لەوانەوە لە دایک بوون. ئەمە هەموو زمانە ئەنتیکە کۆنەکان دەگرێتەوە ئەوانەی لەکار کەوتن.

بێ گومان دەسکەوتی ئەدەبی کۆن بە سامانی هەموو ئادەمزاد دەژمێررێ، بە تایبەتی کتێبە ئایینییەکان بە تێکڕایی ئەوانەی بە زمانێک نووسراونەتەوە و ئێستا لەکار کەوتوون (ڤیدای سانسکریتی و ئاڤێستای زمانی ئاڤێستایی) یا ئەوانەی زمانەکانیان زیندووە و تائێستا ماونەتەوە (تەورات و ئینجیل و قورئان).

ئەوەی پێویستە لێرەدا بووترێ ئەوەیە کە قورئان دیاردەیێکی تایبەتی‌یە لە بیری ئادەمزاد دا، ئەم کتێبە لەگەڵ شیعری عەرەبی کە دووسەد ساڵێک پێش ئەو پەیدا بووە، زمانی عەرەبی دەکەن بە کۆنترین زمانێکی سەر ڕووی زەوی کە بە زیندوویی مابێتەوە و گۆڕرانی بە سەرا تێپەڕی بێ و بەرزترین نموونەی قسەی جووانی پێ نووسرابێتەوە.

بیر کردنەوە و دۆزینەوەی ڕاستی و داهێنانی هونەری و ئەدەبی یەکێکە لە نزیکترین خاسیەتێکی کە هەموو ئادەمزاد وەکو دیاردەیێکی وەک یەکی دەخاتە ڕوو. بەم جۆرە داهێنانی شاعیر لە هەموو جێگە و دەور و ڕۆژگارێک دا ڕاستە داهێنانێکە بۆ ئەو نەتەوەیەی کە بە زمانەکەی نووسراوەتەوە، بەڵام هەر لەو کاتە دا بۆ هەموو مرۆڤایەتی‌یە. بە تایبەتی بەرهەمی ئەدەبی کۆن ئەوانەی زمانەکەیان نەماوون، بێ گومان دەبن بە سامانی ئەو زمانە تازانەی لە زمانە کۆنەکان دا لە دایک بوون.

ئەدەبی پاش مێژوو دەکەین بە دوو بەشەوە:

(١) ئەدەبی ئەرکیۆلۆجی

(٢) ئەدەبی تۆمار کراو بە تیپەکانی ئەلفو بێ.

## (١) ئەدەبی ئەرکیۆلۆجی

ئەدەبی ئەرکیۆلۆجی ئەو ئەدەبەیە کە بە وێنە و ڕەمز و نەقش و دروشم تۆمار کراوە، وەکو نووسینە هەرە کۆنەکانی سۆمەری و ئیلامی و خەتی بزماری بابلی و ئاشووری و هیروگلیفی میسر و دروشمەکانی زمانی چینی و تیپەکانی سانسکریتی...

بێ گومان گەورەترین داهێنانی ئادەمزاد دۆزینەوەی وێنە (شکل) بوو بۆ تۆمار کردنی شت، ئەمە پێش مێژووی لە پاش مێژوو جیا کردەوە.

کۆنترین تۆمار یا نووسینی هیروگلیفی لە وولاتی سۆمەرەوە ماوەتەوە، ئەم نووسینە بریتی‌یە لە وێنە، وەکو وێنەی باڵندە مانای باڵندە دەگەیێنێ، وێنەی ئادەمزاد مانای ئادەمزاد دەنوێنێ، دیارە ئەم کردەوەیە ئەگەر چی بۆ مەبەسێکی دیاری کراو بوو بەڵام بەهۆی گڵی برژاوەوە بۆ دووا ڕۆژ پارێزرا، بەم جۆرە بوو بە دەست ڕەنگینی‌یێک هاوشانی نەقش و وێنە و نیگاری سەر گڵی برژاو بوو.

لە دەوروبەری ٣٦٠٠ ساڵ پێش مەسیح، لە خاکی وولاتانی سۆمەر و ئیلام و میسر لە ئەنجامی گۆڕرانی هەموو ئەو نەقشانەی بۆ مەبەسی مانا بەکار هێنرا بوون کۆمەڵێک وێنە

کەوتە ناوەوە، ئەمە ڕەنگدانەوەی ئەو بیر و ڕایانە بوو کە لە مێشکی ئادەمزادی ئەو سەردەمە بوون، ئەم کۆمەڵە وێنانەیان ناونا «نووسینی هیروگلیفی» ئەمە لە وڵاتی میسر لەساڵی ۳۰۰۰ی پێش مەسیح کەوتە پۆپە و ئەوپەڕی پێشکەوتن. گەلێ پاشماوەی هونەر و ئەدەبی هەموو گێتیی پێ نووسراوەتەوە.

## ١- ئەدەبی سۆمەری

کۆنترین شیعرێک کە مێژوو ئاگاداری بێ، ئەو شیعرەیە کە نزیکەی ۲۹۰۰ ساڵ پێش مەسیح شاعیری سۆمەری «دینجیری دامو» بۆ «ئینتیهاب»ی خواژنی لیگش دەلاوێنێتەوە و دەڵێ:

داخی گران! گیانم دەتوێتەوە لە حەژمەت شار و گەنجینەکان.
داخی گران! گیانم دەتوێتەوە لە حەژمەت شارەکەم جەرسو
(لیگش) و گەنجینەکان
منداڵان لە جەرسوی پیرۆز لە ژیانی هەژاری دان
داگیرکەر گەیشتە ئارامگای هەرە مەزن
قەرالیچە گەورەکەی لە پەرستگایەوە دەرهێنا
ئەی گەورە ژنی شاری وەک بیابان و پڕ ترس
کەی دەگەڕێتەوە!

ئاهێکی بە کوڵ لە دەروونێکی بێ گەرد و پاکەوە هەڵقوڵاوە، شاعیر چاوەڕووانی بەختیاریی لە دەست چوو دەکا. لە پاش هەموو رووخانێک بنیاد نانێک هەیە، شاعیر بە تەمای گەڕانەوەی خوا ژنە، بەڵام نازانێ کەی دەگەڕێتەوە!

### ئێپۆسی گلگامیش

هەندێ تاتە بەردی ئەرکیۆلۆجی کەوتۆتە ناوەوە سەردەمی پەیدا بوونیان دەگەڕێتەوە بۆ ۲۵۰۰ ساڵ پێش مەسیح. کۆمەڵێک ئێپۆس (مەلحەمە) و ئەفسانە لە بابەت کار و کردەوەی شاهە کۆنەکان و قسەی نەستەق و نوێژ و سکاڵا و پاڕانەوەی ئایینییان لە سەر تۆمار کراوە. ئەوەی شایانی باسە ئەوەیە کە خاوەنی ئەم بەرهەمانە نەناسراوون. یەکێ لە بەرهەمە ئەدەبییە هەرە گرنگەکانی ئادەمزادی کۆن ئێپۆسی «گلگامیش»ە. ئەم ئێپۆسە باس لە بەسەر هاتی قارەمانی سۆمەری گلگامیش و هاوڕێی ئەنکیدو Enkidu دەکا. تەواوی تێکستی تۆمار کراوی ئەم ئێپۆسە لە سەر تاتە بەرد لە نامەخانەی ئاشوور

بانیپال (٦٦٨ - ٦٢٧ پێش مەسیح) لە نینەوا دۆزراوەتەوە. تێکستی گلگامیش بریتی‌یە لە دووازدە پارچە، هەر پارچەی ٣٠٠ دێڕە شیعرە و لە سەر تاتە بەردێک تۆمار کراوە.

گلگامیش ئێپۆسیکی لیریکی (گۆرانی، سروود)یە، چیرۆکێکی شیعری‌یە لە گرێیێکی گەورەی ژیانی ئادەمزاد دەدوێ. شاکارێکی بێ هاوتایە، کارێکی دراماتێکی گەورەی کردۆتە سەر ئادەمزاد، لە ٢٥٠٠ ساڵ پێش مەسیحەوە پشتنا و پشت وەکو پەندی دانایی خەڵکی گێڕاویانەتەوە.

تێکستە یەکەم و ڕەسەنەکانی بە زمانی سۆمەری لە ناوچوون، بەڵام گێڕانەوەی سەر زار و گۆڕینیان بۆ زمانێکی وەکو بابلی ئێپۆسەکەیان پاراست. چیرۆکی تۆفانی نووح سەرچاوەییێکی بنچینەیی بووە بۆ ئەم کارە. لە پاشانا گلگامیش خۆی بوو بە یەکەمین و کۆنترین سەرچاوەی تۆمار کراوی ڕووداوی تۆفانی نووح، وەکو دەردەکەوێ پێش هەموو کتێبە ئایینی‌یە ئاسمانی‌یەکانیشە.

ئادەمزاد لە کۆنەوە و تائێستاش هەموو دەم بیر لە مردن دەکاتەوە و لێی دەترسێ. ئەمە بیروڕاو خەیاڵێکی هەمیشەیی‌یە بەرۆکی بەرنادا. دیارە «ترسان لە مردن» ئادەمزاد ڕادەکێشێ بۆ ئەوەی بیر لە نەمری و زیندوویی و ژیانی جاویدانی بکاتەوە، گلگامیش قارەمانی ئێپۆسەکە هەمیشە تووشی مردووان دێ. نزیکترین هاورێ و یاریدەدەری ئەنکیدۆ لە پێش چاوی کۆچی دوایی دەکا. لەبەر ئەوە بڕیار دەدا کە بە شوێن ڕووەکی نەمری بگەڕێ بۆ ئەوەی بگاتە نهێنی‌یەکانی لە ناوچوون.

قارەمانی ئێپۆسەکە گلگامیشە، ئەفسانە ئەوە دەگێڕێتەوە کە شای ئورۆک بووە لە وڵاتی میزۆپۆتامیا (عیراق)، فەرمانڕەواییێکی بە زەبر و زۆردار بووە، حەزی بەوە کردووە مێرد منداڵان بۆ جەنگ ڕەوانە بکا و کیژۆڵان بۆ کۆڕی ڕابواردن بانگ بکا. خەڵکی لە خوداکانیان دەپاڕێنەوە کە ڕزگاریان بکەن. خودایان بە دەنگیانەوە دێن و کەسێکی وەکو ئەنکیدۆ دروست دەکەن. ئەمە کابراییێکی بەهێز و توانا و بێ ئامان بوو، لەگەڵ ئاژەڵ و درندە لە چۆڵ و بیابانان دا دەژیا. ئەنکیدۆ دێتە شار بۆ زانینی هەواڵی شای زۆردار. شار کارێکی گەورەی لێ دەکا، خوو و ڕەووشتی دەگۆڕێ، سۆز و نەرمی و نیانی دەچێتە ناو دڵیەوە و لە باتی ئەوەی گلگامیش لە ناو ببا دەبێ بە هاورێی. گەلێ کار و کردەوە پێکەوە دەگەیێننە ئەنجام، بەشداریی جەنگ و شەڕ و شۆڕەکانی گلگامیش

دەکـا، پێکەوە دێوی هومـبـابا پاسـەوانی دارسـتـان لە ناو دەبەن. کـە گلگامـیش بە سـەرکـەوتوویی دەگـەڕێتـەوە ئۆرۆک دەکـەوێتـە بەربەرەکـانیی خـودا ژنی شـار ئەشـتـار. خوداکان گاجووتێکی ئاسمانی دەنێرن بۆ تۆڵە سەندن لە شاو شارەکەی. گاجووت باغ و باغات تەخت دەکا، ئاوی زێ دەخوواتەوە، خەریک دەبێ شاری ئورۆک بە تەواوی وێران بکا، بەڵام گلگامـیش لەگـەڵ ئەنکیـدۆی هاوڕێی پاش زۆرانبـازیییەکی قـارەمـانانە دەتوانن گـاجـووت بکوژن، لەمـەدا نەوەکـو تەنیـا بە سـەر گـاجـووت دا زاڵ دەبن، بەڵکو ئەشتاریش دەبەزێنن. بەڵام ئەنکیدۆ کۆچی دوایی دەکا، چونکە ژیانی شاری پێ خۆش نەبووە. ئیـتـر گلگامـیش دەکـەوێتـە سەر هەوەسی ئەوەی ڕێگەیێک بدۆزێتـەوە بۆ ئەوەی ژیان هەمـیـشـەیی و نەمـر بێ. لە پاش هەوڵ و تەقـەڵاییێکی زۆر «ڕووەکی نەمـری» دەدۆزێتەوە. لە ڕێگەی گەڕانەوەی دا بۆ شار، تووشی جۆگەلەییێک دەبێ و لادەدا، خۆی دەخاتە ئاوەوە بۆ پاک کردنەوەی لەشی و ڕووەکەکە لە قەراغ جۆگەلەکە دادەنێ. لە پڕ مـارێک پەیدا دەبێ، ڕووەک دەفـڕێنێ و لە چاو وون دەبێ، ئەمـە دەبێـتـە هۆی ئەوەی گلگامیش و هەموو ئادەمزادی سەر ڕووی زەوی لە نەمری بێ بەش بن.

ئەم ئێپۆسە ئەوە دەردەخا کە ئادەمزاد ئەوەندە بەهێزە هەموو کارێکی بۆ هەڵدەسووڕێ، دەتوانێ بەسەر هەموو هێزێک دا زاڵ بێ، تا دەگاتە ئەوەی یەخەی خوداکـانیش بگرێ، بەڵام لەگەڵ ئەوەش دا دەبێ لە دوایی دا هەر خوداکان سەرکەوتوو بن.

### ٢- ئەدەبی میسری

ئەدەبی مـیـسـری کـۆن (بە زمـان قـیـبـتی و بە ناوەرۆک فـیـرعـەونی) لە پاش ئەدەبی سۆمـەری یەکێکە لە ئەدەبە دەوڵەمـەندەکانی گێتیی کۆن، بەوەی بابەت و هونەرەکـانی ئەدەبیـان ڕەنگاوڕەنگە. کۆنترین تێکستێکی شیعری ئەدەبی میسری کۆن ئەوەیە کە لە سـەر تاتە بەردێک هەڵکەندراوە و لە مـۆزەی لایدن پارێزراوە. سـەردەمی هۆنینەوەی دەگەڕێتەوە ٢٢٠٠ ساڵ پێش مەسیح.

شاعیری خاوەنی ئەم پارچە شیعرە ئەوە دەردەبڕێ کە لە سەر ئادەمزاد پێویستە خۆشی لە ژیانی سەر ڕووی زەوی وەربگرێ.

جگە لەمە ئەمنحـۆتبی چووارەم (١٣٨٠ پێش مەسیح) کـە بە ناوی ئیـخناتۆن ناسـرا بوو، شاعیر بووە، هەندێ پارچە شیعری لە پێدا هەڵدانی (مەدح) ئەتۆنی خودا داناوە، ئەم شیعرانە بە جووانترین بەرهەمێک دادەنرێن کە لە ئەدەبی میسری کۆن مابێتەوە.

ئەوەی لە هەمــووشــیــان زیاتر ئەدەبی مــیــســری کــۆنی پێ بەناوبانــگ بووە «کــتــێــبی مردووان»ە، ئەمە بریتی‌یە لە تەلیسم و ڕەمز و نیشانەی جادووگەریی ئایینی، لە گۆڕی هەندێ لە گەورە پیاوانی بنەماڵەی هەژدەمینی فەرمانڕەوایی فیرعەونەکان دۆزراوەتەوە.

### (٢) ئەدەبی تۆمار کراو بەتیپەکانی ئەلفو بێ

بەلای کــەمــەوە هەزار ســاڵێک پێش مــەسـیـح ئەدەبێکی بەرز خــۆی نواند و بە ئەلفــو بێ‌ییێکی ڕێکوپێک تۆمار کرا، ئەمە بریتی بوو لە ئەلفو بێ‌ی ئارامی و عیبری و گریکی و لاتینی و ئاڤێستایی و سانسکریتی و هی تریش. دەتووانین ئەم ئەدەبە لە دوو شێوە، یا لە دوو سەرچاوەی جیاواز دا بەدی بکەین:

(١) ئەدەبی هونەری سەربەخۆ.

(٢) ئەدەبی هونەری لە کتێبەکانی ئایینی دا.

### (١) ئەدەبی هونەری سەربەخۆ

لە هەزار ساڵەی پێش مــەسـیـح بزووتنەوە و جــمــوجــۆڵی ئادەمــزاد لە ڕووی ئەدەبی و هونەری‌یەوە خاکەکانی باکووری زەریای ناوەڕاست و هیندستان و چینی گرتبووەوە، ئەم ڕۆژگارە لەلایەن شیعر و ئەدەبیاتەوە بەرهەمێکی یەکجار بەرزمان بۆ دەور دەکاتەوە، لە دووا ڕۆژ دا کــاری کردە ســەر هەمــوو ئەو ئەدەبە تازانەی کــە لە ئەنجــامی دروست بوونی نەتەوەکانی سەر ڕووی زەوی‌ی ئەمڕۆ پەیدا بوون.

### أ- ئەدەبی گریکی

بەرزترین نموونەی ئەدەبی هونەری تاقی کــردنەوەکــانی گــریـک و ڕۆمــانەکــان بـوو، ئەم ئەدەبە نەوەکو تەنیا بوو بە دایکی ئەدەبی نەتەوەکانی ئەوروپا کە لە سەدەکانی ناوەڕاست دا بە تەواوی دروست بوون لە پاش خەملانی زمانە نەتەوەیی‌یەکانیان، بەڵکو کارێکی گەورەی کردە سەر ئەدەبی نەتەوەکانی هەموو گێتی.

ئەوەی شــایانی باســە و دەبێ بووترێ ئەوەیە ئەم ئەدەبە بەرزە بە زمــانی گــریکی دەســتی پێ کرد، گەنجینەیێکی بێ هاوتای لە ئەدەبی داهێنان خستە ژێر دەستی ئادەمزاد. لە پاش پێنج سەدە، لەبەر گەلێ هۆی کۆمەلایەتی - سیاسی (سۆسیۆپۆلیتیک) لە ناو منداڵدانی ئەدەبی گــریکی‌یەوە ئەدەبی لاتینی (ڕۆمــانی) بە زمــانی لاتینی لە دایک بوو. لە پاش

ئەمە هەر دوو ئەدەب پێکەوە بەردەوام بوون، گریکی‌یەکە بەرەو کزی و لاتینی‌یەکە بەرەو گۆڕران و پەرەسەندن دەڕۆیشتن.

١- ئیلیادە = Iliade - ئۆدیسە = Odysse

ئێپۆسی ئیلیادە لە گەورەترین شاکاری ئەدەبی هونەری گێتی دەژمێررێ، وە یەکەمین بەرهەمی ئەدەبی بەرزی گریکی کۆنە، لە سەدەی نۆیەمی پێش مەسیح لە ساڵی (٨٥٠) لەلایەن هۆمیرۆسەوە دانراوە و کۆکراوەتەوە و رێک خراوە. ئەم ئێپۆسە بریتی‌یە لە ٢٤ سروود و شازدە هەزار دێڕە شیعر. بەشێ لە ڕووداوەکانی جەنگی تەروادە دەگێڕێتەوە کە لە نێوان گریک و تەروادی‌یەکانا ڕووی دا. تەروادە شارێکی کۆن بوو لە ڕۆژئاوای ئاسیای بچووک. ئەفسانە (میتیۆلۆجیا)ی گریکی دەڵێ گریکەکان دە ساڵ ئابلۆقەیان دا (١١٩٣ - ١١٨٤ پێش مەسیح).

ئیلیادە ئەوە دەگێڕێتەوە لەو کاتەی کە ئەشیل لەگەڵ ئاگامەمنوون تێک دەچێ دەگەڕێتەوە بارەگای خۆی و بڕیار دەدا کە بچێتەوە مەیدانی جەنگ بۆ تۆڵە سەندنەوەی هاوڕێی خۆی بترۆکل کە هیکتۆر کوشت بووی. لە پاش زاڵ بوونی ئەشیل بە سەر هیکتۆر و کوشتنی لاشەی ڕادەکێشێ و بە دەوری گۆڕی هاوڕێی‌دا دەگێڕێ، لە پاشانا لاشەکە دەباتەوە بۆ باوکی هیکتۆر کە بریامی ناو بوو.

جگە لەمە هۆمیرۆس ئێپۆسێکی تریشی داناوە بە ناوی ئۆدیسە، لە سەرەتای سەدەی حەوتەمی پێش مەسیح ڕێکی خستووە، لە ٢٤ سروود پێک هاتووە، هەر سروودێکی بریتی‌یە لە ٣٣٠ تا ٦٠٠ دێڕە شیعر. سۆزی مرۆڤایەتی قارەمانەکانی ئۆدیسە دەبزوێنێ، زمانی بەرزە، ڕەنگدانەوەی پێشکەوتن و کۆمەڵێکی شارستانی‌یە.

٢- بەرهەمە گرنگەکانی ئەدەبی گریک

١

لە سەرەتای سەدەی هەشتەم (پێش مەسیح) شاعیرێکی گەورەی گریکی هێسیۆدۆس Hesiodos خەریکی شیعری پەروەردە و فێرکردن (دیداکتیکی) بوو. ئەم شاعیرە دەیویست لە تەلی خەیاڵ و سۆز و دەروونی ئادەمزاد بدا بۆ مەبەسی هاندانی بۆ کار، چونکە کار مایەی ژیانە بۆ ئادەمزاد خۆی و بەشدار بوونە لە شارستانیەتی مرۆڤایەتی. کۆمەڵێک لەم بابەتە شیعرانەی لە پاش خۆی بەجێ هێشت بە ناوی «کار و ڕۆژگار»ەوە پارێزرا.

٢

له چارەکی دووایی سەدەی شەشەم - نیوەی یەکەمی سەدەی پێنجەم شاعیرێکی گەورەی تری گریک کەوتبووە جموجۆڵی هونەری و ئەدەبی‌یەوە، ئەمە ئیسخولۆس Aiskhulos (٥٢٥ - ٤٥٦ پێش مەسیح)ی شاعیری دراماتوورگ بوو، یەکێکە لە سێ شاعیرە گەورەکەی شانۆی گریکی. هەموو ژیانی بۆ چیرۆکی شانۆیی تەرخان کرد بوو، بە هۆی هەست و خەیاڵی قووڵ و سۆزی مرۆڤایەتی، بەهێزترین و جووانترین چیرۆکی تراجیدی شانۆیی نووسی‌یەوە، هەر لەبەر ئەوەش بوو بە باوکی هونەری شانۆ ناوبانگی دەرکرد.

٣

بە هۆی ئەوەی شیعر خەریکی هەموو لایەنێکی ژیان بوو و ڕەنگدانەوەی ڕووداوەکانی ژیان بە شێوەی هونەری جیاواز دەخرانە ڕوو، لەبەر ئەوەیە دەبینین لە سەدەی پێنجەمی پێش مەسیح شاعیری گریکی (ئاتینی) کراتینۆس Kratinosی هونەری کۆمیدی‌یەوە گەلێ بەرهەمی بەرز دێنێتە ناوەوە و بە دامەزرێنەری شانۆی کۆمیدی دەژمێررێ.

٤

لە سەدەی پێنجەمی پێش مەسیح (٤١٠) شاعیرێکی تری گریکی نۆنۆس Nonnos کە لە میسر لە دایک بووە، گەورەترین کارێکی ئەدەبی هونەری هێناوەتە ناوەوە بە ناوی پۆیێم (چیرۆکی شیعری) «دیۆنیزیاک»ەوە، ئەمە بریتی‌یە لە دەور کردنەوەی مەشقێکی قووڵ و گرنگ لە میتیۆلۆجیای گریکی کۆن، هەر لەبەر ئەوەشە لە پاشانا ئەم کارە هونەری‌یە خۆی بوو بە سەرچاوەیێکی بنچینەیی بۆ گێتی‌ی میتیۆلۆجیا.

٥

ئوریپیدێس Euripides (دەوروبەری ٤٨٠ - ٤٠٦ پێش مەسیح) یەکێکە لە سێ شاعیرە گەورەکەی شانۆی گریکی، نزیکەی سەد چیرۆکی تراجیدی شانۆیی داناوە، بە ناوبانگترینیان: «ئەندرۆماک»، «تەروادیەتی»، «فینیقیەتی»، «ئەلێکترا»، «ئیڤگینیا»و هی‌تر. گەورەترین ئەدگاری ئەم شاعیرە ئەوەیە کە لە دەربڕینی هەستی سایکۆلۆجی ناوەوەی ئادەمزاد سەرکەوتوو بووە.

٦

شاعیری ناوداری گریک سۆفۆکلێس Sophokles (٤٩٦ - ٤٠٥ پێش مەسیح) سەرۆکی سێ کوچکەی شیعری شانۆی گریکی‌یە، شیعری لیریکی و شیعری شانۆگەری زۆرە، دەڵێن ژمارەی گەیشتۆتە ١٣٠ شانۆگەری، بەڵام تەنیا حەوت تراجیدیای گەیشتۆتە

ئێمە، لەمانە شانۆگەری «ئەنتیگۆنە» و «ئۆدیبی شاهنشا» لە شاکارە کلاسیکی‌یەکانی ئەدەبی گێتی‌ی دەژمێررێن.

٧

شاعیری گاڵتە و گەپ و پێکەنین ئەریستۆفانێس Aristophanes گەورەترین شاعیری کۆمیدی گریک بوو لە ئاتینا، کۆمەڵێک شانۆگەری کۆمیدی داناوە، بەشێکی کەمی گەیشتۆتە ئێمە، لەمانە: «هەور»، «زەردەواڵە»، «چۆلەکە»، «بۆق».

٨

لە سەدەی پێنجەم و چووارەمی پێش مەسیح فیلۆکسینۆس Philoxenos (٤٣٥ - ٣٨٠)ی شاعیری دەربار لە کۆشک و سەرای دیۆنیسیۆسی گەورەی خوێن ڕێژ دەژیا. ئەم شاعیرە داهێنەری بابەتی پێدا هەڵدان (مەدح) بوو لە ئەدەبی گریکی‌ی کۆن.

٩

لە سەدەی چووارەمی پێش مەسیح (دەوروبەری ٣١٠) تیۆکریتۆس Theokritos لە سقلیە دەژیا، بەرزترین بابەتی شیعری هێنایە ناو ئەدەبی گریکی‌یەوە. ئەم هونەرە «ئیدیلا»یان پێ دەووت، ئەمە هونەرێکە ناوەرۆکی لە دڵداری‌ی دەشت و دەر و گوند و دێهات وەردەگرێ، واتە دڵداری‌ی پاکی دوور لە شار و شارستانی.

١٠

لە سەدەی سێ‌یەم بەم لاوە ئەدەبی گریکی کەوتە لێژی‌یەوە، ناڵێین لە ناو چوو بەڵام گەلێ کز بوو، بۆیە سەدەکانی داهاتوو شاعیرێکی گەورەی وا دەور ناکاتەوە کە ناوی لاپەڕەیێکی زۆر داگیر بکا لە ناو مێژووی ئەدەب دا، تەنیا میلیاگرۆس Meleagros (دەوروبەری ١٤٠ - ٦٠ پێش مەسیح) نەبێ، ئەم شاعیرە گریکی‌یە لە ڕۆژهەڵاتی زەریای سپی‌ی ناوەڕاست لە نزیک ڕووباری ئەردەن و شاری سوور (صور) ژیاوە، کۆمەڵێک شیعری داناوە و بە ناوی «دیوانی ئیکلیل» تۆماری کردووە.

## ب - ئەدەبی لاتینی (ڕۆمانی)

لەگەڵ کز بوونی ئەدەبی گریکی و ڕۆیشتنی بەرەو ئاوا بوون، ئەدەبی لاتینی کەوتە پەرەسەندن و بوو بە بەردەوامی ئەدەبی گریکی. کۆنترین شیعری ڕۆمانی بە زمانی لاتینی دەگەڕێتەوە سەدەی دووەمی پێش مەسیح، بەم پێ‌یە داهێنانی ئەدەبی لاتینی لە نیوەی

یەکەمی سەدەی دووەمی پێش مەسیح دەست پێ دەکا.

١

کۆنترین شاعیری لاتین ئینیوس Ennius ە (دەوروبەری ١٦٩ پێش مەسیح). دیارترین کاری ئەدەبی ئەم شاعیرە بە ناوی «ساڵنامە»یە، ئەمە بریتی‌یە لە مێژووی شاری ڕۆما لە ڕۆژی بنیادنانیەوە تا دەوروبەری ژیانی شاعیر. ئینیوس ڕووداوەکانی ئەم مێژووە بە شیعر دەگێڕێتەوە.

٢

شاعیرێکی تری لاتین تیرینتیوس Terentius (دەوروبەری ١٩٠ - ١٥٩ پێش مەسیح) لە قرتاجە ژیاوە. لە وەسفی خوو و ڕەووشتی ئادەمزاد سەرکەوتوو بووە، شیعری تەنیا بۆ ئەم مەبەسە بەکار هێناوە، دەورێکی باڵای بووە لە گۆڕران و پەرەسەندنی هونەری شانۆگەری.

٣

هەر لە سەدەی دووەمی پێش مەسیح جوڤێنال Juvenal (دەوروبەری ١٤٠ پێش مەسیح) خەریکی چارەسەر کردنی ناگزووری کۆمەڵایەتی و خوو و ڕەووشتی خراپی ئادەمزادی سەردەمی خۆی بوو. بۆ ئەم مەبەسە هونەری جنێو (هەجوو)ی بەکار دەهێنا، واتە بە جنێو تیماری ئەو دەردە کۆمەڵایەتی‌یانەی دەکرد.

٤

سەدەی یەکەمی پێش زایین پۆپەی گۆڕرانی ئەدەبی ڕۆمانی کۆن بوو بە زمانی لاتینی. ئەم سەدەیە گەورەترین شاعیرانی زمانی لاتینی دەور دەکاتەوە. لە سەرووی ئەمانەوە، یاخود گەورەترین شاعیر لە سەرانسەری مێژووی ئەدەبی لاتینی ڤیرجیلیوس Virgilius بوو، (لە پاشانا باسی لێوە دەکرێ).

٥

شاعیری ڕۆمانی لوکرێتوس Lucretus (دەوروبەری ٩٨ - ٥٥ پێش مەسیح) کە لە ڕۆما لە دایک بووە و هەر لەوێش ژیاوە، خاوەنی ئێپۆسی «سروشت»ە، لەم ئێپۆسەدا هەوڵ دەدا فەلسەفەی ئەبیکۆرس (ئەبیقۆر) پیشان بدا و خۆی دەکاتە لایەنگری و ئەوە

دەردەبڕی کـە خـۆشی و لەزەت مـەبەسـە بنچـینەیی‌یەکـانی بوونی ئادەمـزادە لە سـەر ڕووی زەوی.

٦

پەخشـانی هونەری لەم ڕۆژگارانـە دا گەلێ پێش کـەوت بوو، ئەم جۆرە پەخشـانـە بە زۆری بۆ نووسینەوەی مێژوو بەکار دەهێنرا، یەکێ لە مێژوونووسە گەورەکانی ڕۆمـان سالوستوس Sallustus (٨٦ - ٣٥ پێش مـەسـیح) دوو بەرهەمـی بەرزی بەجێ هێشـتـووە، یەکـەمـیـان «ژیانی یوگورتا» و دووەمـیـان «پیلانی کاتیلینا»، لەم نووسینانە دا بەرهەمێکی پتەو و ڕوون دەخـاتـە بەردەست، لە یـەکـەمـیـانا بە سـەر هاتی یوگـورتای شـاهنشـای نەومـیـدیا دەگێڕێتەوە، ئەمە بەرهەڵستی ڕۆمانەکانی کرد، بەڵام سەرنەکەوت، ماریۆس بە دیل گرتی و لەگەڵ خـۆی بردی‌یەوە ڕۆما و هەر لەوێش مـرد. یوگورتا Jugurtha (دەوروبەری ١٦٠ - ١٠٤ پێش مەسیح) شاهنشای نەومیدیا بوو؛ نەومیدیا هەرێمێکی فراوان بوو لە نێوان قرتاج (توونس) و مەراکیش (مەغریب) واتە (جەزائیری ئێستا)، ڕۆمانەکان کرد بوویانە ناوچەیێکی سوپایی سەر بە ئیمپراتۆریەتی خۆیان.

لە دووەمـیـانا بە سـەر هاتی کـاتیلینا (١٠٩ - ٦٢ پێش مـەسـیح) دەگـێـڕێتـەوە، ئەمـە گەورە و خانەدانێکی ڕۆمانی بوو، لە دژی ئەنجومەنی سینات بوو، لە پاش ئەوەی مەسەلە لەلای قونسوڵ ئاشکرا بوو، بەربەرەکانی کراو لە شەڕدا کوژرا.

٧

گەورەترین شـاعـیری مێژووی ئەدەبی لاتینی ڤـیرجیلیوس (٧١ - ١٩ پێش مـەسـیح) بوو، ئـەمــە دیارترین شــاعــیـری ڕۆمــا بـوو. هەر لەبەر ئەوەی نەتەوەی گـریکی گـەورە «ئیلیـادە»ی هەبوو، بەلای ئەوەوە دەبوو ڕۆمـاش شـاکـارێکی ئەدەبی گـەورەی وەکـو ئەوی هەبێ، بۆ ئەمە ئێپۆسی «ئینیادە»ی لە ساڵی ٢٩ پێش مەسیح دانا لە ١٢ سروود تێیدا لاسایی «ئیلیادە»ی هۆمیرۆسی کردۆتەوە، بەڵام بە زمانی لاتینی. هۆمیرۆس لەو جێ‌یەی «ئیلیـادە» تەواو دەکا ئەو لـەوێوە دەست پێ دەکا، بە خەیاڵی فراوان و مۆسیـقـای نەرم و ووشـەی شـاعـیـری «ئینیـادە» دەگـەیەنێتـە پلەی «ئیلیـادە». قـارەمـانی «ئینیـادە» ناوی «ئینـاس» و خـەڵکی تـەرواده بوو، لە پاش وێران کـردنی تەروادە لەوێ ڕادەکـا، مـاوەیێک لە قرتاجە دەمێنێتەوە لای دیدون شاژنی ئەو ناوچەیە. ژنە حەزی لێ دەکا، ئیتر لەوێوە بە دزی‌یەوە بـۆی دەردەچێ و ڕوو دەکـاتـە خـاکی ئیـتـالیـای ئێـسـتـا و لـە ناوچەی لاتـیـوم نیشتەجێ دەبێ، لە پاشانا نەوەکانی شاری ڕۆمای لێ دروست دەکەن.

ڤیرجیلیوس جگە لەمە شیعرێکی زۆری هەیە لە بابەت «کاری کشتوکاڵی وپەروەردەی مەڕو ماڵات»ەوە.

٨

شاعیری گەورەی ڕۆمانی هۆراسیوس Horasius (٦٥ - ٨ پێش مەسیح) جگە لە شاعیریەتی ڕەخنەگرێکی گەورەش بوو، کتێبی «هونەری شیعر» «شیعریەتی یا شیعرایەتی» تا ئێستاش لە سەرچاوە بنچینییە کلاسیکییەکانی گریک و ڕۆمان دەژمێررێ لە ڕەخنەی ئەدەبی دا. لە تەک ئەمەدا کۆمەڵێک شیعریشی هەیە، بە تایبەتی ئەو بەشە شیعرانەی کە ناوی ناوون «جنێو» و «نامە».

٩

هەر لەو سەردەمەدا ئۆڤیدیوس Ovidius (٤٣ پێش مەسیح - ١٨ پاش مەسیح)ی شاعیری گەورەی زمانی لاتینی لاپەڕەی دووایی ئەم بلیمەتیە بوو. ئەم شاعیرە پڕ زەوق و ئادەمزاد پەرستە گۆرانیی بۆ دڵداری و پێشکەوتن دەووت، عەودالّی جووانیی سەر ڕووی زەوی بوو، بۆیە هەندێ جار بۆنی لەش و لاری جووان لە شیعرەکانی دەهات، دڵبەری شاعیر پەیکەرێکی جووانی بینراو بوو.

بەم جۆرە لاپەڕەی مێژووی ئەدەبی ڕۆمانی بە زمانی لاتینی هەڵدرایەوە، بە تایبەتی دووا سەدەی کە ڤیرجیلیوس تێیدا ژیا بوو، واتە سەدەی زێڕینی ئەو ئەدەبە کە لەگەڵ کز بوونی بت پەرستی و کۆن بوونی جوولەکەیی و پەیدا بوونی ئایینی گاووری ئەویش کەوتە لێژییەوە و ئەدەبی گێتیی کۆنی ئەم ناوچەیە کۆتایی هات.

## ج – ئەدەبی هیندی

ئەدەبی هیندی وەکو زۆربەی ئەدەبە کۆنەکان بە تێکستی ئایینی و هەموو ڕووداوێکی کە پێوەندی بە ئایینەوە هەیە دەستی پێ کردووە.

بەشی زۆری ئەم تێکستانە بە ئەزبەر و لە سەر زار لە نەوەییێکەوە بۆ نەوەییێکی تر دەمایەوە. لە ڕێگە دەسکارییێکی زۆر دەکران و ناوی خاوەنەکانیشیان وون دەکرد. بە گشتی ئەدەبی هیندی لە دوو هەزار ساڵ پێش مەسیحەوە دەستی پێ کردووە تا سەدەی پێنجەمی پێش مەسیح شێوە و ئەدگاری دووایی خۆی وەرگرتووە، هەموو ئەم ئەدەبەش بە زمانی سانسکریتی بووە کە ئێستا نەماوە و لە ناو چووە.

ئەدەبی هیندی دوو ئێپۆسی گەورەمان بۆ دەور دەکاتەوە:

١- مەهابهاراتا Maha - bharata

مەهابهاراتا بە مانای «جەنگی بهاراتای گەورە» هاتووە، بهاراتا بنەماڵەی فەرمانڕەوای هیندستان بوو، ئەمە یادگارێکی هەرە گەورە و بە ناوبانگی ئەدەبی هیندۆسەکانە، هەروەها یەکێکە لە داهێنانەکانی ئەدەبی گیتی، لە ١٨ کتێب پێک هاتووە، دانەری تاقە کەسێک نییە و لە رۆژگارێکی دیاری کراویش دانەنراوە، بەڵکو گەلێ کەس لە نەوە جیاکانی هیندستان بەشداری‌یان تێدا کردووە، بە زمانی سانسکریتی نووسراوەتەوە، زانیاری‌یێکی زۆری تێدایە لە بابەت جەنگ و شەڕ و شۆڕەکانی کوڕ و باندو، هەروەها کردەوەکانی کریشنای خودای هیندوسەکان، جگە لەمە مێژووی هیندستانی کۆن و دەستوور و یاسا و خوو و ڕەووشت و ئەفسانەی ناو کۆمەڵ دەور دەکاتەوە.لە سەدەکانی شەشەمی-پێنجەمی پێش مەسیح تەواو بووە و تا ئێستا ماوەتەوە.

٢ - ڕامایانا Ramayana

ڕامایانا بە مانای «قارەمانیەتی ڕاما» هاتووە، ڕاما خودای هیندۆسەکانە، لە ئاسمان هاتۆتە خووارەوە و چۆتە ناو لەشی ڤیشنۆ لە سەر زەوی (دۆنا دۆن = تناسخ الارواح)، بە زمانی سانسکریتی ڕێک خراوە. مێژووی دانانی بە تەواوی نازانرێ، بەڵام لە سەدەی پێنجەمی پێش مەسیح شاعیری هیندی ڤالمیکی هەموو تێکستە کۆنەکانی کۆکردەوە و لێکی دانەوە و ڕێکی خستنەوە و شتی تریشی خستە سەریان، بەم جۆرە چووارده هەزار پارچەی لێ دروست بوو و بە سەر حەوت بەش‌دا دابەش کرا. ئەم ئێپۆسە بە سەر هاتی چووار برای قارەمان دەگێڕێتەوە لە خەباتیان دا لە دژی خودای خراپە و تاریکی، لە ئەنجام دا سەر دەکەوون، یەکسانی و ئاسایش لە ناو کۆمەڵ دا بڵاو دەکەنەوە ئەم ڕووداوانە لەگەڵ ئامۆژگاری و قسەی نەستەق و پەند و وورد بوونەوە لە ژیان تێکەڵ دەکرێن. گەلێ چیرۆک و بەسەرهاتی تریشی تێدایە بیروڕای هیندۆسەکان دەخاتە ڕوو لە بارەی ئایین و پێوەندی‌ی ئادەمزاد بە کردگارەوە.

### د - ئەدەبی چینی

ئەدەب لەلای چینی‌یەکان شتێکی پیرۆزە، لەبەر ئەوە شاعیر گەورەیە لە لایان و لە سەر

ئەو باوەڕەن کە شاعیر ئادەمزادێکی دانایە و لەلایەن کردگارەوە نێرراوە بۆ ئەوەی ببێتە پێوەند لە نێوان ئاسمان و ئەرز، کردگار و ئادەمزاد.

نووسینی چینی لە سەدەی چواردەمی پێش مەسیح پەیدا بوو، لە پێشانا لە پێنج هەزار تیپ پێک هات بوو، لە دوواییی دا بە درێژایی ڕۆژگار و گۆڕڕانی زمان تیپەکان زیادیان کرد.

ئەدەبی چینیی کۆن لەم بەرهەمانەی لای خووارەوە خۆیان دەنوێنن:

١- یادگاری هەرە بەرزی کۆنی ئەدەبی چینی دەدرێتە پاڵ کۆنفۆشیۆس (٥٥١ - ٤٧٩ پێش مەسیح)، ئەم ئەدەبیاتە «کنگ»ی پێ دەڵێن، هەمووی لە بابەت خوو و ڕەووشتی ئادەمزاد و ڕێک خستنی کۆمەڵە.

کۆنفۆشیۆس فەیلەسووفێکی چینییە ئایینی کۆنفۆشیۆسی دامەزراند، ئەمە ئایینێکی فەلسەفی - ئەدەبییە، باوەڕی بە کردگار (خالق) نییە، بەڵام داوای ژیانێکی خێزانی و کۆمەڵایەتیی بەرز دەکا.

٢- کتێبی سروود: ئەمە «شی کنگ»ی پێ دەڵێن، لە سێ سەد و پێنج پارچە پێک هاتووە، لە نێوان سەدەکانی یازدە-حەوتی پێش مەسیح پەیدا بووە. سروودەکانی بریتین لە هەندێ شیعری دڵداریی ساکار بە شێوەی مۆنۆلۆج لە نێوان کوڕ و کچان دا، بە تایبەتی ئەمە لە کۆمەڵی کشتوکاڵی دا باوە. هەروەها ئەم هونەرە وەکو گۆرانی بۆ سەمای ئایینی و پەرستن یا پێدا هەڵدانی خاقانەکانی ڕابردووی چین بەکار دەهێنرێن، زۆربەی ئەم گۆرانییانە بە مۆسیقاوە دەووترێن.

٣- کتێبی مێژوو: ئەمە «شوکنگ»ی پێ دەڵێن. بریتییە لە تۆمار کراوی ڕووداوەکانی سەدەکانی یازدە-حەوتی پێش مەسیح. تێکستەکانی ئەم کتێبە فەرمانی میری و دووانی خاقانەکانی گرتۆتە خۆ، لە ڕووی ناوەڕۆکەوە لە دەوروبەری ئیدیۆلۆجیی کۆنفۆشیۆس دەسووڕێنەوە.

٤- کتێبی گۆڕڕان: ئەمە بریتییە لە تێکستی قورس و داخراو، لە جادووگەری و عەزامات و دووا ڕۆژ خوێندنەوە هەڵقولاوە، لە پاشانا تێکستەکان بە گیانێکی فەلسەفی لێک دەدرانەوە. ئەم تێکستانە لە نێوان سەدەکانی دە-حەوتی پێش مەسیح کەوتوونەتە ناوەوە.

٥- ووتەکانی کۆنفۆشیۆس: ئەمە بریتییە لە قسەی نەستەق و پەند و ئامۆژگارییەکانی

کۆنفۆشیۆس، هەموو بیر و باوەڕێکی پێ دەکێشرێ و لە ڕێگەی ئەم ووتانەوە بیروڕای تازە بۆ چاکەی کۆمەڵ دەکەوێتە ناوەوە.

٦- لە سەدەی چووارەمی پێش مەسیح جۆرە شیعرێکی تازە پەیدا بوو، ڕەنگدانەوەی هەستی دەروونی ناوەوەی ئادەمزاد بوو، لە دووری و ئاوارەیی و نالەباری و ناسۆری ژیان و مردن دەدوا، ناوەرۆکێکی سیمبۆلیزمی (ڕەمزی) و سۆفیزمی و سیاسی هەبوو، ئەمە لە دیوانی شاعیری چینی کیویوان (٣٣٢ - ٢٩٥ پێش مەسیح) دەردەکەوێ.

لەمەدا دەگەینە ئەنجامی ئەوەی کە نەتەوەکانی چینی گەورە دەورێکی دیاریان بووە لە داهێنانی ئەدەبی گێتیی کۆن و خزمەتێکی گەورەی ڕۆشنبیری و کولتووری مرۆڤایەتی‌یان کردووە. تا ئێستاش لە ناو کۆمەڵانی سەر ڕووی زەوی کە یادی چین دەکرێتەوە دانایی و قسەی نەستەق و پەندی پێشینان دێنێتەوە بیر.

## (٢) ئەدەبی هونەری لە کتێبەکانی ئایینی‌دا

مەبەس لە کتێبی ئایینی ئەو کۆمەڵە کتێبەیە کە دەستوور و یاسا و مێژوو و بەسەرهات و ڕووداوەکان و بیر و باوەڕ و ئیدیۆلۆجیەتی ئایینیان تێدا تۆمار کراوە، بێ گومان تێکستی ئەم کتێبانە بە گشتی لەشێوازی ئەدەبی بە دوور نین، جگە لەوەی هەندێ بەش و پارچەیان شیعرێکی تەواوە، یا پەخشانێکی هونەری یا شیعرێکی پەخشان ئامێزە. لە ڕووی باوەڕی ئایینی‌یەوە هەندێ لەو کتێبانە بە کتێبی ئاسمانی دەژمێررێن، واتە قسەی خودایە و بۆ پێغەمبەری نەتەوەکە نێرراوە بۆ ئەوەی بیکا بە دەستووری ژیانی سەر ڕووی زەوی و پێوەندیی گیانی ئەو کۆمەڵە بە گێتیی نەمری داهاتوو. هەندێکی تریش لەلایەن پێغەمبەر و سەرۆکی ئایین و فەیلەسووف و زانا و دانایانی نەتەوەکان دانراوە، دیارە لای خۆیان ئەم کتێبانە قسەی خودان یا لە پلەی قسەی خوداکانیانن.

بە گشتی ئەو کتێبانە ئەگەر چی لە بنەڕەت دا بۆ مەبەسی ئایینی هاتوونەتە خووارەوە یا نووسراونەتەوە، بەڵام کارێکی گەورەیان کردۆتە سەر ئەدەبی ئەو زمانانەی کتێبەکانیان پێ نووسراوە، یا ئەو زمانە تازانەی لە زمانە کۆنەکان بوونەتەوە. ئەم کارکردنە بەهێز بووە، چونکە جەوهەری ئەدەبی لە ناو ئەو کتێبە ئایینی‌یانە دا ڕەسەن بووە و پلەی داهێنانی هونەری‌یان یەکجار بەرز بووە.

لەم ماوەیەدا بە کورتی باس لەو کتێبانە دەکەین بەپێی پەیدا بوونیان، یا هاتنە خووارەوەیان لە ئاسمان:

## أ- تەورات

تەورات «کتێبی پیرۆز» و «رۆژگاری کۆن»یشی پێ دەڵێن. باس لە مێژووی بوون و مرۆڤ دەکا لە سەرەتاوە، واتە پێش مێژوو. لە ماوەیێکی درێژی مێژووی پاش مێژووش دەدوێ واتە دەوری پیغەمبەران تا پێش پەیدا بوونی ئایینی گاووری. ئەوەی لێرەدا گرنگ بێ ڕووداوەکانی ١٨٠٠ ساڵ پێش مەسیحە، واتە لە سەردەمی ئیبراهیمەوە.

ئەم کتێبە بەلای کەمی‌یەوە لە ماوەی ١٣٠٠ ساڵ دا کۆکردنەوە و تۆمار کردنی تەواو بووە، واتە لە دەوروبەری مووسا (سەدەی ١٣ی پێش مەسیح)وە تا نزیک پەیدا بوونی عیسا. تەورات بریتی‌یە لە ٣٦ نامە (سفر)، ئەوەی بۆ مەبەسی ئەدەبی گرنگ بێ و بۆنی داهێنان و هونەریان لێ بێ ئەم نامانەی خووارەوەن:

١- مەزمموورەکانی داوود: ئەمە هەندێ جار بە کتێبێکی سەربەخۆ دادەنرێ بە ناوی «زەبوور»ەوە، دەدرێتە پاڵ داوود (١٠١٠ - ٩٧٠ پێش مەسیح). مەزموورەکان بریتین لە ١٥٠ سروود، ئەم سروودانە جێگەی یەکەمیان هەیە لە نوێژی گاوورەکان.

٢- گۆرانی‌ی گۆرانی‌یان: ئەمە دەدرێتە پاڵ سلێمانی دانا (٩٧٠ - ٩٣٥ پێش مەسیح)، بریتی‌یە لە کۆمەڵێک تێکستی شیعر ئامێزی ڕۆمانتیکی‌یانە لە دڵداری و جووانی دەدوێن، ناوەرۆکی هەندێکیان بۆنی شەهوەت و مێ بازی لێ دێ، گەلێ لەوانەی لێ‌یان کۆڵیوەتەوە بە چاوێکی سۆفیزمیانە تەماشایان کردووە. وا باوە کە لە سەرەتای سەدەی چووارەمی پێش مەسیح کۆکراوەتەوە و قالبی ئێستای وەرگرتووە.

٣- ئەشیعا: ئەمە نامەیێکی تری تەوراتە دەدرێتە پاڵ ئەشیعا کە لە سەدەی هەشتەمی پێش مەسیح ژیاوە. ئەم دانەرە لەو کاتەدا ووشیار بووەوە و گەیشتە ڕاستی کە سەنحاریب لە ٧٠١ی پێش مەسیح ئابلۆقەی ئۆرشەلیمی دا، گۆیا لەم جەنگەدا کوژراوە. نووسینەکانی شێوازێکی شیعری تەواویان هەیە. باسی ئەوەی کردووە کە لە دووا ڕۆژ دا عیسا لە کیژێکی بێ باوک لە دایک دەبێ.

٤- ئەیووب: لە پلەی پێغەمبەری بووە، لە دەوروبەری ساڵی ٤٠٠ی پێش مەسیح ژیاوە. خودا ویستوویەتی تاقی بکاتەوە، بەڵام ئەو بەرگری هەموو ئێش و ئازار و ناسۆری ژیانی کردووە. مەسەلەی ئەیووب مەسەلەی خراپەیە لە گێتی دا، بەلایەوە خراپە دووایی

نایە، بە خودا ناسین نەبێ. ئەم نامەیە لە کتێبی پیرۆز نموونەی بەرزی ئەدەبیاتی ڕۆژهەلاتە، چۆتە ناو ناخی دەروونی ئادەمزادەوە، بە شێوەیێکی شاعیریانە ڕووداو دەگێڕێتەوە و وێنەی دەگرێ.

٥- پەند و قسەی نەستەق: ئەم نامەیەش دەدرێتە پاڵ سلێمانی دانا، بریتی‌یە لە کۆمەڵێک پەند و قسەی نەستەق و ئامۆژگاری، لە دەوروبەری مژدەدا دەسووڕێتەوە تا دەگاتە ئەو پەندەی کە دەڵێ «سەری دانایی ترسانە لە خودا». وا باوە کە ئەم پەندانە لە سەدەی پێنجەمی پێش مەسیح کۆکراونەتەوە.

٦- ئەستێر: نامەی ئەستێر بەشێکی گرنگە لە تەورات و چیرۆکی ڕۆمانتێکی‌یانەی مێرد کردنی ئەستێر دەگێڕێتەوە بە ئەخشۆرشی شاهنشای ئێران بۆ ئەوەی نەتەوەکەی لە ستەم و زۆرداری ڕزگار بکا. ئەوەی ئاشکراشە ئەوەیە کە ئەستێر ژنێکی جووان و داوێن پاک بووە. دەڵێن ئەم نامەیە لە ساڵی ١١٤ی پێش مەسیح نووسراوەتەوە.

ئەمە بەشە گرنگەکانی تەورات بوو، ئەگینا بە ڕاستی هەموو تێکستەکانی ئەم کتێبە و ڕووداوەکانی کارێکی گەورەیان کردۆتە سەر ئەدەب و کولتووری گێتی، بە تایبەتی نەتەوەکانی ئەورووپا، لەو ڕۆژەی ئایینی گاووری تێیدا کەوتە ناوەوە تائێستا، چونکە تەورات و ئینجیل (ڕۆژگاری کۆن و تازە) کتێبی پیرۆزی گاوورانە. ڕووداوەکانی ئەم کتێبە ڕەنگیان لە شیعر و ئەدەبیات و وێنەکێشی و پەیکەر تەراشی و ئەندازیاری (میعمار = ئەرشیتیکتور) و مۆسیقا و سەما و گۆرانی و هەموو بابەتەکانی تری هونەر داوەتەوە.

## ب - ئاڤێستا

کتێبی ئاڤێستا لە کردەوە و نووسینی زەردەشتە (سەدەی حەوتەمی پێش مەسیح). زەردەشت پێغەمبەری نەتەوە کۆنەکانی ئێران بوو، یەکەمین ڕێ پیشاندەری کۆمەڵیان بوو لە ڕێی ئایینەوە.

ووشەی «ئاڤێستا» یا «ئاڤێستاک» لە ووشەی «ئوپاستا»ی پەهلەوی‌یەوە هاتووە کە مانای «بنج، بناغە، بنیاد» دەگەیێنێ. کتێبی ئاڤێستا بریتی‌یە لە پێنج بەش، بەشی هەرە گرنگیان «یەسنا»ی پێ دەڵێن، لەمەش دا هەڤدە فەسڵ «گاتا»ی پێ دەووترێ. «گاتا» و هەندێ لە بەشەکانی «یەشت» بە شیعر نووسراوەتەوە. شیعری ئاڤێستا لە سەر

کێشی «پەنجە، کەرت، بڕگە، سیلاب» دامەزراوە، ئەم کێشانە کێشی فۆلکلۆری خۆماڵین، لە شیعری نووسراوی کوردی کۆن و تازەش دا دەبینرێن.

بەڵام ئەوەی گرنگ بێ لە ئاڤێستا ئەو بیر و باوەڕە ئایینیی فەلسەفی‌یانەن کە بە شێوەییێکی هونەری و شاعیرانە گێڕراونەتەوە، بە تایبەتی نوێژ و پاڕانەوە و سکاڵا ئایینی‌یەکان، جگە لەو دانایی‌یە بیری‌یەی کە زەردەشت نوواندوویەتی.

## ج - کتێبی پیرۆزی هیندۆسان

ئەوەی ئاشکرایە ئەوەیە کە خودای هیندۆسەکان «برەهما»یە، ئەمە کردگارەو خاوەن و دروست کەری «بوون»ە، توانایی «برەهما» لەگەڵ «ڤیشنۆ» و «سیڤا» سێ کوچکەی خودایەتی ئایینی بوودی دروست دەکەن.

بوودا (بوودها گەوتاما Buddha Gautama) (دەوروبەری ٥٦٦ - ٤٨٦ پێش مەسیح) لە پلەی پێغەمبەری و دانایی بووە لە هیندستان، دامەزرێنەری ئایینی بوودی‌یە. لەقەبی «بوودا»ی دراوەتێ کە بە مانای «ڕووناکی، پرتەو» هاتووە.

ڤیدا

ڤیدا مانای «زانیاری»یە، ناوی کتێبی پیرۆزی هیندۆسەکانە، بە زمانی سانسکریتی نووسراوەتەوە، نوێژ و سروودی ئایینی‌یان تێدا تۆمار کراوە. پەیدا بوونی ئەم سروودانە لە ٢٥٠٠ ساڵ پێش مەسیحەوە دەست پێ دەکا تا ساڵی ٥٠٠ی پێش مەسیح لەو سەردەمە دا شێوەی دووایی وەرگرتووە.

ڤیدا لە نووسین و کردەوەی براهمای خودای بوودی‌یانە. لە چووار بەش پێک هاتووە، بەشە هەرە گرنگەکانی ڤیدا بریتی‌یە لە:

١- ریگ ڤیدا: کۆنترین کتێبی چووار کتێبە پیرۆزەکەیە، لە کۆمەڵێک سروود پێک هاتووە بە زمانی سانسکریتی، کاکڵ و ناوەرۆکی میتیۆلۆجیا و کۆسمۆلۆجیا و فەلسەفەی ئایینی برەهمایی تێدا نووسراوەتەوە.

٢- ئوپانیشەد: کۆمەڵە نامەییێکە لە ڤیدا باس لە بیر و باوەڕی فەلسەفەی ئاریی هیندی دەکا، ئەمە بەشێکی گرنگە لە ئەدەبی هیندی چونکە لە پەرستن و پێوەندیی بیر و باوەڕی ئایین دەدوێ.

هەرچی دوو بەشەکەی تری ڤیدایە «شاندوجیا» و «سواسانکەد» کەڵکێکی ئەوتۆیان نی‌یە لە ڕووی ئایینی و ئەدەبی‌یەوە.

## د - ئینجیل

ئینجیل ووشەیێکی گریکییە بە مانای «مژدە» هاتووە، «کتێبی پیرۆز» و «ڕۆژگاری تازە»شی پێ دەڵێن. ئەم کتێبە بریتییە لە کۆمەڵێک لە ووتە و کردەوەکانی مەسیح یا کریستۆ یا عیسای کوڕی مریەم پێغەمبەری دیانان، لای خۆیان و لای موسوڵمانان، بە چووار گێڕانەوە پێمان گەیشتووە. ئەو کەسانەی هەواڵەکانیان تۆمار کردووە دووانیان لە پلەی پێغەمبەری دان لای دیانان مەتا و یۆحەنا، دووانەکەی تریان لۆقا و مرقس لە قوتابیانی مەسیحن.

لە نیوەی دووەمی سەدەی یەکەم تۆماری هەر چووار تێکستی ئینجیلەکان وەکو لای خووارەوە نووسراوە تەواو بوو:

١- ئینجیلی مەتا: لە ساڵی ٥٠ بە زمانی ئارامی نووسرایەوە بۆ ئەو گاوورانەی فەلەستین کە لە بنج دا جوولەکە بوون و باوەڕیان بە ئاینی تازە هێنا.

٢- ئینجیلی مرقس: مرقس لە ساڵی ٦٤ ئینجیلەکەی نووسییەوە.

٣- ئینجیلی لۆقا: لۆقا لە ساڵی ٦٧ ئینجیلەکەی نووسییەوە، جگە لەمە لە ساڵانی ٦٨ - ٨٥م «کردەوەی پێغەمبەران»یشی نووسییەوە، ئەمە لە ئەدەبیاتی ئاینی گاووری دا لە ڕیزی ئینجیل دەوەستێ.

٤- ئینجیلی یۆحەنا: لە دووا ساڵانی سەدەی یەکەم ئینجیلەکەی نووسییەوە، جگە لەمە «خەون» و «سێ نامە»شی نووسییەوە کە لە ئەدەبیاتی گاووری دەژمێررێن.

ئەم چووار گێڕانەوەیە. لە ژیانی مەسیح کە لە ناوەڕۆک دا هەر یەکێکن و لە ڕوخسار دا هەندێ جیاوازییان تێدایە کارێکی گەورەیان کردۆتە سەر ئەدەبی گێتی بە تایبەتی ئەوروپایی و بوون بە سەرچاوەییێکی لە بن نەهاتوو بۆ داهێنانی تازە لە ئەدەب و هونەر دا لە هەموو گێتی دا.

ئەمە ئینجیلە باوەڕ پێ کراوەکانی کلیسەی دیانان بوون، لەلایەن زۆربەی هەرە زۆری هەموو تیرە و مەزهەبە وورد و درشتەکانیان، جگە لەمە ئینجیلی تریش هەیە، بەڵام باوەڕی پێ نەکراوە چونکە بە هەڵبەست حسێب کراوە و بە نارەسەن دانراوە وەکو «ئینجیلی برنابا» گۆیا بە زمانی ئیتالی لە پاش سەدەی سێزدەم لەلایەن نووسەرێکی

ئیتالی‌یەوە تۆمار کراوە.

ه - قورئان

«فورقان» و «زیکر» و «تەنزیل» و «مسحەف» و «کیتاب»یشی پێ دەڵێن، کورد «قورعان»ی پێ دەڵێ. کتێبی ئایینی موسوڵمانانە، بە زمانی عەرەبی پارچە پارچە و بەش بەشی بە شێوەی ئایەت لە خوداوە بۆ محەمەد پێغەمبەر نێرراوە، سرووش (جبریلی مەلایەکەت) هەڵگری ئەم پەیامە بووە.

قورئان باس لە عەقیدەی ئایینی ئیسلام دەکا، ژیانی ئەخلاقی و کۆمەڵایەتی ڕێک دەخا، جگە لەمە سەرچاوەییێکی یەکجار گرنگە بۆ داهێنانی ئەدەبی و کارێکی گەورەی کردۆتە سەر ڕۆشنبیری و کولتووری و ئەدەبی عەرەبی و هەموو نەتەوە موسوڵمانەکانی تر، جگە لەوەی قورئان خۆشی لە ڕووی دارشتنی ئەدەبی و هونەری‌یەوە گەیشتۆتە لووتکە و گەلێ وێنەی شیعری بەرزی دەور کردۆتەوە.

قورئان لە ١١٤ سوورەتی مەکی و مەدەنیی پێک هاتووە و بە سەر سی جزم و شەست حیزب دا دابەش کراوە. عوسمانی کوڕی عەففان (لە ٣٥ھ / ٦٥٦م کۆچی دوایی کردووە)ی خەلیفەی سێ‌یەمی ڕاشیدی هەموو بەشەکانی قورئانی کۆکردەوە و یەکی خست و ئەو نوسخەیەی کە لە ناوەوەیە ئەنجامی کردەوە گەورەکەی عوسمانی کوڕی عەففانە. بەم جۆرە دەبینین قورئان یەکێکە لە کتێبە هەرە گرنگەکان وەکو سەرچاوەییێکی ئەدەبی، بێ گومان کۆنترین کتێبێکە لەو ڕۆژگارانەی کە ئایەتەکانی هاتوونەتە خوارەوە وەکو خۆی بەبێ دەسکاری ماوەتەوە تا ئێستا.

قورئان ئاورێکی زۆری لە مێژووی پەیدا بوونی ئادەمزاد داوەتەوە لە سەر ڕووی زەوی، گەلێ لایەنی گرنگی مێژووی کۆن و ئایینەکانی پێش ئیسلامی خستۆتە ڕوو. دیارە سەرچاوەی یەکەمی هەرە گرنگیشە لە مێژووی پەیدا بوونی ئیسلام و بیروباوەڕەکانی.

هەندێ لە سوورەتەکانی قورئان بە ناوی پێغەمبەران و دانایان و پیاو چاکانی کۆنینە هاتووە، وەکو: نووح، هوود، ئیبراهیم، یووسف، یوونس، مریەم، محەمەد، تاها، لوقمان.

ڕووداوەکانی کۆن بە شێوەی چیرۆکی هونەری تایبەتی لە قورئانا دەگێڕڕێتەوە، لەمانە پەیدا بوونی ئادەمزاد لە سەر ڕووی زەوی لە ئەنجامی هەڵخەڵەتاندنی ئادەم و حەوا لەلایەن شەیتانەوە، کۆتایی ژیانی هەمیشەیی‌یان لە بەهەشت و دەست پێ کردنی ژیانی

سەر ڕووی زەوی. هەروەها ڕووداوی ژیانی دووەمی ئادەمزادیش دەگێڕێتەوە لە پاش تۆفانی نووح.

هەندێ گێڕانەوەی دڵداری تەلی سۆزی ئادەمزاد دەبزوێنێ، بەوەی وێنەی هەست و مەیلێکی سۆفیزمی گەرمی ناوەوەی ئادەمزاد دەگرێ و مانایێک دروست دەبێ کە بەهەمیشەیی و جاویدانی دەمێنێتەوە لە داهێنانی ئەدەبیدا، وەکو چیرۆکی یووسف لەگەڵ ژنی عەزیزی میسر (زولەیخای ژنی پوتیفار) و چیرۆکی سەراو پەردەی تەختی سلێمان لەگەڵ قەرالیچە جوانەکەی سەبەء (بەلقیس).

لە قورئانا باس لە خەباتی پێغەمبەران کراوە لە پێناوی بیر و باوەڕیان و هەرگیز کۆڵیان نەداوە و سوور بوون لە سەر هێنانە دی ئەو پەیامەی باوەڕیان پێ‌ی بووە، وەکو: ئیبراهیم پێغەمبەر بەرهەڵستی پیشەی باوکە دارتاشەکەی کردووە چونکە بتی بۆ نەتەوەکەی دروست دەکرد، لە پاشانا ئامادە بوو جگەرگۆشەی بکا بە قوربانی. لەلایێکی تریشەوە مووسا پێغەمبەر بەربەرەکانی فیرعەونی کرد، زۆرانبازی بوو لە نێوان بیروڕای «یەک خودا» و «چەند خودایێک». عیسا پێغەمبەر تا سەر قەنارەش بەربەرەکانی‌ی جوولەکە مێشک ووشکەکانی کرد ئەوانەی ئایینەکەیان کۆن بوو بوو و لە کەڵک کەوت بوو. محەمەد پێغەمبەر بەرهەڵستی هەموو ئێش و ئازار و بەربەرەکانی‌ی قورەیشی کرد، لە مەکەوە کۆچی کرد بۆ مەدینە و کۆڵی نەدا تا بیر و باوەڕەکەی لە سەر پارچەیێکی گەورە لە ڕووی زەوی و لە ناو تیرە و هۆز و میللەت و نەتەوەی جیاواز بڵاو بووەوە.

قورئان ڕووداو و پەندێکی زۆر دەور دەکاتەوە لە بارەی خراپەوە. خۆپەرستی لە قابیلەوە دەست پێ دەکا، برای دایک و باوکی دەکوژێ لە پێناوی چاکەی خۆی. چاوچنۆکی لە قاروون دەبینێ. جەردەیی و ڕێگری و فێڵبازی و نامەردی و بگرە تا ئەو ڕادەیەی کە نێرینە بەکار هێنان بۆ شەهوەت لە باتی مێیینە بە ئاشکرا لە قەومی لووت دەخاتە ڕوو.

نموونە بۆ دانایی و توانایی ئادەمزاد لە قورئانا زۆرە لە ئیبراهیم و یەعقووب و سلێمان و لوقمان و ئەسکەندەر دا دەبینرێ. گێڕانەوەکانی یاجووج و ماجووج و ئەسحابی کەهف نموونەی خوو و ڕەووشتی ناوەوەی ئادەمزاد و گۆڕانی ژیانن، ژن جێگەیێکی دیاری هەیە وەکو نیشانە و بەڵگەی گرنگ لە ژیانی ئادەمزاد دا.

لە قورئانا ناوی گەلێ لە ژنان هاتووە: ژنی نووح، سارە، ژنی عەزیزی میسر (زولیخا)، کچەکانی شوعەیب، دایکی مووسا، قەرالیچەی سەبەء (بەلقیس)، مریەم،

ژنی ئەبوولەهەب.

داوود وەکو هونەروەرێکی گەورە لە قورئان دا دەکەوێتە ڕوو، دانا و زانا بووە، کە ئایەتەکانی زەبووری بە ئاوازەوە خوێندۆتەوە دار و بەرد و باڵندە بۆیان گێڕاوەتەوە و تەسبیحاتیان لەگەڵ دا کردووە، لە زیکری نهێنیی ناوەوە و نادیاری سۆفیزمی بەشداری‌یان کردووە.

قورئان باسی کۆمەڵی ئادەمزاد و هۆز و قەومی پێغەمبەران و پیاو چاکان و پیاو خراپانی کردووە، هەر یەکەی کردووە بە بەڵگەی کردەوەیێک و ڕەووشتێکی ئادەمزاد، لەمانە: قەومی ئیبراهیم، توببەع، هوود (عاد)، ساڵح (سەموود)، لووت، فیرعەون، مووسا، سەبەء، شوعەیب، ئەسحابی ڕەس، قەریە، ڕەقیم، سەفینە، ئوخدود، فیل. باسی نەتەوەی ڕۆم و خەڵکی تریش کراوە. هەندێ لە سەر ئەو باوەڕەن کە مەبەسی لە ئایەتی «ستدعون الی قوم أولی بأس شدید» نەتەوەی کوردە.

تەواوی ئایەتەکە «قُلْ للمُخَلَّفِينَ منَ الأعْرابِ سَتُدْعَونَ الى قَومٍ أُولِي بَأسٍ شَديدٍ تُقاتلونَهم أو يُسْلِمونَ فَإِنْ تُطيعوا يُؤْتِكُمُ اللّهُ أجراً حَسَناً وإن تَتَولَوا كَما تولَيّتم مِن قبلُ يُعذِّبْكم عَذاباً أليماً» (سورة الفتح، الآية ١٦).

بەم جۆرە قورئان وەکو شاکارێکی ئەدەبی نەوەکو پێوەندیی بە عەرەب و نەتەوە موسوڵمانەکانەوە هەیە، بەڵکو چۆتە ناو سامانی مرۆڤایەتی‌یەوە.

## بەشی هەشتەم

# سەرەتاکانی ئەدەبی کوردی

ئەدەبی گێتی درەختێکی یەکجار گەورە و قەف ئەستوورە، لقی زۆر بڵند بۆتەوە بەرەو ئاسمان، دەماری پتەوی خووار بۆتەوە ناخی زەوی و پەلی هاوێشتووە بۆ هەموو لایێک ، گەیشتۆتە سەرچاوەی هەموو ئاوێک. لق و پۆپی کۆن و تازە تێکەڵ بە یەکتری بووە. بێ گومان ئەدەبی کوردی وەکو داهێنانێکی نەتەوەیی یەکێکە لە لقە هەرە گرنگەکانی ئەم درەختە لە کۆنی کۆنەوە تائێستا.

لە سەدەکانی ناوەڕاست دا، لە بەهارێکی تەڕ و جوان، توولە لە چرۆیێکی ئەو درەختە پشکووت، ئەو توولە نەمامە بە درێژایی ڕۆژگار بوو بە لقێک لە ئەدەبی ئەو زمانەی ئێستا کە نەتەوەی کورد قسەی پێ دەکا بەرهەم و بەری کەوتە ناوەوە.

مێژووی ئەدەبی کوردی بریتی‌یە لە «مێژووی قسەی جووانی کوردی» ، ئەو قسە جووانە بەشێک لە کولتوور و شارستانیەت و مەدەنیەتی نەتەوایەتی دروست دەکا. قسەی جووان هەموو ژیان دەگرێتەوە:

نیشتمانپەروەری، کوردایەتی، نەتەوایەتی، مرۆڤایەتی ، کۆسمۆپولیتی، دڵداری و دەسبازی و ماچ و مووچ و مێبازی، بە سەرهاتی نەتەوە، سامانی نەتەوایەتی، تاقی کردنەوەی گەلان، ژیانی کۆمەڵایەتی، دڵداریی سۆفیزمی، ئایین و بیر و باوەڕ، کارکردنی هونەر بە سەر ژیانی مرۆڤ، هەوڵ دان بۆ چاک کردنی باری ژیانی کۆمەڵایەتی، وێنەکێشانی هەست و نەستی ناوەوەی ئادەمزاد و گەلێ شتی تریش.

وێنەی ژیانی ڕاستەقینە و ئەو ژیانەی کە شاعیر و نووسەر دروستی دەکا پێویستە بە «قسەی جووان» بگیرێ، ئەگەر وێنەکە «قسەی جووان» نەبێ، ئەوا خاوەنی قسەکە شاعیر و نووسەر و هونەروەر نی‌یە، بەڵکو شتێکی ترە، مێژوونووسە، زانایە، ئەندازیارە، سیاسی‌یە، دیبلۆماسی‌یە، شارەزای پڕۆپاگەندەیە، هەموو شتێکە تەنیا شاعیر و نووسەر و هونەروەر نی‌یە، لەبەر ئەوە، نە ناوی نەکردەوەی ناچنە ناو دوو توێی مێژووی ئەدەبی نەتەوەوە.

هەزاران ساڵ پێش سەردەمی ئەمڕۆ لە سەر خاکی کوردستانی ئێستا مرۆڤی کۆن ژیاوە. ئەمە نەک بە پێی زانستی تازە کە ئەرکیۆلۆجی پێ دەڵێن، بەڵکو بەپێی داستانە ئایینی‌یە کۆنەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستیش باسی نەتەوە و خاک کراوە. لە کتێبی پیرۆز

(تەورات و ئینجیل) دا ناوی وولاتی ماد هاتووە، لە قورئانا کەشتییەکەی نووح لە سەر شاخی جوودی (مەتین) لەنگەری گرتووە پاش نیشتنەوەی تۆفان. شاخی جوودی بڕبڕەی پشتی خاکی کوردەوارییەو زنجیرەییێکە لە زنجیرەکانی شاخی زاگرۆسی کوردستان.

هەموو میللەتێک پێش دروست بوونی ئێستای کوڕی نەتەوە یا هۆز یا تیرە یا کۆمەڵی نەتەوەی کۆن بووە. ئەو نەتەوەیە یا ئەو نەتەوانە خاوەنی یەک ئەدەب بوون، بە هەر دوو بەشیەوە، ئەدەبی سەر زار و ئەدەبی نووسراو، ئەدەبی سەر زارەکە زۆر بووە، بەڵام ئەدەبی نووسراوەکە کەمتر بووە، بریتی بووە لە ئەدەبی ئایینی، یا کتێبی ئایینی پیرۆز، یا داستانی قارەمانی، لە دوواییی دا ئەم زمانە کۆن بووە و لە کار کەوتووە.

لە سەردەمی دروست بوونی نەتەوە (ناسیۆن Nation = الأمة) بە مانای ئەمرۆ، واتە دروست بوونی زمانی تازە بۆ ماوەییێکی درێژ دیسانەوە یەک ئەدەب لە ناوەوە بووە، ئەم ئەدەبە هێزی لە سامانی کۆن وەرگرتووە. ئێمە دەتوانین مێژووی ئەدەبی کوردی لەو رۆژەوە دیار بکەین کە بەرهەم بەم زمانە تازەیە پەیدا بووە و تۆمار کراوە، ئەگینا ئەدەبی کوردی بە تایبەتی ئەدەبی میللی (فۆلکلۆر) وەکو سامانی نەتەوایەتی دیارە لە باب و باپیرە هەرە کۆنەکانی کوردەوە دەست پێ دەکا.

وەکو ووترا لە کۆنا یەک ئەدەب لە ناوەوە بووە، ئەمە ئەدەبی باب و باپیرانی کوردی ئێستا بوو، واتە ئەو نەتەوە و هۆز و میللەت و کۆمەڵانەی لە سەر خاکی کوردستانی ئێستا ژیاوون، ئەمانە ئێرانییە کۆنەکان بوون، لە پێش ئەوانیش هیندۆ ئێرانییەکان و لە پێش ئەمانەش هیندو ئەوروپییەکان دەگرێتەوە.

هەرچەندە زیاتر بەرەو سەرەتاکانی مێژووی ئەدەبی کۆن بڕۆین، ئەوەندە زیاتر لە یەک چوونی ئەدەب و سەرچاوەی وەک یەکی لە نێوان نەتەوەکانی ئەم کۆمەڵانە تەسکتر دەبێ؛ یا بە شێوەیێکی تر ئەگەر لە سەرەوە دەست پێ بکەین، واتە لە کۆنەوە، کۆمەڵەکانی هیندو ئەوروپی (ئاری) لە جێی خۆیانا کولتوور و سامانی نەتەوایەتیی خۆیانیان بووە، کە کۆچیان کردووە و لقێک هاتوونەتە بانی ئێران و هیندستان و لەگەڵ خەڵکی ئەو خاکانە تێکەڵ بوون، ئەدەبی سەر زاری خۆیان هێناوە و جەوهەرەکەیان پاراستووە و لە پاشانا شتی تازەشیان خستۆتە سەر، واتە ئەم هیندۆ ئێرانییانە بریتین لە «هیندۆ ئەوروپی + شتی تازە = هیندۆ ئێرانی» ئینجا هیندۆ ئێرانییەکان لە خاکی نوێیان دا «ئێرانە وەیچە» شتی تازەیان خستۆتە سەر، واتە ئەم ئێرانییانە بریتین لە «هیندۆ ئێرانی + شتی تازە =

ئێرانی» ، ئینجا لە ئێرانییەکان نەتەوەی تازە دروست بوون، کە ئەمە لەگەڵ سەردەمی پەیدابوونی ئیسلام ڕێک دەکەوێ، ئەوەی پێوەندیی بە کوردەوە هەبێ تیۆرییەکە بەم جۆرەیە «ئێرانی + شتی تازە = کورد» ، ئیتر شتی تازەی دووایی جەوهەری نەتەوایەتیی کوردی ئێستایە. بەم جۆرە ئەگەر مەسەلەکە بدەینە دەست کۆمپیوتەر - ئەمەش وەنەبێ کارێکی بەجێ بێ لە زانستیی کۆمەڵایەتی دا - بەلای ئێمەوە دەبێ حسێبی تیۆرییەکەمان بەم جۆرە بۆ بکا: لە نیوەی زیاتر بۆ شتی تازە دادەنێ کە جەوهەری نەتەوایەتی کوردەواریی ڕەسەنە واتە ٥١ ٪ ، بەشەکانی تر بەم جۆرە دابەش دەکا: ئێرانی ٢٨ ٪ (ئەمە جەوهەر و ماکی عەرەبیش دەگرێتەوە کە لەگەڵ نەتەوە موسڵمانەکانی تر شارستانیییێک دروست دەکەن) ، هیندۆ ئێرانی ١٤ ٪ ، هیندۆ ئەوروپی ٧ ٪ .

## ئەدەبی سەر زاری نەنووسراو

لەو ڕۆژەوە کە ئادەمزاد هەستی بە جووانی خۆی و ژیان و سروشت کردووە تا ڕۆژی تۆمار کردنی ئەو قسە جووانانە تەنیا یەک ئەدەب لە ناوەوە بووە، واتە ئەدەبی میللی. ئەدەبی کۆمەڵی ئادەمزادی کۆن لە نەوەییێک بۆ نەوەییێکی تر بە میرات ماوەتەوە، بە ناو مێشک پارێزراوە و بە دەم ئەزبەر گێڕراوەتەوە.

ئەدەبی نەنووسراو بووە بە سەرچاوەییێکی گرنگ بۆ ئەدەبی نووسراو، ئەم ئەدەبە لە ناو جەرگەی ئەوەوە هەڵقوڵاوە. گەلێ لە بەرهەمە گەورە و مەزنەکانی گێتی ئەدەبی نەنووسراو بوون و لە پاشانا بوون بە ئەدەبی نووسراو، زۆربەی هەرە زۆری یەکەمین بەرهەمی کلاسیکی نەتەوەکان و گەلێ لە شاکارە ئەدەبییەکانیان، سەرچاوەی یەکەمیان ئەدەبی فۆلکلۆری بووە، شاکاری ئەدەبی کوردی «مەم و زین»ی ئەحمەدی خانی ئیلهامی لە «مەمی ئاڵان»ی فۆلکلۆری خەڵکی کورد وەرگرتووە.

لە دەوروبەری بڵاو بوونەوەی ئایینی ئیسلام نەتەوەکانی تازەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دروست بوون، لەو سەردەمەدا گێتیی ڕۆمانی (لاتینی) هێشتا لە ناوەوە بوو لە ئەوروپا ، بەشێکی زۆری ڕۆژاوای ئاسیا و سەرانسەری قەراغی زەریای سپیی ناوەڕاستیشی گرت بووە خۆی.

ئەدەبی میللی نەتەوە کۆنەکانی هیندۆ ئەوروپی و هیندۆ ئێرانی لە ئەفسانە و داستان و حیکایەت و گۆرانی، ماوەییێکی زۆر جەوهەری ئەدەبی فۆلکلۆری کوردی بوون. ئەدەبی کوردی لە ڕێڕەوی گۆڕانی دا سروشتی وولاتی کوردەواری و ژیانی کۆمەڵایەتی لەگەڵ ئەم

جەوهەرە کۆنانە تێکەڵ بە یەکتری کرد و لە ناو یەک دا تووانەوە، بۆیە ئەدەبی دیالێکتی گۆرانی لە سەرەتاوە تا ئێستاش لە ئەدەبی فۆلکلۆرییەوە نزیکە، هەروەها ئەدەبی کرمانجیی سەروو لە سەرەتاکانی دا لە ئەدەبی فۆلکلۆرییەوە نزیک بوو (ئەدەبی میللی) تا مەلای جزیری و ئەحمەدی خانی و پرتەوی هەکاری پەیدا بوون. لە کرمانجیی خوارووی دا ئەدەبی فۆلکلۆری، هەندێ جار بە هەوای دیالێکتی گۆرانی و ئینجا عەلیی بەردەشانی و هیتر لە ناوەوە بوون تا قوتابخانەی نالی پەیدا بوو.

## ئەدەبی کلاسیکی

مەبەس لە ئەدەبی کلاسیکی ئەدەبی نووسراوە پێش ئەوەی کلاسیکی بە مانای ئەدەبی بەرز بەکار بێنین. ئەدەبی کوردی ئەوەی هەوڵ دەدەین لەم ماوەیەدا مێژووی بنووسینەوە ئەدەبی دەوری ئایینی ئیسلامییە. واتە لەو ڕۆژگارانەوە کە زۆربەی خەڵکی کورد چوونە سەر ئایینی موسوڵمانی، بێ گومان لە ئەنجامی لێکدانی مەدەنیەتی هەموو ئەو نەتەوانەی بوون بە ئیسلام (عەرەب وەکو نەتەوەیێکی سامی خاوەنی ئایینەکە بوو، هیندو ئەورووپی، تورکو مەنگۆلی و هیتر) بووە هۆی ئەوەی مەدەنیەتی ئیسلامی دروست ببێ، وە ئەم دیاردەیە لە چووار چێوەی ئایین چۆتە دەرەوە و ئەم مەدەنیەتە تازەیە ئیسلام دەکا بە کۆمەڵێکی ئەتنۆلۆجی - ئەنترۆپۆلۆجی - ئەتنۆگرافی بە تایبەتی لە خوێندەواری و ڕۆشنبیری و بزووتنەوەی ئەدەبی و هونەری دا، ئەم ئەدگار و خاسیەتە تازەیە لە لێکدانی مەدەنیەتی هەموو ئەو نەتەوانە دروست بووە، کە بوون بە موسوڵمان.

هەندێ جار بۆ جیا کردنەوەی زاراوەی ئیسلامی ئەتنۆگرافی لە ئیسلامی ئایینی بۆ یەکەمیان زاراوەی (ئیسلامەوی) بەکار دەهێنرێ.

لەبەر ئەوەی مەدەنیەتی ئیسلامی کاری لە ئەدەبی کوردی کردووە، ئێمە لە ژێر ڕۆشنایی ئەم بیر و باوەڕەوە، مێژووی ئەدەبی کوردی دەنووسینەوە، هەوڵ دەدەین لەم کارەدا هەندێ لە مێژووی هەزار ساڵەی پڕ لە شانازی و نموونەی هەرە جووانی بەرهەمی ئەدەبی کوردی بخەینە ڕوو.

لە چییەوە ئەدەبی کوردی دەست پێ دەکا؟

تێکستی باوەڕ پێکراوی شیعر بە زمانی کوردی سەرەتا و سەردەمی شیعری کوردیمان بۆ دیار دەکا. لێرەدا لەبەر گەلێ هۆی تایبەتی کە لە سەرانسەری ئەم کارە دا ڕوون

کراوەتەوە، ئەدەبی کوردی بە دیالێکتە جیاوازەکانی زمانی کوردی پەیدا بووە. ڕاستە دەبێ سەرەتایێکمان هەبێ بۆ ئەدەبی کوردی بەگشتی، بەڵام دیارە ئەدەبی هەر دیالێکتێکیش سەرەتای خۆی هەیە.

دوو بەیتەکانی بابا تاهیر بە سەرەتای شیعری کوردی دادەنرێن بە شێوەییێکی گشتی، بلیمەتیەتی بابا تاهیر لەگەڵ بیر و باوەڕی ئایینی یارسان و سۆفیزمی کۆزمۆسی و گۆرانیی میللی ناوچەیی دوو بەیتەکانیان دروست کردووە.

شیعری ئایینی و لیریکی (غنائی) لە دیالێکتی گۆرانیدا کۆنترین شیعری زمانی کوردییە، لە سەدەکانی ناوەڕاستەوە پەیدا بووە و لە بەرزی و نزمی دا بووە تا سەرەتای سەدەی بیستەم، ئینجا کەوتۆتە کزییەوە تا دووای جەنگی گێتیی دووەمیش هەر لە ناوەوە بوو.

شیعری ئایینی و لیریکی لە دیالێکتی کرمانجیی سەروودا لە پاش ڕووداوە هەرە گرنگەکە، جەنگی چاڵدیران (١٥١٤) لە پێشانا بە شێوەی شیعری میللی، ئینجا شیعری خوێندەواریی بەرز کەوتە ناوەوە.

شیعری لیریکی (غەزەل و قەسیدە) لە دیالێکتی کرمانجیی خووارووا لە پاش دروست کردنی پایتەخت (سلێمانی) پەیدا بوو. ئەم بزووتنەوە ئەدەبییە کارێکی گەورەی کردە سەر پەرەسەندن و گۆڕانی ئەدەبی کوردی لە دووا ڕۆژ دا.

## بەشی نۆیەم

# شیعری کوردی لە ڕووی ڕوخسارەوە

شیعری کوردی لە ڕووی ڕوخسارەوە، بە تایبەتی لە بابەتی قەوارەوە، دەکرێ بە دوو بەشەوە، یەکەمیان «لیریک»، دووەمیان «ئیپیک» (ئێپۆس).

لیریک بە پارچە شیعرێکی کورت و قەوارە بچووک دووترێ، ئەمە تاک (فرد)، چووارین (رباعیە)، دوو بەیت، پارچە (قیتعە)، غەزەل، قەسیدە و گەلێ شتی تریش دەگرێتەوە.

هەرچی «ئێپۆس»یشە بە شیعرێکی درێژ و قەوارە گەورە دەووترێ، دەتووانین گەلێ زاراوەی تر بۆ ئەم جۆرە هونەرە بدۆزینەوە، وەکو چیرۆکی شیعری، داستان، مەلحەمە، کورد خۆشی «بەیت»ی پێ دەڵێ بە تایبەتی وەکو زاراوەیێک لە ئەدەبی میللی دا بەکار دەهێنرێ.

## لیریک

لیریکی کوردی لە ڕووی ڕوخسارەوە لەم وێنانەی خووارەوە دا خۆی دەنوێنێ:

١- تاک

بریتی‌یە لە دێرە شیعرێکی عەرووزی لە دوو نیوە دێرە شیعر پێک هاتووە، هەر دوو نیوە دێرەکە دەبێ لە سەر یەک قافیە بێ (ب ب). ئەم جۆرە شیعرە بۆ پەندی پێشینان و قسەی نەستەق و ووتەییێکی کورتی دانایانە و بیرێکی ژیری فەلسەفی‌یانە دادەنرێ. گەلێ دێرە شیعری غەزەل و قەسیدە بە تەنیا بۆ ئەم مەبەسە دەست دەدا، ئەگەر یەکێتی‌ی مانای تێدابێ، بەڵام دیارە تاکی پێ ناووترێ. واتە تاک دەبێ تەنیا یەک دێرە شیعر بێ.

٢- چووارین (روباعی)

چووارین بریتی‌یە لە شیعرێک لە دوو دێرە شیعری عەرووزی پێک هاتووە، واتە چووار نیوە دێرە شیعر. نیوە دێری یەکەم و دووەم و چووارەم لە سەر یەک قافیە دەبن، بەڵام نیوە دێری سێ‌یەم دەگۆڕێ (ا ا ب ا)، ئەمە چووارینی بێ گون (گونک)ی پێ دەڵێن. خۆ

ئەگەر هەر چووار نیوە دێرەکە لە سەر یەک قافیە بن ئەمەیان چووارینی تەواویان پێ دەووترێ. چووارینی بێ گون لە چووارینی تەواو زیاترە لەئەدەبی کوردی دا.

چووارین لە سەر کێشی عەرووزی هەزەج و ئەو کێشانەی لەوەوە دەرهێنراوون دەهۆنرێتەوە، بەڵام لە ڕێرەوی گۆڕرانی شیعری کوردی بە درێژایی ڕۆژگار چووارین بە کێشەکانی تری عەرووزیش کەوتۆتە ناوەوە.

چووارین پارچە شیعرێک یا کارێکی ئەدەبی سەربەخۆ و تەواوە بۆ مەبەسی سۆفیزم و دڵداری و فەلسەفە و شەراب و مەیخانە و پەند و قسەی نەستەق و دانایی و شتی تر بەکار دەهێنرێ. لە ئەدەبی تازەش دا هەیە و بۆ مەبەسی سیاسی و ڕەخنەی کۆمەڵایەتی دەخرێتە ڕوو.

کۆنترین شاعیری کورد بابا تاهیر، بەم جۆرە شیعرە زۆربەی هەرە زۆری هونەری خۆی نوواندووە. هەروەها دەبێ ئەوەش بزانرێ کە زۆرتر زاراوەی «دوو بەیت» بۆ چووارینەکانی بابا تاهیر بەکار دەهێنرێ، چونکە کێشی سووک و سفت و ناوەرۆکی دڵداری – سۆفیزم لە چووارینی تر جیای دەکاتەوە.

۳- دوو بەیت

زاراوەی دوو بەیت لەگەڵ چووارین لە ئەدەبی کوردی دا هاوسەرن، لە باتی یەکتری بەکار دەهێنرێن، چونکە لە زۆر ڕووەوە لە یەکتری دەکەن. دوو بەیت واتە دوو دێڕە شیعر، ئەوەی ئاشکراشە ئەوەیە کە دێڕی یەکەم و دووەمی هەموو غەزەل و قەسیدەییێکی عەرووزی لە ڕووی ڕوخسارەوە وەکو دوو بەیت (چووارین) وایە، چونکە هەر دوو نیوە دێڕی یەکەم لە سەر یەک قافیە دەبن، هەرچێ دێڕی دووەمیشە نیوە دێڕی یەکەمی دەگۆڕی و نیوە دێڕی دووەمی لە سەر قافیە بنچینەییەکەی شیعرەکە دەبێ، ئیتر هەر دوو دێرە شیعرەکە (دوو بەیت)ەو وەکو چووارین خۆیان دەنوێنن.

بەڵام ئێمە لێرە مەبەسمان ئەوەیە دوو بەیت بۆ هونەرێکی شیعری تر لە کوردی دا بەکار دەهێنرێ، ئەم هونەرە لە ئەدەبی دیالێکتی گۆرانی دا ئاشکراو دیارە، بە تایبەتی لە شیعری ئایینی یارسان. دوو بەیت لە سەر کێشی دە سیلابی و وەستان لە ناوەڕاست دەبێ و هەر چووار دێرە شیعرەکە لە سەر یەک قافیە دەبێ. شیعری بابا سەرهەنگی دەودانی و پیر شالیار و شا خۆشێن و بابا ناووس و هیتر بەم شێوەیە خۆیان دەنوێنن.

شیعری لیریکی خۆماڵی بە هەموو بابەتەکانییەوە لە دیالێکتەکانی گۆرانی و

کرمانجی‌ی سەروو دا نموونەییێکی ڕەسەنە لە ئەدەبی کوردی دا. زۆربەی لە سەر بنچینەی بەند دەهۆنرێتەوە، هەر بەندی بە شێوەی دوو بەیت دەکەوێتە ڕوو. ئەم بابەتە شیعرە هیچ پێوەندی‌ییێکی بە کێشی عەرووزەوە نی‌یە، بەڵکو لە سەر کێشی سیلابی خۆماڵی دەکێشرێ، کە ئەمیش واتە خۆماڵی کوردی لەگەڵ کێشی زمانە هیندو ئەورووپی و گرووپەکانی تری لە زمانانی هیند و ئێرانی لە یەک ڕەگ و ڕیشەن، کێشی بنچینەیی سیلاب بە تایبەتی لە دیالێکتی گۆرانی دە کەرتی‌یەو وەستان لە ناوەڕاست دایە. ئەمە کێشی هەرە باوی شیعری فۆلکلۆری کوردی‌یە لە هەموو دیالێکتەکانی زمانی کوردی دا. هەرچی قافیەشە لە سەر بنجی جووت قافیە دادەمەزرێ، واتە دوواییی نیوە دێری یەکەم لەگەڵ نیوە دێری دووەم لە هەر دێرە شیعرێک دا لە سەر یەک قافیە دەبێ (اا ب ب ج ج...).

٤- پارچە لیریکی دیالێکتی گۆرانی

شیعری لیریکی لە دیالێکتی گۆرانی دا لە باوترین هونەری شیعری‌یە لە ئەدەبی کوردی دا، زۆربەی هەرە زۆری شیعر لەم جۆرە هونەرەیە، لە ڕووی کێش و قافیەوە بە شێوەی خووارەوە خۆی دەنوێنێ:

(١) شیعرەکە لە ڕووی کێشەوە دە کەرتی دەبێ و وەستان لە ناوەڕاست دا دەبێ. دێری یەکەم تەنیا پێنج کەرت دەبێ، دەشێ ئەو نیوە دێرە پێنج کەرتی‌یە دووبارە بکرێتەوە و دەبێتە دێرێکی تەواو لە ڕووی قافیەشەوە، جووت قافیە دەبێ، واتە دێری یەکەم و دووەم لە سەر یەک قافیە دەبێ و سێیەم و چووارەم لە سەر قافیەییێکی تر، بەم جۆرە تا دوواییی شیعرەکە، ئەمە «مەسنەوی»شی پێ دەووترێ، ئەگەر دێری یەکەم و دووەم بە دێرێک حسێب بکەین، واتە بە پێی زاراوەی شیعری عەرووزی کە «تاک»ی پێ دەووترێ، بەم جۆرە نیوە دێری یەکەم و دووەم لە سەر یەک قافیە دەبێ، هەروەها دێرەکانی تریش (اا ب ب ج ج...).

(٢) شیعرەکە لە هەموو ڕووییێکەوە وەکو شیعری پێشوو دەبێ، بەڵام هەموو دێرەکانی لە سەر یەک قافیە دەبن، واتە یەکێتی‌ی قافیەی تێدا دەبێ.

(٣) شیعرەکە بە سەر کۆمەڵێک بەند (کووپلە) دابەش دەکرێ، هەر بەندی سێ نیوە دێر دەبێ و قافیەی تایبەتی‌ی خۆی دەبێ (ااا ب ب ب ج ج ج...).

(٤) شیعرەکە لە هەموو ڕووییێکەوە وەکو شیعری پێشوو دەبێ، بەڵام هەر بەندی چووار

نیـوە دێر شـیـعـر دەبێ و قـافـیـەی تایبـەتی‌ی خۆی دەبێ (ا ا ا ا ب ب ب ب ج ج ج ج..).

(٥) شـیـعـرەکە لە هەمـوو ڕوویێکەوە دیسـانەوە وەکو شـیـعـری پێشـوو دەبێ، بەڵام هەر بەندی شەش نیوە دێرە شیعر و لە سەر یەک قافیە دەبێ (ا ا ا ا ا ا ب ب ب ب ب ب ج ج ج ج ج ج...).

(٦) شـیـعـرەکە لە ڕووی کێشـەوە هەشت کەرتی دەبێ، بەڵام لە ڕووی قـافـیـەوە ڕەنگاو ڕەنگ دەبێ، بە زۆری جووت قـافـیە دەبێ (مەسنەوی)، واش ڕێک دەکەوێ یەکێتی‌ی قـافـیـەی تێدا دەبێ، واتە هەمـوو شـیـعـرەکە لە سەر یەک قـافـیـە دەبێ، هەندێ جاریش هەرسێ دێرە شـیـعـر لەسەر یەک قـافـیـە دەبێ، ئەمە لە شـیـعـری عـابیـدینی جاف ئاشکرا دیارە.

(٧) شیعرەکە لە ڕووی کێشەوە لە دە کەرت زیاتر دەبێ وەکو غەزەلی شیعری عەرووزی خۆی دەنوێنێ.

(٨) شـیـعـرەکـە لە سـەر بـنجی بـەند (کـوپلە) دادەمـەزرێ، هەر بەندی لە حـەوت دێڕ (چووارده نیـوە دێر) پێک دێ، هەمـووی لە سـەر یەک قـافـیـە دەڕوا، دێڕی دووایی (دوو نیـوە دێڕ) قـافـیـەی جیـا دەبێ و لە هەمـوو بەندێک دا دووبارە دەبێـتـەوە، ئەم هونەرە لە «تەرجیع بەند» دەکا.

(٩) بە دەگـمەن غەزەل لە سەر کێشی عەرووزی ڕێک دەخرێ و یەکێتی‌ی قافیەی تێدا دەبێ، وەکو غەزەل و قەسیدەی شیعری ئیسلامی.

٥- پارچە لیریکی کرمانجی

شـیـعـری لیـریکی دیالێکتی کرمـانجی‌ی سـەروو لە گـەڵێ ڕووەوە یەک بابەتە لەگەڵ شیـعری لیـریکی گـۆرانی، بە زۆری لە ڕووی کـێش و قـافـیـەوە وەک لای خـووارەوە خۆی دەنوێنێ:

(١) لیریکی هەشت کەرتی لە ڕووی کێشـەوە لە سەر بنچیـنەی بەند دادەمـەزرێ، هەر بەندی چووار دێرە شـیـعـرە، واتە وەکـو دوو بەیت یا چووارین خـۆی دەنوێنێ. لایەنگرانی عـەرووز هەر بەندێک (دوو بەیت = چووارین) دەکەن بە دێرە شـیـعـرێـک (دوو نـیـوە دێری عـەرووزی) و مـوسـەممەتی پێ دەڵێن. بەشێک لە شـیـعـرەکـانی عـەلی‌ی هەریری و مەلای

باتەیی لەم بابەتەن.

(٢) لیریکی حەوت کەرتی لە هەموو ڕوویێکەوە وەکو شیعری پێشوو وایە، تەنیا ئەوە هەیە لە ڕووی کێشەوە هەر دێڕ حەوت کەرتە.

٦- پارچە (قیتعە)

لە هەموو ڕوویێکەوە وەکو غەزەل وایە، هەندێ بە غەزەلی دادەنێن، هەندێکی تر جیای دەکەنەوە و ناوی دەنێن پارچە (قیتعە)، مەسەلەش تەنیا ژمارەی دێڕ شیعرەکەیە، لایەنگرانی پارچە لە سەر ئەو باوەڕەن، شیعر ئەگەر لە چووارین (دوو دێڕ = چووار نیوە دێڕ) ڕەت ببێ تا شەش دێڕ (دووازدە نیوە دێڕ) دەبێ «پارچە»ی پێ دەووترێ، بەڵام ئەگەر حەوت دێڕ بێ ئیتر غەزەلە. هەرچی لایەنگرانی زاراوەی «غەزەل»یشە لە سەر ئەو باوەڕەن هەر شیعرێک لە دوو دێڕ (چووار نیوە دێڕ) ڕەت بکا پێویستە «غەزەل»ی پێ بووترێ..

٧- غەزەل

بریتی‌یە لە پارچە شیعرێکی کورت لە سەر یەک کێشی عەرووزی و یەک قافیە دەبێ. هەندێ لە سەر ئەو باوەڕەن کە لە سێ دێڕەوە غەزەلی پێ دەووترێ، هی تریش دەڵێن، لە حەوت دێڕەوە دەست پێ دەکا. هەروەها لە بابەت ژمارەی گشتی‌ی دێڕەکانی‌یەوە دیسانەوە بیروڕای جیاواز هەیە، هەندێ دەڵێن تا دەگاتە دووازدە دێڕیش هەر غەزەلە، هی تریش دەیگەیێنە پازدە دێڕ، هی واش هەیە دەڵێن تا هەژدە دێڕیش هەر غەزەلە و لە پاشانا دەبێ بە قەسیدە.

زاراوەی غەزەل لەم ماوەیەدا تەنیا پێوەندی بە ژمارە و قەوارەی بەرهەمە شیعری‌یەکەوە هەیە، بە هیچ جۆرێ مەبەس لە مانای ووشەکە نی‌یە، «غەزەل» وەکو دڵداری و ئەڤین و پێوەندی‌ی دڵسۆزی‌ی نێوان ژن و پیاو. کورد کە دەڵێ «ئا غەزەلێکم بۆ بخوێنەوە» مەبەسی ئەوەیە شیعرێکی لەو قەوارەیەی کە باسمان لێوە کرد بۆی بخوێنێتەوە، جا ناوەرۆکەکەی گرنگ نی‌یە هەرچی دەبێ بابێ.

بێ گومان لە بنەڕەتیش دا ووشەی «غەزەل» هەر مانای دڵداری‌یە، ئەوەش ڕاستە کە شیعر بە خۆشەویستی و ئەڤینی دەستی پێ کردووە.

٨-قەسیدە

قەسیدە لە ئەدگاری دا وەکو غەزەل وایە، تەنێ لە ژمارەی دێڕ لە گەڵی‌دا دەگۆڕێ.

قەسیدە بریتی‌یە لەو پارچە شیعرەی کە لە هەژدە دێڕە شیعر تێپەڕ دەکا. واتە غەزەل لە ڕووی ڕوخسارەوە ئەگەر لە هەژدە دێڕ تێپەڕی کرد دەبێ بە قەسیدە. بێ گومان قەسیدە بۆ ڕووداوی درێژ و قسەی زۆر بەکار دەهێنرێ، بە تایبەتی ناوەرۆکی قارەمانی و ڕووداوی کۆمەڵایەتی و هەندێ جاریش دڵداری و ئایین (موناجات و نەعت) و هی تریش. گیانی مەلحەمی و ڕووداوی چیرۆکی لە هەندێ قەسیدەدا دەبینرێ، بەڵام بە هیچ جۆرێ قەسیدەی عەرووزی نابێ بە چیرۆکی شیعری یا مەسنەوی یا داستانی خۆماڵی و ئێپۆس و پۆیێمی (چیرۆکی شیعری تازە) ئەورووپایی حسێب بکرێ.

٩- شیعری پێنجینە بەند = پێنجین (موخەممەس)

جۆرە هونەرێکە لە ڕووی ڕوخسارەوە بریتی‌یە لە پارچە شیعرێک لە سەر کێشێکی عەرووزی دەبێ و بە سەر چەند بەندێک دابەش دەکرێ. هەر بەندی بریتی‌یە لە پێنج نیوە دێڕ شیعر، هەموو نیوە دێڕەکان لە بەندی یەکەم دا لە سەر یەک قافیە دەبن، هەرچی بەندەکانی تریشە چووار نیوە دێڕی یەکەم لە سەر یەک قافیە دەبن، کە ئەمە قافیەی نیوە دێڕی یەکەمی دێڕە شیعرەکەیە، نیوە دێڕی پێنجەمیش لە هەموو بەندەکان دا لە سەر قافیەی بەندی یەکەم دەبێ (ا ا ا ا ا ب ب ب ب ا ج ج ج ج ا).

شاعیرانی کلاسیکی کورد ئەم جۆرە قاڵبەیان بۆ بەشێک لە هونەری شیعریان بەکار هێناوە، بە زۆریش قەسیدەی پێنجین بۆ ناوەرۆکی درێژ بەکار دەهێنرێ، هەروەها ئەم بابەتە شیعرە بۆ ماوەیێکی زۆر باو بوو و بووە هۆی مشتوماڵ کردنی هەست و زەوقی نەوەکانی داهاتوو، ژمارەییێک لە شاعیرانی کۆن و تازەی کورد بابەتی پێنجینیان بەکار هێناوە بۆ دەربڕینی هەست و وێنە گرتنی خەیاڵ و بزووتنەوەی ناو دڵ و دەروونیان.

شاعیرانی وەکو پرتەوی هەکاری و ئەدەب و بێخود و هی‌تر بە پێنجینیان ئەدەبی کوردی‌یان دەوڵەمەند کردووە.

١٠- شیعری چووارینە بەند (مورەببەع)

شیعری چووارینە بەند لە ڕووی روخسارەوە بریتی‌یە لە پارچە شیعرێک لە سەر بنچینەی بەند دامەزراوە، هەر بەندی بریتی‌یە لە چووار نیوە دێڕ شیعر، هەموو نیوە دێڕەکان لە بەندی یەکەم دا لە سەر یەک قافیە دەبن، هەرچی بەندەکانی تریشە سێ نیوە دێڕی یەکەم لە سەر یەک قافیە دەبن، کە ئەمە قافیەی نیوە دێڕی یەکەمی دێڕە شیعرەکەیە، نیوە دێڕی چووارەمیش لە هەموو بەندەکان دا لە سەر قافیەی بەندی یەکەم

دەبێ (ا ا ا ا ب ب ب ا ج ج ج ا...) واتە لە دروست بوونی وەکو پێنجین وایە، تەنیا جیاوازیی لەگەڵ ئەودا ئەوەیە کە ئەمەیان هەر بەندی بریتی‌یە لە چووار نیوە دێڕ.

شیعری چووارینە بەند لە دیوانی شاعیرانی وەکو پرتەوی هەکاری و بێخود و هی‌تر بەدی دەکرێ.

١١- پێنج خشتەکی

پێنج خشتەکی بریتی‌یە لە بەرهەمی دوو شاعیر. ئەو شاعیرەی پێنج خشتەکی دروست دەکا، واتە شاعیری دووەم، شیعری شاعیرێک دیاری دەکا، سێ نیوە دێڕ شیعر دەخاتە سەر نیوە دێڕی یەکەمی هەموو دێڕە شیعرەکانی غەزەلەکە، واتە هەر دێڕە شیعرێک (دوو نیوە دێڕ) دەبێ بە پێنج نیوە دێڕ شیعر، سێ نیوە دێڕی یەکەم هی شاعیری دووەمە و دوو نیوە دێڕەکەی تر هی شاعیری یەکەمە، لەبەر ئەوەیە پێنج خشتەکی پێ دەڵێن. ئیتر بەم رەنگە وەکو چۆن خاوەنی غەزەلەکە نازناوی خۆی دەخاتە دێڕی دووایی شیعرەکەیەوە، شاعیری دووەمیش نازناوی دەخاتە یەکێ لەو سێ نیوە دێڕە شیعرەی کە بۆ دێڕی هەرە دووایی رێکی دەخا.

ناو و نیشانی پێنج خشتەکی لەئەدەبی کوردی بەم جۆرە دەبێ «پێنج خشتەکی‌ی سالم لە سەر غەزەلێکی نالی» واتە سالم غەزەلێکی دیار کراوی نالی کردووە بە پێنج خشتەکی (تەخمیس کردووە). پێنج خشتەکی بە شێوە وەکو پێنجین وایە، بەڵام ئەویان لە بەرهەمی دوو شاعیرە و پێنجین بەرهەمی شاعیرێکە.

١٢- تەرجیع بەند

بریتی‌یە لە کۆمەڵێک غەزەل، بە زۆری لە دووازدە پارچە غەزەل پێک دێ، دەبێ ژمارەی دێڕی غەزەلەکان هێندەی یەک بن، واتە غەزەلی یەکەم چەند دێڕ بێ پێویستە غەزەلەکانی تریش هێندەی ئەو بن، لێرەدا هەر غەزەلێک لە دووازدە دێڕ تێ ناپەڕێ. هەموو غەزەلێکی تەرجیع بەندەکە بە دێڕە شیعرێکی دیاری کراو دووایی‌یان دێ.

بە گشتی ئەم جۆرە شیعرە بۆ مەبەسی ئایینی بەکار دەهێنرێ، دیارە لە بنەڕەتیش دا بۆ گۆرانی‌ی ئایینی دەهۆنرێتەوە لە مەولوود و کۆبوونەوە و کۆڕی زیکری دەروێشان گۆرانی بێژ بەدەم ئاوازی دەف و تەپڵەوە غەزەلی یەکەم دەچڕێ تا دەگاتە دێڕی دووایی ئەمەیان کۆرسی دەف ژەنەکان یا دانیشتووان بە ئاوازەوە دەیگێڕنەوە. غەزەلی دووەم یا هەر ئەو گۆرانی بێژە دەیچڕێ یا گۆرانی بێژێکی تر، دیسانەوە دێڕی دووایی بۆی دەگێڕنەوە، بەم

جۆره تا غەزەلەکان هەموویان تەواو دەبن.

لە ئەدەبی تازەدا ئەم هونەرە بۆ مەبەسی کوردایەتی و سیاسی و کۆمەڵایەتی و نیشتمانی بەکار هێنراوە. بۆ بەڵگە حەمدیی ساحیبقران زنجیرەیێک لەم جۆرە شیعرەی داناوە بە ناوی «تەرجیع بەندی نیشتمانی»یەوە.

١٣- تەرکیب بەند

وەکو تەرجیع بەند وایەو تەنیا جیاوازییەکەی لەوە دایە کە دێری دوواییی (خەرجە)ی هەموو بەندێک دەگۆڕێ، واتە دێڕەکە دووبارە و سێ بارە نابێتەوە وەکو تەرجیع بەند.

١٤- موستەزاد

شاعیر لە هونەری موستەزاد دا جۆرە وەستاییییێکی ئەندازیاری دەنوێنێ بەوەی غەزەلێک دەهۆنێتەوە لە سەر یەک کێش و یەک قافیە. لە پاشانا هەموو نیوە دێڕێک بە ڕستەیێک دەبەستێتەوە، ئەم ڕستەیە زیادەکەیە کە دەچێتە سەر هەموو نیوە دێڕەکانی شیعرەکە، بە مەرجێ ئەم زیادانەش بە تەنیا هەموویان لە سەر یەک کێش و یەک قافیە دەبن، بەڵام ئەوە هەیە غەزەلەکە بە تەنیا بێ زیادەکان غەزەلێکی ئاساییییە و ئەگەر بەبێ زیادەکانیش بخوێنرێتەوە مانا بە دەستەوە دەدا، بەڵام زیادەکان ئەگەر بە تەنیا وەکو بەرهەمێکی تایبەتی بخوێنرێتەوە مانای تەواو بە دەستەوە نادەن، بەڵکو ئەم زیادانە هەر نیوە دێڕێک دەبێ بەشی کەرەوە و ڕوون کەرەوەی ئەو نیوە دێڕە غەزەلەی کە دەچێتە سەری.

شاعیرانی وەکو پرتەوی هەکاری و نالی بابەتی موستەزادیان هەیە.

١٥- مولەممەع

مولەممەع ئەو شیعرەیە کە بە زیاتر لە زمانێک ڕێک دەخرێ، بێ گومان لە شیعری کوردی دا بۆ مەبەسی مولەممەع زمانانی عەرەبی و فارسی و تورکی بەکار دەهێنرێن. شاعیری کورد لەم جۆرە هونەرەدا هەوڵ دەدا هەندێ نیوە دێڕ یا دێڕی تەواوی شیعر بە زمانێک یا زیاتر لەو سێ زمانە دەر ببڕێ، دیارە دەبێ لە مانا دا هەموو ڕستەکان بە زمانە جۆراو جۆرەکانەوە لەگەڵ یەکتری بگونجێن و مەبەسی گشتیی شاعیر بە دەستەوە بدەن.

لە ئەدەبی کوردی دا مولەممەع لای ئەم شاعیرانەی خوارەوە و هیتریش دەبینرێ:

(١) مەلای جزیری عەرەبی و فارسی بەکار هێناوە.

(٢) نالی عەرەبی بەکار هێناوە.

(٣) سالم فارسی بەکار هێناوە.

(٤) مستەفا بەگی کوردی فارسی و عەرەبی و تورکی بەکار هێناوە.

(٥) شێخ رەزا فارسی و عەرەبی و تورکی بەکار هێناوە.

ئەوەی شایانی باسە ئەوەیە کە تێکهەڵکێشی ڕستەی زمانی بێگانە لە شیعری کوردی دا مولەممەع نی‌یە، بەڵکو ئەویش هونەرێکی ترە و «تێکهەڵکێش»ی پێ دەڵێن، بە زۆری ئایەتی قورئان و حەدیسی پێغەمبەر بۆ ئەم مەسەلەیە لە شیعری ئایینی دا (موناجات و نەعت) بەکار دەهێنرێ.

## ئێپیک

ئێپیک (ئێپۆس) ئەو جۆرە بەرهەمەیە کە گیانی چیرۆکی تێدایە لە جێ و سەردەم و قارەمان و جووڵانەوە، لە ڕووی قەوارە و کێش و قافیەوە بە سەر دوو بەش دا دابەش دەکرێ:

١- بەیت

بەیت بە قەوارە زۆر درێژ نی‌یە، زمانی میللی‌یە و ڕستەی ساکارە و زۆربەی خەڵک تێ‌ی دەگا. کێش خۆماڵی (سیلاب)یە و قافیەی ڕەنگاوڕەنگە و لە سەر بنجی بەند (کووپلە) دادەمەزرێ، بۆ مەبەسی گۆرانی ووتن دادەنرێ.

٢- چیرۆکی شیعری (داستان = مەسنەوی)

چیرۆکی شیعری بە قەوارە درێژە، زمانی سفت و پتە و (کلاسیکی)یە، زیاتر پێوەندی‌ی بە خوێندەوار و ڕۆشنبیرەوە هەیە، لە ڕووی کێشەوە عەرووزی - سیلابی‌یە، لە ڕووی قافیەشەوە جووت قافیە (موزدەویج)ە (ا ا ب ب ج ج د د...).

## کەرەستەی جووانکاری (ئێستێتیکی)

### غەزەل و قەسیدە

زمانی شیعری نەتەوە موسوڵمانەکان (ووشەی فەرهەنگی و لیکیکۆن) کارێکی گەورەی کردۆتە سەر غەزەل و قەسیدەی کوردی ئەوەی پێڕەوی عەرووز و یەکێتی‌ی قافیەی کردووە، بە تایبەتی لە سەدەکانی شازدەمەوە تا سەرەتای سەدەی بیستەم. غەزەل

و قـەسیـدەی کوردی بە گشتی و ئەوەی خەریکی سۆفیـزم و پاڕانەوە (موناجات) و نەعت (بۆ پێـغـەمـبـەر) و پێدا هەڵدان (مـەدح) و شـانازی (فـەخـر) بوون کەوتبوونە ژێر کـار و زەبری زمـانـی عـەرەبی‌یەوە، بە تایبـەتی ووشـە و زاراوەی زۆری فـەلسـەفـە و سـۆفـیـزم و شەریعەت و دەروێشیزم (تەریقەت) لە ناو ئەم جۆرە شیعرە دا بەدی دەکران.

ئەوی ڕاستی بێ ئەم کۆمەڵە زاراوە و ووشە و ڕستانە لە غـەزەل و قـەسیـدەدا لە شیـعری کـلاسیـکی‌ی فـارسی و تورکی دا بەکـار دەهێنران. جگە لەمە، تا پلەیێک شـیـعـری کـوردی کەوتبووە ژێر کاری ڕەوانبێژی (بلاغە)ی عەرەبی‌یەوە، یاری کردن بە ووشە و مـانا، دروست کردنی تـەنگوچەڵەمە بە ئانقەست، دانانی شیعری بێ نوختە، ڕێک خستنی شیعری داخراو (موعەمما) یەکێ بوو لە ئەدگارە گرنگ و دیارەکانی شیعری کلاسیکی کوردی.

هەمـوو جـۆرە جـووانکاری‌یە ووشـەیی و مـانایی‌یەکـانی عـەرەبی لە ڕووی مـەشق و پراکـتـیکەوە لە شـیـعـری کـلاسـیکی کـوردی بەدی دەکـرێ، وەکـو: حـوسنی فـەسـاحـەت، تەرسـیع، فـەواسـیل، تەبدیل، جیناس و هەمـوو بەشـەکـانی، ئیـسـتـیـعـارە، سیـحـەتی تەقسیم، سیـحـەتی موتەقـابیـلات، موتابەقـە، تەزمین، ئیـسـتـیـحالە، هەموو بەشەکانی بەلاغەت، تەرجیع.

ئەم دیاردەیە لـە ئەدەبی کوردی دا لـەگـەڵ ئەوەی تەنیـا سـوودی ڕۆشنبـیر و خـوێندەواری بەرزی تێـدا بوو، زۆربەی هەرە زۆری خـەڵکی نەخـوێندەوار و نیـمـچـە خـوێندەوار تێ‌ی نەدەگەیشتن و کەڵکیـان لێ وەرنەدەگرت، بەڵام لەگەڵ ئەوەش دا سـوودی زۆر بوو، بەوەی کە زمـانی کـوردی دەوڵەمـەند کرد، گەلێ ووشە و زاراوەی هێنایە ناو زمـانی ئەدەبی‌یەوە. هەروەها تەکنیـکی شیـعر و جۆری بیر کردنەوەی شاعـیریەتی بڵاو کردەوەو وێنە و مـانای تازەی خسـتە گێتی‌ی ئەدەبی کوردی‌یەوە. بەم ڕەنگە ئەگەر کەڵکی بۆ سەردەمی خۆی زۆر نەبووبێ چونکە خـوێندەوار کـەم بوون، کـەڵکی بـۆ نەوەکـانی داهاتوو و ئـێسـتـا و دووا ڕۆژیش زیاتر دەبێ.

ئەو بەرهەمە کلاسیـکی‌یە بەرزانە هەمیـشەیین و بۆ هەمـوو سـەردەم و ڕۆژگـارێک دەست دەدەن چونکە ماکی نەمری دایهێناوون.

## نازناو

نازناو (تەخەلوس) یەکێکە لە کردەوەکانی شاعیری کورد، بریتی‌یە لەوەی بە زۆری لە

دێری دووایی، یا پێش ئەو لە هەر غەزەل و قەسیدەیێک دا نازناوی خۆی تۆمار دەکرد. هەندێ جار ئەم نازناوە پێوەندیی بە ئایین یا بنەماڵە، یا سۆفیزم یا نیشتمان پەروەری یا موعەمما یا وەرگرتن لە شاعیرانی غەزەلی نەتەوەکانی تری موسوڵمانەوە بووە، وەکو: مەلا (مەلێ)، خانی، پرتەو، شەفیع، خانە، بێسارانی، نالی، سالم، کوردی، مەولەوی، حاجی، ئەدەب، حەریق، مەحوی، وەفایی، ناری، نیعمەتی، بێخود، خاکی، خەستە، مەجدی، ئاهی، سافی (صافی)، حەمدوون، حەمدی، ئەسیری (ئەثیری)، زێوەر، کانی، کەمالی و هی‌تر...

بەکار هێنانی نازناو لەلای شاعیرە تازەکانیش دا باوە، بەڵام ئەوە هەیە وەکو ناوێک شاعیرەکان پێ‌ی دەناسرێن و بەرهەمیان لە دیوان و ڕۆژنامە و گۆڤار دا بەو ناوە بڵاو دەکەنەوە، ئەگینا وەکو شاعیری کۆن نازناویان تێکهەڵکێشی ناو شیعرەکانیان ناکەن، چونکە ئەگەر کۆنەکان ترسی ئەوەیان بوو بێ شیعرەکانیان بدزرێن، چاپەمەنی و ڕۆژنامەگەری لە سەردەمی ئێستا دا ئەو ترسەی لە ناو بردووە، بە زۆری نازناوی شاعیری سەردەم پێوەندی بە ژیانی خۆی و کۆمەڵ و سیاسەت و خاک و نیشتمان و سامانی نەتەوایەتی‌یەوە هەیە، وەکو: پیرەمێرد، بێ کەس، دڵدار، گۆران، جگەرخوێن، هێمن، کامەران، هەردی، دیلان، دڵزار، کاکەی فەلاح، هاوار، مەدهۆش و هی‌تر...

## بەشی دەیەم

# شیعری کوردی لە ڕووی ناوەڕۆکەوە

مێژووی هەزار ساڵەی پڕ شانازیی ئەدەبی کوردی، بەرهەمێکی جوان و بەرز و نایاب و ڕەسەنی هەمەجۆر و ڕەنگاوڕەنگی لە سەرەتای پەیدا بوونیەوە تا سەردەمی تازە کردنەوەی ئەدەبی خستۆتە ناو لاپەڕەی تۆماری ووشەی نەمرەوە. بەرهەمی ئەدەبی کوردی ڕەنجی دڵسۆزی و هەست و نەستی ناوەوەی شاعیرانی سەدان ساڵی دووایییە. ئەدەبی نەنووسراوی میللی کارێکی گەورەی کردۆتە سەر بەرهەمی ئەدەبی کلاسیکیی نووسراوەوە.

جوگرافیای خاکی کوردەواری و بەسەرهاتی سیاسیی پڕ لە تەنگو چەڵەمەی کۆمەڵی کورد ناچاری کرد بوو سەدان ساڵ لە ناو ئیمپیراتۆریەتە گەورەکان بە پارچە کراوی بمێنێتەوە، ئەمە بووە هۆی ئەوەی بەرهەمی ئەدەبی کوردی بکەوێتە ژێر کاری ڕێباز و گۆڕرانێکی تایبەتی، وە لە دوواجارا بووە هۆی ئەوەی شێوەو سیمایێکی تایبەتی وەربگرێ، لە ئەنجامدا بەرهەمی ئەدەبی کوردی بە دیالێکتە سەرەکییەکانی زمانی کوردی بە درێژایی ڕۆژگار کەوتە ناوەوە.

لەگەڵ ئەوەش دا هەندێ جار تووشی بەرهەمی ئەدەبی وا دەبین کە ئەدگاری دیالێکتە بچووک و ناوچەییەکانیشی پێوە دیارە، بەڵام بە زۆری بەرهەمی هەزار ساڵەی تەمەنی ئەدەبی کوردی بە دیالێکتەکانی زمانی کوردی وەکو لوڕی و گۆرانی و کرمانجی (سەروو و خووارووو) بووە.

ڕێباز و گۆڕرانی ئەدەبی کوردی لەو ناوچەیەی دیالێکتی تایبەتی زمانی کوردی تێدا باو بوو، قاڵب و شێوەی خۆی هەبوو، لە ماوەی چەند سەدەیێک، ئەدەبی هەر ناوچەیێک، ڕەنگدانەوەی خاسیەتەکانی ناوچەکە بوو. لەبەر ئەوەی ئەدەبەکە هەر یەک ئەدەب بوو و لە یەک سەرچاوەی گشتییەوە هەڵقوڵا بوو، پارێزگاریی خۆی کرد. جیاوازییەکەش بە چاکە گەڕایەوە، چونکە بووە هۆی ئەوەی بابەتی ڕەنگاوڕەنگ و روخساری جۆراو جۆر و ناوەڕۆکی هەمە بابەت لە ئەدەبی کوردی دا پەیدا ببێ. هەر

دیالێکتێک لەم دیالێکتانە تاقی کردنەوەی هونەریی خۆی هێنایە ناو ئەدەبی گشتیی نەتەوەی کوردەوە، بەمە دەوڵەمەندتر و بە پێزتر بوو.

بەرهەمی ئەدەبی کوردی لە ڕووی ناوەڕۆکەوە لە تێکڕای دیالێکتەکانی زمانی کوردی دەکرێ بە دوو بەشەوە:

١- لیریک

٢- ئیپیک

## لیریک

لیریک پارچە شیعرێکی کورتە لە مەبەسەکانی دڵداری و جووانی و سرووشت و ژیانی کۆمەڵایەتی - سیاسی و دانایی و ئایین و فەلسەفە و سۆفیزم و بزووتنەوەی دەروونی ئادەمزاد و ناوەرۆکی تر دەدوێ. بە زۆری جێگە و سەردەم و بزووتنەوە و قارەمانی زۆری تێدا نی‌یە، لە بنەڕەت دا، لە کۆنەوە بۆ مەبەسی گۆرانی چڕین دادەنرا.

لە ئەدەبی کوردی دا لیریک دەکرێ بە دوو بەشەوە:

١- شیعری لیریکی خۆماڵی ٢- شیعری لیریکی ئیسلامی (ئیسلامەوی)

١- شیعری لیریکی خۆماڵی

شیعری لیریکی خۆماڵی لە ڕووی ناوەڕۆکەوە هەر یەکێکە لەگەڵ لیریکی ئیسلامی، تەنیا لە ڕووی ڕووخسارەوە لێی جیا دەبێتەوە، بەوەی لیریکی خۆماڵی لە سەر کێشی سیلاب دەهۆنرێتەوە و بایەخێکی زۆریش بە یەکێتیی قافیە نادرێ، هەروەها ووشە و ڕستە و تەعبیری لیریکی ئیسلامی تێدا بەکار ناهێنرێ. ئەم لیریکە خۆماڵی‌یە تایبەتی‌یە بە دیالێکتەکانی گۆرانی و لوڕی و کرمانجیی سەروو، لە دیالێکتی کرمانجیی خوواروو دا نابینرێ، لە ئەدەبی فۆلکلۆری دا نەبێ.

ئەوەی جێگەی سەرنج ڕاکێشانە ئەوەیە لیریکی خۆماڵی لە زمانی ستانداردی خەڵکی کوردەوە نزیکە، لەبەر ئەوە دەشێ «شیعری میللی»یشی پێ بڵێین. زیاتر شاعیران ئەم شێوەیان گرتووە بۆ ئەوەی دەنگی خۆیان بگەیێننە زۆربەی خەڵکی. ئەم دیاردەیە لە ئەدەبی کلاسیکی کوردی قوتابخانەی نالیش پەیدا بوو، نوێنەری ئەم ڕێبازە حاجی قادری کۆیی بوو لە بەشی میللیی شیعرەکانی، لە پاشانا شێوازە (ئوسلووب) کە بۆ مەبەسی سیاسی - کۆمەڵایەتی لە لایەن شاعیرانی کوردەوە بەکار هێنرا تا دووای جەنگی یەکەمی گێتی.

٢- شیعری لیریکی ئیسلامی (ئیسلامەوی)

ئەم جۆرە شیعرە لە ڕووی ناوەڕۆکەوە لەم بابەتانە پێک دێ:

(١) پاڕانەوە (موناجات = ئیلاهیات)

بە زۆری لە شێوەی قەسیدە دا دەبێ، ناوەڕۆکی بریتی‌یە لە پاڕانەوە لە خودا و وەسف کردنی گەورەیی و توانایی لەبەر ڕۆشنایی بیر و باوەڕی موسوڵمانی. لە گەلێ شت دا لەگەڵ شیعری ئایینی عەرەبی یەکتری دەگرنەوە. سەرچاوەی ئەم جۆرە شیعرە قورئان و شەریعەتی ئیسلامی‌یە، شاعیر پشت بە ئایەتی قورئان دەبەستێ و وەکو خۆی وەری دەگرێ و هەر بە زمانی عەرەبی لەگەڵ ڕستەکانی شیعرەکەی تێکهەڵکێشیان دەکا. زمانی ئەم جۆرە شیعرە تێکەڵە، شاعیر ووشە و زاراوەی عەرەبی ئایینی زۆر بەکار دەهێنێ.

(٢) نەعت (پێدا هەڵدان و پاڕانەوە لە پێغەمبەر)

ئەم جۆرە شیعرە لە هەموو ڕوویێکەوە وەکو موناجات وایە، بەڵام تایبەتی‌یە بۆ پێغەمبەر، لێرەدا زیاد لە قورئان و ئەدەبیاتی ئایینی شاعیر بە زۆری حەدیسی پێغەمبەریش تێکهەڵکێش دەکا. گەلێ جار قەسیدەی موناجات و نەعت تێکەڵ بە یەکتری دەبن و بەرهەمەکە بۆ هەر دوو مەبەس دەست دەدا، چونکە بە ڕاستیش هەر یەکەیان ئەویتر تەواو دەکا، بە تایبەتی قەسیدەی نەعت ناکرێ لە موناجات جیا بکرێتەوە. زۆربەی شاعیرانی کلاسیکی‌ی کورد لەم هونەرەیان هەیە.

(٣) غەزەل

غەزەل بەو شیعرە دەووترێ کە ناوەڕۆکەکەی لە بابەت دڵداری و ئەڤین و خۆشەویستی و دەسبازی و ماچ و مووچ و بەزم و ڕەزمی ژنانەوەیە. شاعیر لە غەزەل دا وەسفی لەش و لار و خوو و ڕەووشت و جووانی و نازەنینی ژنان دەکا. لە کۆنا ناوەڕۆکی غەزەل دەکرا بە پێشەکی بۆ هەموو بابەتەکانی شیعری لیریکی، بەڵام لە دووایی دا «غەزەل» بوو بە مەبەسێکی تایبەتی‌ی سەربەخۆ لە ئەدەبی هەموو نەتەوە موسوڵمانەکان دا.

ئەگەر چی لە بنج دا غەزەل هەست و نەستێکە بەرامبەر بە مێیینە بەڵام لە ئەدەب دا لە ڕۆژگارانی گۆڕڕانی دا غەزەلی نێرینەش پەیدا بوو. ئەم بابەتە بەرهەمە لەئەدەبی کوردی دا کەمە، زیاتریش وەسف کردنی کوڕ و نوواندنی دڵداری و خۆشەویستی و سۆزە بەرامبەر بە نێرینە، لە بەرگێکی سۆفیزمیانە جێگەی خۆی لە شیعری کوردی دا کردۆتەوە.

هەندێ جار ئەم دوو بابەتە، واتە غەزەلی کوڕ و غەزەلی کچ تێکەڵ بە یەکتری دەبن و

گێتیی‌یێکی سۆفیزم دروست دەکەن. جاری واش هەیە هەر دوو «غەزەل»ەکە بە «عەشق» دەزانن و زاراوەی «عەشقی حەقیقی» و «عەشقی مەجازی» بەکار دەهێنن.

غەزەلی سۆفیزم بریتی‌یە لە تەم و مژێکی گیانی، سۆز و خۆشەویستی‌یێکی ئەوتۆی دروست کردووە، هەندێ جار وا دەزانی ئەم خۆشەویستە کوڕە، هەندێ جاریش وا دەزانی کچە، جاری تریش تێکەڵ بە یەکتری دەبن و نەکوڕ و نەکچە، ئەمە لای ئەوان «موتلەق»ە خۆی لە کردگار دا دەنوێنێ. جاری واش هەیە غەزەل (خۆشەویستی) لە نێوان سۆفیزم و دڵداری ڕاستی دا دەوەستێ.

(٤) وەسف

وەسف بۆ مەبەسی وێنەگرتنی دڵبەر لە ڕووی جووانی‌ی ئەندامی لەشیەوە بەکار دەهێنرێ. هەروەها باس کردن و کێشانی دیمەنی سروشت جێگەیێکی دیاری لە هونەری وەسف دا هەیە. جگە لەوە وەسف خەریکی هەموو ڕووداوەکانی سروشتیشە وەکو ئاژەڵ و زیندەوەر و ڕووەک، بۆ جەنگ و سووار چاکیش بەکار دەهێنرێ. لەبەر ئەوەی وەسفی ئەم بابەتە ڕووداوانە، واتە جەنگ و سووار چاکی و شەڕ و شۆڕ پێویستی‌ی بە پشووی درێژ هەیە شیعرەکە لە هەژدە دێرە شیعر تێپەڕ دەکا و دەبێتە قەسیدە. ئەم مەبەسە بێ گومان لەگەڵ شیعری دڵداری تێکەڵ دەبێ بە تایبەتی ئەگەر شیعرەکە پێوەندی‌ی بە وەسفی جووانی یارەوە هەبێ.

(٥) پێدا هەڵدان (مەدح)

ناوەرۆکی ئەم جۆرە شیعرە بریتی‌یە لە پێدا هەڵدان و دەرخستن و پیشان دانی خوو و ڕەووشتی چاک لەو کەسەی کە شیعرەکەی بۆ دادەنرێ. لەم جۆرە شیعرەدا تەنیا کردەوەی باشی ئادەمزاد وەردەگیرێ و کردەوەی خراپ پشت گوێ دەخرێ. دیارە مەرجیش نی‌یە ئەو کەسەی مەدح دەکرێ خاوەنی ئەم ڕەووشت و کردەوە چاکانە بێ کە شاعیر بۆی هەڵدەبەستێ. بە زۆری ئەم جۆرە شیعرە لە خووارەوە بۆ سەرەوە دەبێ، واتە کەسی بێ دەسەڵات ئەم بابەتە شیعرە دادەنێ بۆ کەسی زەبر بە دەست بۆ ئەوەی سوودی لێ وەربگرێ. هەندێ جاریش لە باوەڕەوە شاعیر مەدحی گەورەیێک یا زانایێک یا داهێنەرێک دەکا کە شایانی ئەو مەدحەیە.

(٦) شانازی (فەخر)

شاعیر لەم جۆرە شیعرەدا خۆی یا بنەماڵەی یا هۆز و عەشیرەتی وەکو شتێکی دیار و

پایەدار لە ناو کۆمەڵ دا پیشان دەدا. ئەم جۆرە شیعرە پێوەندی بە توانایی شاعیریەتێکی بەرزەوە هەیە، هەروەها دەبێ هەست و نەستێکی قووڵیشی تێدا بێ، بە تایبەتی دۆزینەوەی کەرەستە بۆ بەراوورد کردن. زمانی ئەم بابەتە شیعرە سفت و بەهێز دەبێ. هەندێ جاریش لە شانازی خۆ و بنەماڵە دەچێتە دەرەوە و خەریکی مێژوو و بە سەرهاتی نەتەوە دەبێ، وەکو شانازی کردن بە قارەمان و گەورە پیاو و کار بە دەست و زانا و داهێنەر و شاعیر و هونەروەری نەتەوە.

(٧) ماتەمنامە (مەرسیە)

ئەم جۆرە شیعرە وەکو پێدا هەڵدان (مەدح) وایە، بەڵام بۆ مردوو بەکار دەهێنرێ، هەندێ جاریش شاعیر پێش مردنی خۆی ماتەمنامە بۆ خۆی دادەنێ، کە بێ گومان دەبێ بە وەسیەتنامەیێک، ماتەمنامە نایابەکەی مستەفا بەگی کوردی لەم بابەتەیە.

(٨) ریسوا کردن (هەجوو)

ئەم جۆرە شیعرە بە پێچەوانەی پێدا هەڵدانە، واتە دەرخستن یا دروست کردنی خوو و ڕەووشتی خراپ بۆ ئەو کەسەی ریسوا دەکرێ، شاعیر لەم بابەتە شیعرەدا مەسەلە گەورە دەکا و ووشە و ڕستەی جنێوکاری بەکار دەهێنێ. دیارە ریسوا کردن ناچێتە ناو ڕەخنەوە، بەڵام بە هەموو جۆرێ ووردەکاری و جووانکار (ئیستێتیکی)ی تێدایە.

(٦) شیعری کراوە (مەکشووف)

شیعری کراوە بۆ مەبەسی باس کردن و دەرخستنی شتومەکی شاراوەی ژن و پیاو بە ئاشکرا بەکار دەهێنرێ. لەبەر ئەوەی لە ناو کۆمەڵ دا باس کردنی ئەم جۆرە شتانە شەرمە، بەم جۆرە شیعری کراوە خۆی دەبێ بە ریسوا کردن (هەجوو). لە ئەدەبی کوردی دا ئەم جۆرە شیعرە بۆ گەلێ مەبەس بەکار دەهێنرێ. بێ گومان لە کاتێک دا دروست دەبێ کە دوو بیرورا بە پێچەوانەی یەکتری دەبن دژ بە یەک دەوەستن.

بەشێکی زۆر لە شیعری کراوەی کوردی هیچ پێوەندییێکی بە ریسوا کردنەوە نییە، وورد و جووان و هێمن و لە سەرخۆ شاعیری کورد توانیویەتی وێنەی هونەریی بەرز بنوێنێ لەم بابەتە شیعرەدا، بۆ وێنە شیعرە کراوەکەی «مەستوورە کە حەسناو و ئەدیبە بە حیسابێ»ی نالی، یا پێنجینەکەی ئەدەب بۆ نەسرەت خانمی ژنی «دوێ شەو شەوی شەمبە..». بەڵام بە زۆری لای شێخ ڕەزا بۆ مەبەسی جنێو و ریسوا کردن بەکار هێنراوە. وە ئەوەی ئاشکراشە ئەوەیە لەلای شێخ ڕەزا ئەگەر چی وێنەکانی هونەروەرانە داڕێژراوون

و هەندێ جاریش تابلۆی کاریکاتێری زۆر جووان دەکێشێ بەڵام ئەندامی شاراوەی ژن و پیاو تێکەڵ بە یەکتری دەکا، بە تایبەتی زۆریش خەریکی هەتیو بازیە چونکە لە کۆمەڵی کوردەواری دا ئەو کوڕەی بە هەر هۆیێک خراپ بکرێ چاو شۆڕ دەبێ هەتا مردن. لەلای شێخ ڕەزا بە زۆری شیعری ڕیسوا کردن و شیعری کراوە تێکهەڵکێش کراون و بۆ یەک ئامانج بەکار هێنراون.

## ئیپیک

ئیپیک (ئێپۆس) ڕووداو و بەسەرهاتە بە شیعر دەهۆنرێتەوە، بە زۆری ناوەرۆکی لە ئێپۆسی فۆلکلۆر وەردەگرێ، بەڵام شاعیری کورد بەو دەسکاری و داهێنانەی کە تێیدا خەرج دەکا، بەرهەمێکی ڕەسەنی تازەی تۆمار کراو دێنێتە ناو ئەدەبی کوردیەوە. ئیتر زۆربەی ئەم بەرهەمە شیعری بەدرێژە دلّداریە ڕۆمانتیکیانەیە لە بارەی سووار چاکی و قارەمانی و ڕاووشکار و شەڕ و شۆڕەوەیە.

ئیپیک لە ڕووی ناوەرۆکەوە دەکرێ بە دوو بەشەوە:

١- بەیت

بەیت وەکو بابەتێکی چیرۆکی شیعری زیاتر بۆ مەبەسی گۆرانی چڕین دادەنرێ، خەریکی دلّداری و خۆشەویستی و سروشتە، هەروەها ڕووداوی مێژووی قارەمانیەتی و پاڵەوانیی نەتەوە لە شۆڕش و جەنگ و بەرگری لە نیشتمان دەگرێتەوە. ئەم جۆرە شیعرە «بەیتی مێرانی»شی پێ دەڵێن.

ئەدەبی کوردی کلاسیکی بە تایبەتی ئەدەبی دیالێکتی کرمانجیی سەروو بەرهەمی نایابی لەم بابەتەمان بۆ دەور دەکاتەوە، وەکو بەیتەکانی فەقێی تەیران «شێخی سەنعان» و «بەیتی فەقێ تەیران بەر ئاڤێ را خەبەر دایە»، بەرهەمی بە ناوبانگی مەلای باتی «بەیتی زەمبیل فرۆش» و هیتر.

٢- چیرۆکی شیعری

چیرۆکی شیعری داستان و مەلحەمە و مەسنەویشی پێ دەڵێن، لە دیالێکتەکانی گۆرانی و کرمانجیی سەروو باو بووە و بەرهەمێکی زۆر لەم بابەتەوە کەوتۆتە ناوەوە. ئەم جۆرە شیعرە پێوەندیێکی ڕاستەوخۆی بە میللەتەوە هەیە، هونەرێکی ڕەسەنی خۆماڵیە، ناوەرۆکی لە حیکایەتی بەر گوێی ئاگردان و گێڕانەوە و تاقی کردنەوەی پێشینان وەردەگرێ، بە سەرهات و سەر و سەر بردەی قارەمانان و بنەماڵە و هۆز و عەشیرەتی کورد

له پێشانا دەبێ بە هەوێنی شیعری فۆلکلۆری، ئینجا ئەم بەرهەمە فۆلکلۆرییە دەبێتە سەرچاوە بۆ چیرۆکی شیعری تۆمار کراو. ئەگەر ناوەرۆکی هەندێ چیرۆکی شیعری کوردی لەگەڵ چیرۆکی شیعری نەتەوە هاوسێکان یەکتری بگرنەوە، لەبەر ئەوەیە سەرچاوەی هەموویان یەکێکە. جگە لەوە سەرچاوەی ئایینیش بە تایبەتی لە رووی سۆفیزمەوە کاری بە سەر شیعری چیرۆکی کوردی دا هەیە. هەروەها ناوەرۆکی حیکایەتی ئایینیی سامیی کۆن و حیکایەتی عەرەبیش جێی خۆیان لە ناو چیرۆکی کوردی کردۆتەوە، ئەم ناوەرۆکە بێگانانە بە راستی ئەدەبی کوردییان دەوڵەمەند کردووە، چونکە وەستایانە لەلایەن شاعیرانی کوردەوە وەرگیراون و ئەدگاری کۆنیان وون کردووە و بوون بە کوردی، بەم رەنگە رووداوەکان بە جەوهەرێکی کوردی دووبارە خراونەتە روو.

لە رووی سەرچاوە و ناوەرۆکەوە دەتووانین چیرۆکی شیعری کوردی بەسەر سێ بەشدا دابەش بکەین:

(١) ناوەرۆک و سەرچاوەی سامی و عەرەبی

لە پێشانا ئایینی کۆنی سامیەکان، ئینجا تەورات و ئینجیل و قورئان بوون بە سەرچاوە بۆ نووسینەوەی چیرۆکی شیعری لە ناو نەتەوە موسوڵمانەکان دا لە پاش داهاتنی ئایینی ئیسلام. بێ گومان کوردیش بەشداریی لەم کارەدا کردووە، ئەمە بە ئاشکرا لە چیرۆکی شیعری «یووسف و زولەیخا» دا دەردەکەوێ. ئەدەبی کوردی دوو بەرهەمی لەم بابەتەمان بۆ دەور دەکاتەوە، یەکەمیان «یووسف و زولەیخا»ی سەلیمی سلێمان (سەدەی هەڤدەم)، دووەمیان «یووسف و زولەیخا»ی حاریسی بدلیسی (سەدەی هەژدەم).

لە سەرچاوە عەرەبییەکان دا رووداوی دلّداریی لەیلا و مەجنوون دەورێکی بالّای لە چیرۆکی شیعری کوردی دا هەیە، بە درێژایی رۆژگار شاعیر و نووسەرانی کورد بایەخیان بە چیرۆکی میللی لەیلا و مەجنوون داوە. بەم جۆرە گەلێ تێکستی جۆراو جۆری ئەم چیرۆکە کەوتۆتە ناوەوە، لەمانە «لەیلا و مەجنوون»ی مەلا محەمەدی قولیی کەندوولّەیی لە سالّی ١٧٣٢ لە نووسینەوەی بۆتەوە؛ «لەیلا و مەجنوون»ی حاریسی بدلیسی لە سالّی ١٧٥٨ تەواوی کردووە، «لەیلا و مەجنوون»ی میرزا شەفیعی جامەرێزی کولیایی (سەدەی نۆزدەم)؛ «لەیلا و مەجنوون»ی مەلا مەحموودی بایەزیدی، بە پەخشان دایناوە و لە ١٨٥٨ تەواوی کردووە؛ «لەیلا و مەجنوون»ی مەلا وەلەدخان (سەدەی نۆزدەم).

جگە لەمانە حیکایەتی غەزای پێغەمبەر و ئەسحابە و فەرماندە بەرایی‌یەکانی ئیسلام ڕەنگیان لە چیرۆکی کوردی داوەتەوە، بۆ وێنە غەزا و بە سەرهاتی محەمەدی حەنیفە لە چیرۆکی شیعری کوردی دا جێگەی دیاری هەیە.

هەروەها بەرهەمێکی یەکجار زۆری ئەدەبی کوردیش لە ناوەوەیە لە بابەت مێژووی ژیان و بە سەرهاتی پێغەمبەرەوە، لە ئەدەبی کوردی و لە ناو خەڵک دا بە «مەولوودنامە» ناوی دەرکردووە.

(٢) ناوەرۆک و سەرچاوەی کۆنی خۆماڵیی پێش ئیسلام

ئەمە بریتی‌یە لە هەموو حیکایەت و بە سەرهات و داستان و ئەفسانە و گێڕانەوە هەرە کۆنەکانی کە دەگەڕێنەوە پێش ئیسلام، واتە سەردەمی کۆچی هیندۆ ئەورووپی و هیندۆ ئێرانی‌یەکان، بە تایبەتی سەردەمی هەزار ساڵەی پێش ئیسلام. لەمانە بۆ بەڵگە «شیرین و فەرهاد یا شیرین و خوسرەو»ی خانای قوبادی (سەدەی هەژدەم)؛ «جیهان گیرو ڕۆستەم»ی میرزا شەفیعی جامەڕێزی (سەدەی هەژدەم)؛ «بارام و گوڵەندام»ی شاعیری نەناسراوی کوردی سەدەی نۆزدەم و گەلێکی تریش.

دیارە ناوەرۆکی هەموو ئەم چیرۆکە شیعری‌یانە تەنیا خەریکی سەردەمی پێش ئیسلام نی‌یە، بەڵکو هی پاش ئیسلامیشیان تێدایە، وەکو «شەڕی نادر شا»ی میرزا شەفیعی جامەڕێزی.

(٣) ناوەرۆک و سەرچاوەی کوردی

ئەم بابەتە چیرۆکی شیعری‌یە ناوەرۆکی لە گێڕانەوە و حیکایەت و بەیتی فۆلکلۆری میللی‌یەوە وەردەگرێ، واتە ڕووداوەکانی تایبەتین بە کۆمەڵی کورد و قارەمانەکانی کوردن، ڕەنگدانەوەی ئامانج و ئاواتی میللەتن لەو ڕۆژگارەی کە شاعیری میللی یا کلاسیکی ڕووداوەکان دەخاتە قالبی «چیرۆکی شیعری»یەوە. شاکاری هەرە گەورەی ئەدەبی نەتەوەی کورد «مەم و زین»ی خانی لەم جۆرە بەرهەمەیە.

***

لە دوای ئەم پیشان دان و لێکۆڵینەوە لە ئەدەبی کوردی‌دا لە ڕووی ڕوخسارو ناوەرۆکەوە دەگەینە راستی یێک ئەویش ئەوەیە ئەدەبی کوردی لە دوو شێوازدا خۆی دەنوێنێ، یەکێکیان خۆماڵی‌یەو ئەویتریان لە ئەنجامی لێکدانی مەدەنیەتی هەر چووار نەتەوە هاوسێکە (عەرەب و فارس و تورک و کورد) کە بە ئاینی موسوڵمان دروست

بووە. یەکەمیان شیعری لیریکی و چیرۆکی شیعرییە دووەمیان غەزەل و قەسیدەیە، بەرهەمی ئەدەبی کوردی کە بە شێوازی غەزەل و قەسیدە هاتۆتە ناوەوە ڕەسەن و کوردانەیە وەک شیعری لیریکی و چیرۆکی شیعری.



وێنەی ئارامگا کۆنەکەی بابا تاهیر
لە هەمەدان



وێنەی ئارامگا تازەکەی بابا تاهیر

لە هەمەدان

## بەشی یازدەم

## بابا تاهیر

## ٩٣٧ - ١٠١٠

### ژیانی بابا تاهیر

بابا تاهیری عوریانی هەمەدانی، ناوی تاهیرە. بابایان پێ ووتووە چونکە یەکێ بووە لە فریشتە و پیاو چاکانی ئەهلی هەقی یارسان. بەکار هێنانی ووشەی «بابا» لە پێش ناو بۆ رێبەرانی ئایینی یارسان و تەریقەتی دەروێشیزمی ئیسلامی لە کوردەواری دا هاوشانی ووشەی «پیر» بەکار دەهێنرێ. هەروەها «عوریان»یان پێ ووتووە، یا خۆی ئەم ناوەی بۆ خۆی هەڵبژاردووە، واتە «ڕووت، ڕووتەڵە»، چونکە باوەڕی بە فەلسەفەی سۆفیزم بووە، وەکو تیۆرییێک و لە شێوەی دەروێشیزم دەری بڕیوە وەکو پراکتیک. ئینجا هەمەدانییان پێ ووتووە، چونکە لە هەمەدان ژیاوە و هەر لەوێش کۆچی دوایی کردووە و نێژراوە. لە شیعر دا ناوی ڕاستەقینەی خۆی کە «تاهیر»ە، بەکار هێناوە وەکو نازناو.

کۆنترین سەرچاوەیێک هەواڵی ژیانی بابا تاهیری تێدا نووسرابێ کتێبەکەی ڕاوەندییە. محەمەدی کوڕی عەلیی سلێمانی ڕاوەندی لە ساڵی ٥٩٩ھ/ ١٢٠٢م کتێبی «راحة الصدور وآية السرور در تاريخ آل سلجوق»ی داناوە. لە ساڵی ١٣٣٣ بە کۆششی محەمەد ئیقبال و دانانی پەراوێز و پێرستەکان لەلایەن موجتەبا مینەوییەوە چاپ کراوە.

ئەم کتێبە باس لە دیدەنی نێوان سوڵتان توغرول بەگی سەلجووقی و بابا تاهیر دەکا، لێرەدا دانەر دەیەوێ ئەوە دەربڕێ کە پلە و جێگەی دەروێش و سۆفییان لەو دەورەدا باڵا بووە، ڕووداوی دیدەنییەکە بەم جۆرە دەگێڕێتەوە: «بیستم لەو کاتەی کە سوڵتان توغرول بەگ هاتە شاری هەمەدان، ئەولیای سۆفییان سێ پیر بوون، بابا تاهیر و بابا جەعفەر و شێخ حەمشا. لەلای شاخێک کە ناوی خدر بوو لە دەروازەی هەمەدان وەستا بوون. کە سوڵتان چاوی پێیان کەوت، پیاوەکانی خۆی ڕاگرت و خۆشی لە ئەسپ هاتە خووارەوە و

لەگەڵ وەزیری ئەبوونەسری کەندەری بەرەو ڕوویان هات و ویستی دەستیان ماچ بکا.

بابا تاهیر لەو کاتەدا لە حاڵەتی جەزب (جذب) دا بوو و ڕووی کردە سوڵتان و پێی ووت: ئەی تورک دەتەوێ چی لەگەڵ خەڵکی خودا بکەی؟ ووتی: ئەوەی ئەمر دەکەی ئەوە دەکەم. بابا تاهیر پێی ووت: ئەوە بکە کە خودا دەیەوێ، خودا دەڵێ: (إن الله يأمر بالعدل والاحسان). سوڵتان دەستی کرد بە گریان و ووتی: وا دەکەم. بابا تاهیر دەستی گرت و پێی ووت: ئەم دیاریە لەمن وەردەگری؟ سوڵتان ووتی: بەڵێ. ئیتر بابا تاهیر گەرووی مەسینە شکاوەکەی لە ئەموستی دەرهێنا، ئەوەی بۆ ماوەیێکی زۆر بۆ دەسنوێژ بەکاری هێنا بوو، وە لە ئەموستی سوڵتانی کرد و پێی ووت: من هەموو سامانی سەر زەویم خستۆتە ناو دەستت، لەوکاتەی کە ئەم ئەموستیلەیە لە ئەموستت دەکەم، داد پەروەر بە. سوڵتان دیاریی بابا تاهیری پاراست و بۆ هەر شەڕێک بچووایە لە دەستی دەکرد.

ئەوی ڕاستی بێ ئەوەیە کە بە تەواوی ساڵی لە دایک بوونی بابا تاهیر ئاشکرا نییە. لە سەرچاوەیێک دا ئەوە هاتووە کە «بابا تاهیرکوڕی فەریدوونە، لە ساڵی ٤١٠ھ/ ١٠١٩م لە ژیانا بووە، لە بەڵگەیێکی ڕاستگۆ بیستراوە کە هەر لەو ساڵەش دا کۆچی دووایی کردووە». هەندێ لە سەر ئەو باوەڕەن کە لە (٣٢٦ھ/ ٩٣٧م - ٤١٠ھ/ ١٠١٩م) دا ژیاوە، هەندێکی تر دەڵێن لە (٣٩٠ھ/ ٩٩٩م - ٤٥٠ھ/ ١٠٥٨م) دا ژیاوە، بەشێکیش بە هاوچەرخی ئیبنی سینا (٤٢٨ھ/ ١٠٦٣م مردووە)ی دادەنێن، هی واش هەیە بە هاوچەرخی خواجە نەسیرەدینی تووسی (٦٧٢ھ/ ١٢٧٣م مردووە)ی دادەنێن.

تەزکەرە نووسەکان سەردەمی جیاواز بۆ ژیانی بابا تاهیر دیاری دەکەن، ئەوانەی کە بە هاوچەرخی عەینو لقوزاتی هەمەدانی (٥٢٥ھ/ ١١٣٠ مردووە) دادەنێن دیارە لە ڕاستی دوور کەوتوونەتەوە، خۆ ئەوەی بە هاوچەرخی خواجە نەسیرەدینی تووسیشی دادەنێ، دیارە زیاتر لە ڕاستی دوور کەوتۆتەوە.

ڕەزا قولی خانی هیدایەت دەڵێ: «تاهیری عوریانی هەمەدانی ناوی پیرۆزی بابا تاهیرە، لە زانا و دانا و عاریفانی سەردەمی خۆی بووە، خاوەنی کەرامات و مەقاماتی بڵند بووە، هەندێ بە هاوچەرخی سوڵتانەکانی سەلجووقی دادەنێن، ئەمە ڕاست نییە، بابا تاهیر لە شێخە کۆنەکانە، هاوچەرخی دێلەمییەکان بووە، لە ساڵی (٤١٠ھ) پێش عونسوری و فیردەوسی و هاوچەرخەکانی ئەوان کۆچی دووایی کردووە».

هەر لە بابەت دیاری کردنی سەردەمی لە دایک بوونی بابا تاهیرەوە، میرزا مەهدی خانی کەوکەب پەنا دەباتە بەر یەکێ لە دوو بەیتەکانی بابا تاهیر کە دەڵێ:

مو ئان بەحروم کە دەر زەرف ئامەدەستوم
مو ئان نوقتە کە دەر حەرف ئامەدەستوم
بە هەر ئەلفی ئەلف قەددی بەر ئایو
ئەلف قەددوم کە دەر ئەلف ئامەدەستوم

ئەم دوو بەیتە بە حیسابی ئەبجەد ساغ دەکاتەوە و ڕستەی «الف قد الف = ا. ل. ق. د. ا. ل. ف» دەکاتە ٣٢٦ھ بە ساڵی لە دایک بوونی بابا تاهیری دادەنێ.

سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٦، لە (میرزا مهدی خان کوکب، شرح حال بابا طاهر، مجله آسیای بنگاله، ١٩٠٤)ی وەرگرتووە).

«جگە لەم حسێبی ئەبجەدی‌یە، بەلای ئێمەوە ئەم دوو بەیتە نهێنی و موعەممایێکی زۆری تێدایە و ئەستووری‌ی فەلسەفەی بابا تاهیر دەخاتە ڕوو لەبارەی یەکێتی‌ی بوونەوە، ئێمە وا بۆ لێکدانەوەی ئەم دوو بەیتە دەچین:

(شاعیر دەڵێ من ئەو زەریایەم کە لە قاپێکی بچووک دا خۆم دەنوێنم، واتە من لە هەموو «بوون» پێک هاتووم، بەلاّم لە قالّبی کەسێک دیار کەوتووم، وەکو چۆن قاپێک ئاو یا دڵۆپە ئاوێک نموونەی زەریاییێکە.

من ئەو نوختەیەم کە لە حەرفەوە هاتووم. حەرف بەرامبەر بە زەریا و نوختەش بەرامبەر بە قاپەکەیە. هەروەها مەبەسی لە حەرف مانای «بسم الله الرحمن الرحیم»ە، بەم جۆرە ئەگەر نوختەییێک بێ لە «بسم الله» دەبێتە بەشێک لە خودا.

لە هەر ئەلفێک پەیکەر و قەد و قامەتی وەک ئەلف پەیدا دەبێ. مەبەس لە ئەلفی یەکەم تیپی (ا) یەکە ڕەمزی (١) تاکە یەکێکە واتە خودا، ئەلفی دووەم قەد و قامەت و ووجودی خۆیەتی کە ئەویش لە وێنەی (١) دایە، لەم ڕستەیەدا شاعیر دەیەوێ بڵێ خۆی بەشێکە لە خودا.

قەد و قامەتم کە وەکو ئەلف (ا) وایە، لە ئەلف (خودا) وە هاتووم.

هەر چۆنێک بێ بەپێی سەرچاوە باوەڕ پێ کراوەکان بابا تاهیر لەماوەی نێوان نیوەی دووەمی سەدەی دەیەم و نیوەی یەکەمی سەدەی یازدەمی مەسیحی ژیاوە، لە دایک بوون و کۆچی دوایی بە ساڵانی (٣٢٦ھ/ ٩٣٧م - ٤٠١ھ/ ١٠١٠م) دیاری کراوە.

## بابا تاهیر و ئایینی یارسان

له سەردەمی ژیانی بابا تاهیر دا ئایینی ئەهلی هەق «یارسان» له گەلێ هەرێمە شاخاوییەکانی وولاتی کوردەواری و ناوچەکانی نزیک کوردستان له ناوەوە بوو. زیاتریش ئەم ئایینە لەگەڵ ئەوەی له ئیسلامیش کۆنترە بەڵام لەو ڕۆژگارە دا بەشێوە وەکو مەزهەبێکی موسوڵمانی خۆی دەنوواند و به درێژایی ڕۆژگار یارسانەکان بەربەرەکانی دەکران به تایبەتی له سەردەمی عوسمانلییەکان به «غولاتی شیعە» و «باتینی» و «عەلی ئیلاهی»ش ناویان دەبردن.

بێ گومان هەوای ئایینی یارسان کە تێکەڵ بە سۆفیزمی ئیسلامی بووە نەک تەنیا له شیعرەکانی بابا تاهیر دەردەکەوێ، وەکو له دوایی دا باسی لێوە دەکرێ، بەڵکو خۆشی ئەندامێکی گەورە بووەو پایە و پلە و مەقامێکی تایبەتی بووە له ڕێکخراوی ئایینی یارسانەکان کە زمانی ڕەسمییان دیالێکتی گۆرانیی زمانی کوردییە. لەگەڵ ئەوەی ئەو زمانەی بابا تاهیر دوو بەیتەکانی پێ نووسیوەتەوە دیالێکتی گۆرانی نییە و دیالێکتێکی لوڕی ناوچەیی تێکەڵاوە، بەڵام پێڕەوانی یارسان له بەری دەکەن و بە سروود دەیلێن و بەلایانەوە کەس له نهێنییەکانیان ناگا. دەبێ ئەوەش له بیر نەکەین کە بابا تاهیر دیالێکتی گۆرانیی زانیوە و کاری له دوو بەیتەکانی کردووە. جگە لەوە بەڵگەی دیکە بە دەستەوە هەیە کە بابا تاهیر شیعری بە گەلێ دیالێکتی تێکەڵاوی کوردی ووتووە، لەم لایەنەوە له سەرەتای ساڵی ١٩٦٨ کارگەری زانستی له بەشی کوردناسیی لقی ڕۆژهەڵاتناسی ئەکادیمیەی زانستی ئەرمەنستان گورگێن ئاکووپۆڤ هاتبووە شاری سانت پیترسبورگ (لینینگرادی ئەوسا). له بابەت بابا تاهیرەوە ئەمەی بۆ گێڕامەوە:

«له ساڵی ١٩٤٣ ڕۆژێکیان له تاران لەگەڵ ڕەشید یاسەمی دانیشت بووین، سەدری قازیش لەوێ بوو، باس هاتە سەر باسی بابا تاهیر، یاسەمی دێڕە شیعرێکی بابا تاهیری خوێندەوە کە گۆیا ئەویش له کابرایێکی پیری بیستووە، دێڕە شیعرەکە ئەمەیە:

کی گــــوتی ک نینە ل دونیـــــادا راز
ئەڤ ک من شـــەیدایی تایەم ئەو ڕاز نینە؟

دێڕە شیعرەکە بە تیپی لاتینی:

Kî guti Ki nîne li dunyada raz
Ev Ki min Seydayi tayem ew raz nîne

واتە: (کێ دەڵێ کە له دنیادا ڕاستی نییە، ئایا ئەوە ڕاستی نییە کە من شەیدای تۆم؟).

له ئاکووپۆڤم پرسی: ئەی نەتووت بۆچ ئەم دێڕە شیعرەی بابا تاهیریان نەخستۆتە ناو دیوانەکەیەوە؟ ووتی: نا.. لەبەر ئەوەی باباتاهیر پایە و پلەی بەرزی بووە لای یارسانان، هەندێ لەدوو بەیتەکانی بۆ پیرۆزی لە پەراوێزی دەسنووسی کتێبی ئایینی یارسان (سەرەنجام) تۆمارکراوە. مینۆرسکی سێزدە دوو بەیتی باباتاهیری لە کتێبی سەرەنجامدا دۆزیوەتەوە، هاوڕێکانیشی لەیارسانانی ئەهلی هەق سی و یەک دووبەیتی تریان بۆی رەوانەکردووە.

لە کتێبی «سەرەنجام» و «کۆمەڵێک لە نامە و شیعری ئەهلی هەق» ئەوە هاتووە کە شای عالەم بابا خۆشێن (٤٠٦هـ / ١٠١٥م - ٤٦٧هـ/ ١٠٧٤م) لەو کاتەی لەگەڵ یاران و سوارانی سەر لە هەمەدان دەدا میوانی باباتاهیر دەبێ. ڕووداوەکان زیاتر لە گێڕانەوەی ئەفسانەیی دەکەن، وەکو زۆربەی ڕووداوەکانی ئایینی یارسان، بە تایبەتی بابا خۆشێن پێنج ساڵیش پاش کۆچی دوواییی بابا تاهیر لە دایک بووە، بەڵام بێ گومان ئەفسانە هەڵدەگەڕێتەوە بە ڕاستی چونکە ئەم یەکتری بینینە بۆتە هۆی ئەوەی بەرهەمی ئەدەبی بێتە ناوەوە.

گۆیا لە گفتوگۆییێک دا لە نێوان بابا تاهیر و شاخۆشێنا، بابا تاهیر دەڵێ:

هەر کەس شاهەش تویی حالەش هەمینە
سەرینەش خشت و بالینەش زەمینە
جورمووم ئینەست کە تە دۆست داروم
هەر کەس دۆستەش تویی حالەش چونینە

واتاکەی:

(هەرکەسێ تۆ شای بی دەبێ حاڵی وابێ
سەرینی خشتە و ڕایەخی زەوییە
گوناهم ئەوەیە کە تۆ دۆستی منی
ئەوەی تۆ دۆستی بی دەبێ حاڵی وابێ)

لە سروودی هەشتەمی سەرەنجام یا سروودی ئایینی یارسان، بابا تاهیر ناوی وەکو فریشتەییێکی ئەو ئایینە هاتووە:

ڕەواجی هەر دین، سەر حەلقەی شاهان
جەمشیدی جەم بەن، شۆن بەری راهان
ئیرەجی یەحیا، سیاوەحشی کەی

حـــوســـێن شـــەهیـــد، نە کـــەربەلای تەی
عـــالی قـــەلەنـدەر، تاهیـــر قـــەلەندەر
هـەنـی چـیـش وا چـووم، پـووری ئـەسـکـەنـدەر
واتاکەی:
(سەرداری ئایین و سەر هەڵقەی شاهانی
جەمشیدی جەمی، ڕێ پیشاندەر و شوون هەڵگری
ئیرەجی یەحیا و سیاوەشی کەی
حوسێنی شەهید لە سارای کەربەلا
عالی قەلەندەر و تاهیر قەلەندەر
هەرچی تریش بڵێم تۆ زیاتری کوڕی ئەسکەندەری

شـاعـیـری یارسـان فـاریغ خـاوەنی ئەم سـروودەیە و نـاوی عـالی قـەلەندەر و تاهیـر قـەلەندەری بردووە وەکـو گـەورەیێک لە گـەورەکـانی ئایینی یـارسان. ئینجـا دەبینین عـالی قەلەندەر (سـەدەکـانی هەشتـەم - نۆیەم هـ = چوواردەم - پازدەم م) کـە یەکێکە لە پیـران و گەورەکـانی یارسـان بـاس لە چوونی شـا خـۆشـێن دەکـا بۆ هەمـەدان لـەگەڵ نۆسـەد کـەس لە یاران و سووارانی. لەو دوو بەیتەی خووارەوە ئەوە دەردەکەوێ کە لە ڕێی مەعنەوییەوە گـیـانی عـالی قـەلەندەر و بابا تاهیـر یەکێکن، واتە گـیـانی باباتاهیر لە پاشـانا چۆتە ناو ئەوەوە (دۆنادۆن)، لەبەر ئەوە کە شا خـۆشـێن چووە بۆ هەمـەدان مـیـوانی عـالی قـەلەندەر بووە، لەم بابەتەوە دەڵێ:

شـام بی وە مـیـهـمـان، شـام بی وە مـیـهـمـان
عـالی نان عـالی شـام بی وە مـیـهـمـان
چەنی نـوهـســـەدە باش قـــەلەنـدەران
بـابـا تـاهیــر بیـم، مـــێـــردی هەمـــەدان
واتاکەی:
(شام بوو بە میوان
منی بەرز و بڵند شام بوو بە میوان
نۆ سەد کەس لە قەلەندەران میوانم بوون
من باباتاهیری خەڵکی هەمەدان بووم)

پیر قوبادی دێوانە (سەدەی هەشتەمی هـ - چوواردەمی م) کە یەکێکە لە پیرانی ئایینی یارسان لە بابەت هاتنی بارەگای شا خۆشێن بۆ ماڵی بابا تاهیر دەڵێ:

ئەویـانەی تـاهیـــــر ئەو یـانەی تـاهیــــر

بارەگـــایی شـــام ئەویانەی تاهیـــر
بوکـــان و کـــەرەم قـــەدیم قـــاهیـــر
نەگـــــرد هوری زاتشـــــەن حـــــازیر
واتاکەی:
(ماڵی تاهیر
بوو بە بارەگای شام
سەرچاوەی کەرەمە، کۆن و بە تووانایە
ئاگاداری هەموو کار و کردەوەیێکە)

زانیارییێکی باش لە بارەی بە یەکتری گەیشتنی شای گێتی بابا خۆشێن و بابا تاهیر ڕۆژهەڵاتناسی ڕووس ڤ. ئێڤانۆڤ دەیدا بە دەستەوە، بە تایبەتی گفتوگۆ لە نێوان شا خۆشێن و بابا تاهیری هەمەدانی و فاتمەلەرە. ئەم گفتوگۆ رەمزی - ڕۆمانتیکیی ناسکە پیاو دەگەیێنێتە لووتکەی تووانەوە لە ناوەڕاستی دا، بە تایبەتی ئەو ژنە خاوەن بیروڕا پیرۆز و ڕەووشت پاکە کە لە خزمەت بابا تاهیر بووە، جەوهەری مێیینە بووە لە سێ کوچکەی شا خۆشێن و بابا تاهیر و فاتمەلەرە، گفتوگۆیان بە شیعری کوردی و فارسی بووە.

گەورەترین سەرچاوە لە مێژووی ئایینی ئەهلی هەقی یارسان شاکارەکەی حاجی نیعمەتوڵڵای موکرییە «شانامەی حەقیقەت» لەمەدا دانەر جێگەیێکی دیاری تەرخان کردووە بۆ بابا تاهیر لە ناو هەموو ئەو ڕێبەرانەی پێوەندییان بە ئایینی یارسانەوە هەیە، کە خۆی ناویان دەنێ «گەورەکانی ئەهلی هەق».

ئیتر نابێ بیر لە شیعرەکانی بابا تاهیر بکرێتەوە بەبێ ئەوەی ڕەچاوی ئایینی یارسان بکرێ و پێویستە ئەو ئایینەش – هیچ نەبێ لە ڕووی داهێنانی ئەدەبی کوردییەوە - بە چاویلکەی سۆفیزمی کلاسیکیی تیۆریی ئیسلامی کە بەشێکە لە سۆفیزمی کۆزمۆسی تەماشا بکرێ، ئەگەرچی لە ڕووی پراکتیکەوە بابا تاهیر خۆی وەکو دەروێشێکی ئەو سەردەمە دەنوێنێ.

## دوو بەیتەکانی بابا تاهیر

### ١- دوو بەیتەکان لە ڕووی ڕوخسارەوە

أ- کێش و قافیە: چوارینەکان یا دوو بەیتەکانی بابا تاهیر، لە سەر کێشی هەزەجی شەش گۆشەیی سرڕاوە (الهزج المسدس المحذوف = مفاعلین مفاعلین فعولن) دانراوون

ئەمە ئەگەر حیسابی عەرووزی عەرەبی بکەین، بەلاّم ئەگەر بگەڕێینەوە کێشی خۆماڵی (سیلاب) دەبینین نیوە دێڕە شیعری دوو بەیتەکانی بابا تاهیر یازدە هیجایین بە کەرتی کورت و درێژەوە (ب -).

قافیەیان وەکو هەموو چوارینێک یەکەم و دووەم و چوارەم یەک دەبێ، سێیەم جیاوازە (اا ب ا)، بە دەگمەن واش ڕێک دەکەوێ کە فەرهەنگۆکێکی هەرچووار نیوە دێڕە شیعر لە سەر یەک قافیە بن (اااا). ئەم بابەتە شیعرەی بابا تاهیر لە دوو بەیت و چوارینیان پێ دەووترێ، ترانەشیان پێ دەڵێن چونکە بە زۆری بە گۆرانی لەلایەن پێڕەوانی یارسانەوە لە سەر ئاوازی تەمبوور دەووترێن.

یەکەمین کەس شەمسی قەیسی ڕازی لە کتێبی «المعجم في معايير أشعار العجم» لە ١٧٣ کە لە سەرەتای سەدەی (حەوتەم ھ/ دووازدەم م) دایناوە، ئەم جۆرە چوارینانەی ناو ناوە «پەهلەویات». ئەوی ئاشکرایە ئەوەیە کە زمانی پەهلەوی (فارسی ناوەڕاست) لە دەوروبەری ساسانییەکان دا باو بوو، لە پاشانا فارسی تازە لەو بووەوە. ئیتر بێ گومان کە فارسی ناوەڕاست و تازە و هەموو زمانەکانی تری ئێرانی گەلێ شتی وەکیەکییان هەبێ و لە یەکترییەوە نزیک بن، مەسەلەی تێبینی و بیروڕا ئاڵۆز دەبێ. بەم جۆرە کە تەماشای دوو بەیتەکانی بابا تاهیر دەکەن دەبینین لە فارسی تازە ناکا، ناچار پەنا دەبەنە بەر دایکی ئەو فارسییە کە پەهلەوییە، ئیتر کە پەهلەوی بوو مانای ئەوەیە فارسییە، ئەم ناوەڕۆکە بۆ «پان ئێرانیستەکان» بووە بناغە بۆ ئەوەی هەموو شتێکی ڕەسەن ببەنەوە سەر فارسی، ئەگینا بۆ بە شوێن زمانی بابا تاهیر نەگەڕێێن لە زمان و دیالێکتەکانی تری زمانی بنەماڵەی ئێرانی وەکو زمانی کوردی بە هەموو دیالێکتەکانییەوە!

ب - ووشە و ڕستەی بابا تاهیر ساکارە، زۆربەی لە ناو خەڵکی دا لە ژیانی ڕۆژانەدا بەکار دەهێنرێن، لەبەر ئەوە بە درێژایی ڕۆژگار سوواوە و لە هەر ناوچەیێک شێوەی زمانی ئەو ناوچەیەی وەرگرتووە، دیارە مەبەس لەو زمانانەیە کە سەر بە کۆمەڵەی زمانانی ئێرانین. بۆ بەڵگە فارسەکان کە دیوانی بابا تاهیر چاپ دەکەن لە دووایی دا تەنیا فەرهەنگێکی یەک دوو لاپەڕەیی بۆ دەکەن کە بریتییە لە چەند ووشەیێک گۆیا زمانی فارسیی تازە ئاشنایان نییە. کەچی ڕاستییەکەی ئەوەیە ڕۆژگار زمانی شیعرەکانی گەلێ دوور خستۆتەوە لە زمانە بنچینەییەکەی بابا تاهیر.

ڕۆژهەڵاتناسانی ئەوروپا دەرکیان بەم دیاردەیە کردووە، لەم لایەنەوە بێرتیلس دەڵێ:
«چوارینەکانی ئەم شاعیرە لە سەرەتادا بە زمانی فارسی ئەدەبی نەنووسرا بوونەوە، بەڵکو بە دیالێکتی ناوچەیی (نزیک لە دیالێکتی خەڵکی دێهاتی دەوروبەری هەمەدان)».

بە زۆری ئەو دیالێکتەی دوو بەیتەکانی پێ نووسراوە لوڕی پێ دەڵێن، تەنیا لە دەسنووسێک دا ئەوە هاتووە کە چوارینەکان بە دیالێکتی ڕاجی نووسراون. ڕۆژهەڵاتناسی ئینگلیز براون کە باس لە چاپی یەکەمی لەندەنی چوارینەکان دەکا دەڵێ «ڕاجی» نی‌یە و «رازی»یە، واتە دیالێکتی ناوچەی «رەی».

ڕۆژهەڵاتناسی ڕووس ڤ. ئا. ژووکۆڤسکی بە قووڵی لە دوو بەیتەکانی بابا تاهیری کۆڵیوەتەوە لە ساڵی ١٨٨٨ لە پاش تاقی کردنەوەی پراکتیکی گەیشتۆتە ئەوەی کە گەلێ لە نەتەوە ئێرانی نەژادەکان بابا تاهیر بە شاعیری نەتەوەی خۆیان دادەنێن، چونکە هەر کەسە بە دیالێکتی خۆی دەیخوێنێتەوە».

لەم لایەنەوە مینۆرسکی لە سەر ئەو باوەڕەیە نەوەکو تەنیا بابا تاهیر لە هۆزی لوڕی کوردە، بەڵکو دوو بەیتەکانیشی سەر بە ناوچەی لوڕستان و دیالێکتی زمانانی ئەو سەردەمەی هەمەدانن و لە سەر ئەو باوەڕەیە کە شێوەی ئێستای چوارینەکان گەلێ دوورە لە ئەسڵی و بە درێژایی ڕۆژگار دەسکاری کراوون.

جگە لەمە وەنەبێ دوو بەیتەکانی بابا تاهیر تەنیا لای فارسەکان قاڵبی فارسی وەرگرت بێ، بەڵکو گەلێ لە زمانەکانی تری سەر بە بنەماڵەی ئێرانی بەهی خۆیانی دەزانن، بەوەی لە ماوەی هەزار ساڵ دا دەنگی وشەکانیان هێناوەتە سەر فۆنێتیک و فۆنێمی زمانەکەی خۆیان و گەیشتۆتە پلەیێک کە خاوەنی ئەو زمانانە بە تەواوی تێ بگەن و بە هی خۆیانی بزانن. ووشەی «دەست = dest» بە ڕوخسار هەر یەکێکە لە کوردی و فارسی دا، بەڵام مەگەر هەر ئەو کۆمپیوتەرەی (بە میلیۆن شەپۆل قسە دەکا) کە کورتی و درێژی تیپی دەنگدار دیاری دەکا پێمان بڵێ کە جیاوازییێکی زۆر لە نێوان کورتی و درێژی «e» لە «dest»ی کوردی و «e» لە «dest»ی فارسی دا هەیە. دیارە باس لە ڕستەی «نەناڵم = ne nalim» هەر ناکەین کە لە دووبەیتەکانی بابا تاهیر دا یەکجار زۆرە. کورد و مەلایری تویسرکانی دەڵێن «نە ناڵم = ne nalim»، خوڕڕەم ئابادی و برۆجەردی دەڵێن: «نە ناڵُم = ne nalum»، کەچی فارس دەڵێ «نە ناڵَم = ne nalem».

ئەوە ڕاستەکە ڕۆژگارو چارەنووس وایان کردووە دوو بەیتەکانی بابا تاهیر لە ئەدگاری بەراییی‌یان دوور بکەونەوە لە ڕووی دەنگەوە (فۆنێتیک)، بەڵام لەگەڵ ئەوەش دا هەندێ لە ئەدگاری بنچینەییی‌یان پارێزراوە و بە شانازی‌یەوە لاپەڕەی مێژووی ئەدەبی کوردی ڕەنگین دەکەن.

## ٢- دوو بەیتەکان لە ڕووی ناوەرۆکەوە

ناوەرۆکی دوو بەیتەکانی بابا تاهیر پێوەندی‌یێکی توندیان لەگەڵ ئایینی یارسان هەیە. ڕاستە ئایینی یارسان خۆی بە کۆنترین ئایین دەژمێرێ، لەو ڕۆژە کردگار خۆی لە ئادەم یا کیومەرس دانوواند ئەم ئایینە لە ناوەوەیە، بەڵام هیچ نەبێ لە دەوری پاش بڵاو بوونەوەی ئیسلام بە شێوەی ڕێبازێکی سۆفیزم خۆی پیشان دەدا، بە تایبەتی کە عەلی‌ی کوڕی ئەبوو تالیب یەکەمین خودای یارسانی دەوری ئیسلامە و گیانی کردگار چۆتە لەشیەوە. بنچینەی لە سەر دۆنادۆن (تناسخ الارواح والتقمص والحلول) دامەزراوە. فەلسەفەی ئەفلاتوونی پرتەوی (ئیشراقی) و زەردەشتی و مانەوی و هیندۆکی و عیرفانی مەسیحی‌ی سەدەی دووەم و شیعەی باتینی و موعتەزیلە و سۆفیزمی وەرگرتووە.

بابا تاهیر لە سەدەی لە باو بوونی سۆفیزم ژیاوە (سۆفیزم لە سەدەکانی ٧ - ٩ مەسیحی باو بوو) کە دڵداری بەرامبەر بە خودا لە ناوەوە بوو. ئەمە چووە ناو زمانەکانی ئێرانی‌یەوە. لە ناو دوو بەیتەکانی بابا تاهیر دا دەتووانین هەست بە لیریکی دڵداری‌ی ناسک بکەین بەڵام تێکەڵ بە سرووەدی تووانەوە لە ناو خودا دا. لەگەڵ ئەوەش دا بێ گومان مەبەسی بابا تاهیر عەشقی خودایی بووە، با هەندێ وێنەش بۆنی عەشقی ئادەمزادی لێ بێ، هەر لەبەر ئەوەشە دوو بەیتەکانی بابا تاهیر لە ناو خەڵکی جێگەی تایبەتی‌یان بووە، چونکە ڕەنگدانەوەی دڵ و دەروونیان بووە.

بە گشتی بابا تاهیر لە شیعرەکانی دا خەریکی «یەکێتی‌ی بوون»ە، لە دووای دەگەڕێ. لە ڕێگە تووشی «شوق» و «وجد» و «قلق» و «عدم» دەبێ. بابا تاهیر لە هەموو «شتێک» دا «جووانی» دەبینێ، شیعرەکەی شێوەی غەزەل وەردەگرێ و ڕەنگدانەوەی ناو دڵی هەموو جووانی پەرستێکە، جا با لای شاعیر هیچ جیاوازی‌یێک لە نێوان ئەو کچە و گوڵێکی جووان دا نەبێ، چونکە هەر دووکیان وێنەی کردگارێکن، بەڵام ئەوەی کچی خۆش دەوێ ئەو کچە هەر کچە لەلای، کەچی ئەوەی گوڵی خۆش دەوێ کچەکەش دەبێ بە گوڵ لەلای، بەم جۆرە کردگار و کچ و گوڵ «یەکێتی‌ی بوون» دروست دەکەن.

## دەسنووس و چاپی دوو بەیتەکانی بابا تاهیر

لەو ڕۆژەی ئەم دوو بەیتانە کەوتوونەتە ناوەوە، زیاتر لە ناو دڵ و مێشک و سنگی خەڵکی دا ژیاوون، چونکە ڕەنگدانەوەی هیوا و ئامانجیان بووە، کەمتریش تۆمار کراوون. لەوانەیە لەبەر ئەوە بوو بێ چونکە هەواییێکی میللی ساکاریان تێدایە. ئیتر وەکو چۆن هەمیشە دەسنووس و چاپی دەسنووسی سەر بەردی ئەم دوو بەیتانە لە ناوەوە بوو، لە سەردەمی پەیدا بوونی چاپی تازەش لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست چاپێکی زۆری دوو بەیتەکانی بابا تاهیر کەوتنە ناوەوە، بە تایبەتی لە پاش جەنگی دووەمی گێتی لە ئێرانا بڵاو کەرەوە و چاپخانەکان هونەریان دەنوواند لە چاپ کردنی دوو بەیتەکان بە تابلۆ و وێنەی ڕەنگاوڕەنگی میناتووری و گۆڕینی بۆ زمانە گەورە و پێشکەوتووەکانی تری گێتی.

باوەڕ ناکەین نامەخانەی گەورە و بە ناو لە گێتی دا هەبێ و دەسنووسی دوو بەیتەکانی بابا تاهیری تێدا نەبێ. ئەم دەسنووسانە بوونە هۆی ئەوەی هەندێ لە ڕۆژهەڵاتناسەکان لە سەدەی نۆزدەم و سەدەی بیستەم دا گەلێ لە تێکستی ئەو دوو بەیتانە بڵاو بکەنەوە لەگەڵ گۆڕینیان بۆ زمانانی وەکو ئینگلیزی و فرەنسی و ئەڵەمان و هیتر.

أ - دەسنووس لە هەندێ لە نامەخانەکانی ئەوروپا

١- نامەخانەی نەتەوەیی لە پاریس

ئەم دەسنووسە ١٧٥ دوو بەیتی گرتۆتەخۆ. پێشەکی لەلایەن بەخش قولی قەرەباغییەوە نووسراوە (چووار لاپەڕەیە). لە پێشەکی دا ئەوە هاتووە کە بە فەرمانی محەمەد شای قاجار هەندێ لە دوو بەیتەکانی بابا تاهیر کۆ کرایەوە بۆ ئەوەی لە فەوتان ڕزگاریان بێ، هەروەها پێشەکی نووس دەڵێ تا ئێستا کە (ساڵی ١٢٦٠ هەزار و دوو سەد و شەستی هیجرییە) (١٨٤٤م) ئەوەی لێرەدا تۆمار کراوە لە ویلایەتەکانی دوور و نزیک کۆ کراوەتەوە. لە دووا ڕۆژ دا ئەگەر دوو بەیتی تر دۆزرایەوە ئەوا لە ناو ئەم نامەیەدا دەینووسینەوە (شەش لاپەڕەی سپی بەجێ هێشتووە بۆ ئەو دوو بەیتانەی لە دووا ڕۆژ دا دەدۆزرێنەوە). ئینجا باس لەوە دەکا کە چۆن پێویستە ئەم قسانە لە گێتیی نهێنیی نا دیارەوە (عالم السرّ الغيبي) ببرێتە گێتیی هەستی بینراو (عالم الادراك العيني)، ئەوجا باس لەوە دەکا کە تێگەیشتنی مانای ئەو پەندانەی خراونەتە پاڵ (الاستاذ المحقق الربّاني بابا طاهر الهمداني) کارێکی دژوار و قورسە.

٢- یەکێ لە دەسنووسە نایاب و گەورە و جوانەکانی شیعری کلاسیکیی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست کەشکۆڵی «گُلشن = گوڵشەن»ە، ئەمە لەلایەن محەمەدی قازیی کوڕی محەمەد ڕەزای مەهجوور لە ساڵی ١١٩٨ھ/ ١٧٨٣م ڕوونووسی کراوە. بریتی‌یە لە ٤٥٩ پەڕە، پانایی (٦٩ × ٤٨,٥سم). لەگەڵ سەد وێنەی میناتووری ڕەنگاوڕەنگ. بەشێ لە دوو بەیتەکانی بابا تاهیری تێدا تۆمار کراوە. ژمارەی دەسنووسەکە (E-12)یە لە نامەخانەی ئامۆژگای ڕۆژهەڵاتناسی ئەکادیمییەی زانستی سانت پیترسبورگ پارێزراوە.

ب – دوو بەیتە چاپکراوەکانی بابا تاهیر

ئەوەی بە ناوی بابا تاهیرەوە کەوتۆتە ناوەوە لە بەرهەمی شیعری ئەوەیە کە نزیکەی ٦٠٠ دوو بەیت و پێنج غەزەل و چەند پارچەیێکە، بەڵام وا باوە کە دوو بەیتەکانی لە ١٣٠ تێپەڕ ناکەن.

چاپێکی زۆری دوو بەیتی بابا تاهیر لە ناوەوەیە بۆ بەکار هێنانی ڕۆژانە، دوو بەیتەکانی ئەم چاپانە لە قاڵبی زمانی فارسی تازەدا مەییوون و بوون بە موڵکی فارس، هەر لەبەر ئەوەشە چوونەتە ناو مێژووی ئەدەبیاتیانەوە، بەڵام ئەوەندە هەیە بە ناوو ناوەڕۆک بابا تاهیر کوردە و توێکڵ و قاووغ زمانی فارسی‌یە، لەو چەند ساڵەی دوواییی‌یەدا مەشقی گۆڕینی ئەم دوو بەیتانە دەستی پێ کرد لە زمانی ئەسڵی خۆیانەوە بۆ زمانی فارسی‌ی تازەی ئەم چەند سەد ساڵەی دوواییی‌یەدا.

چاکترین چاپی زانستی‌ی دوو بەیتەکانی بابا تاهیر ئەوەیە کە حوسێن وەحید دەستگوردی ساغی کردۆتەوە و ڕەشید یاسەمی پێشەکی‌ی بۆ نووسیوەتەوە. ڕەنگە فراوانترین و گەورەترین کتێب لە بابەت بابا تاهیرەوە ئەوەی محەمەد کوڕی ئیبراهیمی ناسراو بە خەتیبی وەزیری بێ. هەرچی لە بارەی شاعیرەوە ووترابێ کۆی کردۆتەوە، هەوڵی ئەوەی داوە لە هیچ سەرچاوە و بەڵگەیێک لانەدا. بەڵام هەوای «پان ئێرانیستی»یانە بە ئاشکرا دیارە، ڕێگە نادا بابا تاهیر لە ناو چووار چێوەی «فارسیزم» بچێتە دەرەوە!

## دۆزینەوەی شیعری تری بابا تاهیر

لەوانەیە بابا تاهیر ویستبێتی بە زمانی ئەو لوڕانەی پێڕەوی ئایینی یارسانیان دەکرد شیعر بڵێ. ئەوەی ئاشکراشە ئەوەیە کە بابا تاهیر شیعری بۆ سروود گوتن واتە گۆرانی

چرین بۆ ئەهلی هەقی یارسان نووسیوە. ئەم سروودانە لە ناو ئەو خەڵکانەدا باوون و لەگەڵ ئاوازی تەمبوور دەووترێن.

لەو دووایی‌یە دا کۆمەڵێک شیعری بابا تاهیری هەمەدانی لە نامەخانەی مۆزەی قۆنیە لە ئارامگای جەلالەدینی ڕۆمی دۆزراوەتەوە، ئەو دەسنووسەی شیعرەکانی تێدا تۆمار کراوە لە ساڵی ۸٤۸ھ/ ۱٤٤٤م ڕوو نووس کراوە. شیعرە کوردی‌یەکانی دەسنووسەکە ئەمانەی لای خوارەوەن:

۱

گـــــەر ئەژ زەر ئەونەهی دیوانە ئەز گـل
بە پەرچینەش کـــری وانووشـــە وو ول
گەر ئەو بشنەش نەهی ئان داری شـمـشـاد
گـــەر ئەو روونەش کـــری ئاواجی بلبل
ســـەرەنجـــامـــان بشی بە پا بە هەرزی
پایی تە گـــوور وی مــــاوایی تە گـل

واتاکەی:

(با لە باتی گڵ و خاک تەلارێک لە زێڕ دروست بکەی
لە گوڵ و وەنەوشە پەرژینی بۆ بکەی
با لە سایەی ئەوداری شمشادە دابنیشی
با لە هەموو لایێکەوە بلبل ئاواز بپژێنێ
سەرەنجام لە ناو دەچێ و نامێنی
جێگەت گۆڕ و مەئوات گڵ دەبێ)

شاعیر لێرەدا باس لە کورتی‌ی ماوەی ژیانی ئادەمزاد دەکا، ئەوەی دروستی دەکا و دایدەمەزرێنێ گەلێ لە تەمەنی درێژترە، ئەم بیروڕایە دەور کردنەوەی بیر و باوەڕی ئایینی‌یە، ئەوەی دەڵێ ژیانی سەر زەوی کورتە و ژیانی دووەم نەمر و هەمیشەیی‌یە. سۆفیزمی پراکتیکی خەریکی ئەم مەسەلەیە چونکە بایەخ بە ژیانی گیانی دەدا نەوەکو ژیانی مەتریالی، لەوانەیە لەمەدا جیاوازی لە نێوان بیروڕای ئایینی و سۆفیزم «شەریعەت و تەریقەت» دا هەبێ.

۲

زاری جـەم دی وە دایی مـورج ئەد خـەوروود
مـــورجـــان دوو دەســـتی وە خـــودا دەروود

ناگـــــەهان بامـــــە دەند بازی وە داری
زارە جەش کوشت و موران زارج ئەد خورود
دالی جـــە ئەلوەند کـــووهان کـــەرد پەرواز
بازەش بە کوشت و خوونەش پاک وە خورود
بەعـــــد نەچیـــــرەوان دەردین و دە ئـایین
بەو کـــەدەش تیـــر وە دال ئەژکـــار بەدرود
بشـــە نەچیـــرەوان دەســـتـــەت وەچا دەست
چەمننەت بەد کـــــرە ئەژکـــــار بەدرود
بە نامی نەشـــئـــە ئینی کـــەمـــەن کـــەرد
بەمەن هەر ئان کەرەند هەروەد کەمەن کەرود
خـــوررەم ئان کـــیـــژ کـــو وەد کـــار نەبی
خـــوش ئان کـــیـــژ کـــو وەزنتکویی کـــەرود

واتاکەی:

(کەوێکم دی باڵندەیێکی گرت و خواردی
باڵندەکان هەر دوو دەستیان پان کردەوە لەبەر خودا
لەپڕ بازێک لە سەر دارێک بەفریایان کەوت
کەوی کوشت و باڵندەکان کەوەکەیان خوارد
داڵێک لە شاخی ئەلوەند پەروازەی دەکرد
بازی کوشت و هەموو خوێنی خواردەوە
لە پاشانا ڕاوچییێک پەیدا بوو
تیرێکی ئاڕاستەی داڵەکە کرد و لە پێی دا
(داڵ) ووتی ئەی ڕاوچی خودا دەستت بشکێنێ
چونکە ڕاوی ئێمەت تێک دا
لە وەراما ووتی بەم کردەوەیەی خۆت مەنازە
هەر کارێکی خراپی من بیکەم بۆ خۆم دێتەوە
بەختیاری بۆ ئەو کەسەیە کە کاری بەد ناکا

خۆشی بۆ ئەو کەسەیە کە بە بەدکاری ڕازی نابێ)

لەم پەندە دا شاعیر دەیەوێ ئەوە دەربخا کە لە دووای هەموو هێزێک هێزێکی بەهێزتر هەیە. کە هێز و توانا ببێ، دەبێ زەبر و زۆرداری هەبێ، کەوا بێ بەختیاری تەنیا لەوەدا دەبێ کە هێز نەبێ، کە نەبوو زۆرداری نابێ.

٣

یاگـــــیم دوڕ دی هەنـی دەریـە نـەبود یـار
یاگـیم خـوەردید گـهـان پەیدا نـەبود یار
من ئەژ ئـان ڕوو بـەدامــانـی تە زەد دەست
دەگـــــەردوونـت پـەرو پـایـی نـەبـود یـار

واتاکەی:

(ئەو جێیەی دوڕم تێدا دی هێشتا زەریا نەبوو ئەی یار
ئەو جێیەی ڕۆژم تێدا دی هێشتا گێتی نەبوو ئەی یار
من لەو ڕۆژەی کە دەستم گەیشتە داوێنت
لە گەردوونت دا هێشتا پەرو باڵ نەبوو ئەی یار)

لەم دوو بەیتە دا بابا تاهیر باس لە «گیان» (یار) دەکا، ئەمە زۆر پێش دروست کردنی گێتی کەوتووە. بە پێی «سەرەنجام» لە پێشانا هیچ هەبوو، گێتی زەریا بوو، دوڕێک لە سەر دەریا دەسووڕایەوە. خودا دوڕەکەی لە ناوبرد، لە ئەنجاما دووکەڵ بڵند بوو و ئاسمانی دروست کرد. ئینجا ئەستێرەی بەرز کردەوە، لە پاشانا ژمارەی ئەو «یاران»ەی دیاری کرد کە لە دوواییی دا لە لەشیانا خۆی دەنوێنێ، ئینجا لە ڕووناکیی خۆی مانگ و خۆر و شەو و ڕۆژی دروست کرد.

شاعیر لەم دوو بەیتە دا هەمیشەییی «موتلەق» دەخاتە ڕوو، کە «گیان» هەبوو هێشتا «مادده» نەبوو، کە «دوڕ» و «ڕۆژ» و «یار» هەبوو هێشتا گێتی دروست نەبوو بوو.

ئەم شیعرەی بابا تاهیر شیعرێکی ترمان دێنێتەوە یاد کە دووسەد ساڵێک پاش ئەو ووتراوە، ئەمە شیعرەکەی ئیبنولفاریزە (ابن الفارض) (١١٨١ - ١٢٣٥م) کە دەڵێ:

شربنا على ذكر الحبيب مدامة سكرنا بها من قبل ان يُخلق الكرمُ

واتە: شەرابێکمان لە یاد کردنەوەی خۆشەویست خواردوە
پێی سەر خۆش بووین پێش ئەوەی ڕەز دروست ببێ

شاعیر ئەوە دەردەبڕێ کە «سەرخۆشی» واتە «گیان» پێش «مەی و مەیخانە» واتە «مادده» پەیدا بووە.

٤

یاکە ئەژ میهری تەم دەم میزەد ئەی یار
خویش بێگانەگان سنگم زەد ئەی یار
جورمم ئینە کە ئەژ تە دوست داروم
نەخوونم کەرد و نەم راهی زەد ئەی یار

واتاکەی:

(لەوێ کە من بەر میهری تۆ دەکەووم ئەی یار
خوێش و بێگانە سنگم بریندار دەکەن ئەی یار
گوناهم ئەوەیە کە من دۆستی تۆم
من نەخوێنم کردووە و نەڕێی کەسم گرتووە ئەی یار)

لەم دوو بەیتە دا شاعیر لەوە دەدوێ کە لە ڕێزی خەڵکی چۆتە دەرەوە، چونکە خەڵکی گوێ نادەنە عەشق، شاعیر گوێ دەداتە عەشق، بەم جۆرە لە ڕێز دەچێتە دەرەوە و دەبێ بە بێگانە، لەبەر ئەوە خەڵکی خۆشیان ناوێ و دەبێتە تاوانبار بەرامبەریان، هەر لەبەر ئەوەشە دەڵێ من گوناهم ئەوەیە تۆم خۆش دەوێ.

٥

مەن ئان پیروم کە خوانەندەم قەلەندەر
نە خانم بی نە مانم بی نە لەنگەر
روو هەمە روو وەرایەم گردی گێتی
شەو دەر ئایە وە ئەو سەنگی نەهم سەر

واتاکەی:

(من ئەو پیرەم کە بە قەلەندەر ناسراووم
نە ماڵم هەیە، نە سامانم هەیە، نە لەنگەر
بە درێژایی ڕۆژ هەمووی لە گێتی دەسووڕێمەوە
کە شەو دەکشێ سەرم لە سەر بەردێک دادەنێم)

ئەم دوو بەیتەی دەسنووسی قۆنیە (١٤٤٤م) لە دەسنووسی پاریس (١٨٤٤م)یش دا هەیە، ئەگەر بەرامبەری و بەراووردێک لە نێوان هەر دوو دووبەیت دا بکەین بۆمان

دەردەکەوێ تا چی ڕادەیێک دەسکاریی دوو بەیتەکانی بابا تاهیر کراوە. (بڕوانە «من = بابا تاهیر و هەموو قەڵەندەرێک» لەم کتێبەدا، لەوێ ئەم دوو بەیتە بە شێوەیێکی تر نووسراوەتەوە).

٦

یا ئەز ئین بەند دەر ئیزناوەکیتیم
خوونەم ئەز خوردو دەر خووناوە کیتیم
یا دەرین شوومە گیتی ئوم نە یایا
ئەژ خووبی بارە دەر وەلاوە کیتیم

واتاکەی:

(حەزم دەکرد لە ئیزناوە بوومایە
خوێنم خواردۆتەوەو لەناو خوێنا دەژیم
لەم گێتیی‌یەدا هیچ جێ‌یێک نی‌یە بۆ من بشێ
دیارە من لەخۆمدا نەماووم

دەبێ پیری بابا تاهیر یا دڵبەری لە ئیزناوە (ناوی ناوچەیێکە لە هەمەدان) بوو بێ و خۆی لە هەمەدان. لە یەکتری دوورن، بابا تاهیر دەبێ لە نزیک پیریەوە بێ، ئەگەر لەوێ نەبێ، دیارە لە هیچ جێگەیێکی تر نی‌یە، کە لە هیچ جێگەیێک نەبێ بوونی نی‌یە. ئەم وێنە داهێنراوە جوانە جەلالەدینی ڕۆمی (١٢٠٧ - ١٢٧٣)مان دێنێتەوە یاد لە مەسنەوی‌یەکانی دا، کە ٢٥٠ ساڵێک پاش بابا تاهیر ژیاوە.

٧

پەنج رووزی هەنی خووررەم گهان بی
زەمین خەندان و بەرمان ئاسمان بی
پەنج روویی هەنی هازید و سامان
نەجینان نام و نە ژ ئانان نیشان بی

واتاکەی:

(لە پێنج ڕۆژ دا گێتی بەختیارە
زەوی بۆمان پێ دەکەنێ و ئاسمان دامان دەپۆشێ
پێنج ڕۆژی تریش سەروەت و سامان لە ناوەوەیە
نە لەمانە و نە لەوان هیچ نیشانەیێک نەماوە)

پەندی پێشینانی کوردی دەڵێ «دنیا پێنج و دوو ڕۆژێکە» بە مانای حەوت یا دووجار پێنج ڕۆژ، لێرەدا بابا تاهیر ئەم هەڵهێنەمان بۆ دەکاتەوە لە بابەت «نەبوون»ی گێتی و «بوون»ی گیان. دەڵێ لە پێنج ڕۆژی یەکەم گێتی بەختیارە، ئەم خۆشی‌یە پێنج ڕۆژی تریشی دەمێنێ، لە پاش ئەوە نامێنێ، مەبەسیشی ئەوەیە کە تەنیا چاکە لە سەر ڕووی زەوی دەمێنێ.

٨

ئەلف کەژ کاف و نوونەش سەر بە بەر کەرد
هەمەش هامان گهان ئەو لاجیوەر کەرد
ئانکیش ئەو ئافیری گەردوونی گەردان
ئانیش ئەد سات و مەن ئەنداجە ئەر کەرد

واتاکەی:

(کە کاف و نوونی ووت و گێتی‌ی دروست کرد
گێتی‌ی بە ڕەنگی لاجیوەردی خستە ڕوو
ئەو کەسەی گەردوونی گەردان دەسووڕێنێتەوە
هەر ئەویشە ئەدگاری ئێمەشی داڕشتووە).

لەم دوو بابەتە دا بابا تاهیر بیروڕای ئایینی یارسان دەردەبڕێ لە بارەی کردگار و دروست کردنی گێتی‌یەوە. بێ گومان ئەمە لەگەڵ بیروڕای ئایینە ئاسمانی‌یەکانی تریش دەگونجێ، بە تایبەتی ئیسلام، چونکە ئەوەتا کاف و نوونی لە قورئان وەرگرتووە.

٩

بشەم بە ئەلوەند دامانی مو نیشانوم
دامەن ئەژ هەر دوو گێتی هاویشانوم
نیشانم توو لە وو موویەم بە زاری
بی کی بلبل هەنی وە ویل نیشانوم

واتاکەی:

(دەچم بۆ دامەنی کێوی ئەلوەند و لەوێ دادەنیشم
خۆم لە هەر دوو گێتی ڕزگار دەکەم
دادەنیشم و پرچم دەکەمەوە و واوەیلا دەکەم

با بلبل و گوڵ بەشداری لەم دانیشتنە بکەن)

* * *

ئەز ئان ئەسـبـیـدە بازم هەمەدانی
بە تەنهایی کەروم نەچیرەوانی
هەمە بە من ویدیرەند چرغ و شاهین
بە نامی من کەرەند نەچیرەوانی

واتاکەی:

(من ئەو بازە سپی‌یە هەمەدانی‌یەم
بە تەنیایی ڕاووشکار دەکەم
هەموویان بەهۆی منەوە چرگ و شاهێنیان هەیە
بە ناوی منەوە ڕاووشکار دەکەن)

ئەم دوو بەیتە هەندێ لە بیر و ڕاکانی ئاییینی یارسان شی دەکاتەوە و دەخاتە ڕوو: بابا تاهیر کە خۆی بە بازی سپی دادەنێ لاسایی پێشەوایان و پیرەوانی یارسان و سۆفیزمی ئیسلامی دەکا، ئەمانە هەموویان خۆیان بە بازی سپی دادەنێن، کردگاریش شابازە واتە شای بازان. لە «سەرەنجام» دا باز عاریفی تەواوە لە پایەی پیر دایە. شاباز ڕەنگدانەوەی «یەکێتی‌ی بوون»ە، هەموو بازانی تر بۆ ئەوە دەچن و لە ناو یەکتری دا دەتوێنەوە. بەو هۆیەوە دەڵێن یەکێ لە لەقەبەکانی شێخ عەبدولقادری گەیلانی (١١٦٤م کۆچی دوایی کردووە) «بازی سپی»یە (الباز الأشهب).

## گەشتێک بە ناو دوو بەیتەکانی بابا تاهیر

لە سەردەمی ژیانی بابا تاهیرا (سەدەی ٤ - ٥ ھ/ ١٠ - ١١م) بزووتنەوەی سۆفیزمی ئیسلامی جارێ لە دەوری تیۆری‌ی کلاسیکی دابوو، مەبەسی لە تیۆری ئەوەیە کە هێشتا بە تەواوی ڕەنگی لە ئەدەبیات دا نەدابووەوە. بەڵام وەکو ئیدیۆلۆجی‌یەتێک گەلێ لق و پۆپی لێ بوو بووەوە، هەروەها لەو دەورەدا سەرەتای ئەو ئەدەبە بەرزە دەستی پێ کرد، کە لە ناوەرۆکی سۆفیزمەوە هەڵقولا بوو و لە دوایی دا بە «ئەدەبی عیرفانی» ناوبرا. ئەدەبی سۆفیزم پەنای بردە بەر شێوازی «ڕەمز» چونکە وەشاوەترین شێوازێکە بۆ دەربڕینی هەستی دەروونی‌ی لای پیرەوانی سۆفیزم.

بێ گومان سۆفیزم بزووتنەوە و گۆڕران بوو، تازە کردنەوە بوو، نەتەوە موسوڵمانەکانی ناعەرەب هەموو تازەییێکیان وەردەگرت، چونکە بە هۆی ئیسلامەوە لە کۆنی خۆیان داپچڕا بوون، هەمیشە ئامادە بوون کە شتی تازە وەربگرن.

لە سەرەتای ئیسلامەوە تا دەوروبەری ژیانی بابا تاهیر سۆفیزمی ئیسلامی شتێکی ئەو تۆمان بۆ دەور ناکاتەوە کە ببێتە نموونەییێکی باش لە ئەدەبی سۆفیزم جگە لەو شیعرە عەرەبی‌یانەی دەدرێنە پاڵ مەنسووری هەلاج (لە ۳۰۹ھ/ ۹۲۲م مردووە). لەبەر ئەوە دەتووانین بابا تاهیر بە یەکێک لە سەرامەدانی نوێ کردنەوەی شیعر و داهێنەرانی شیعری سۆفیزم بزانین نەوەکو تەنیا لە ئەدەبی کوردی دا بەڵکو لە گێتی‌ی سۆفیزمی ئیسلامی و کۆزمۆسیش دا.

لەگەڵ ئەوەی دوو بەیتەکانی بابا تاهیر دەچنە ناو دیوانی سۆفیزمی ئیسلامی‌یەوە، بەڵام بێ گومان جەوهەری ئایینە کۆنەکان و بە تایبەتی ئایینی یارسانیان پێوە دیارە، بێ گومان ئایینی یارسانیش گەلێ لە ئیسلام بە کۆنتر لە قەڵەم دەدرێ، لە دووایی دا دەتووانین بڵێین دوو بەیتەکان دەبن بە ڕەمز و قسەی پیرۆز لای هەموو سۆفی‌ییێک لە هەر نەتەوەو ئایینێک دابێ.

جگە لەمە دوو بەیتەکان بۆ مەبەسی تریش بەکار دێن، وەکو دڵداریی رۆمانتیکی‌ی نێوان نێر و مێ، بەم جۆرە مەستی مەیی ئاسمانی و سەرخۆشی مەیی مەیخانەی سەر زەوی بە سروود لە ناخی دڵ و دەروونیان ئاوازی ئاگرین دێتە دەرەوە و جووانی لە «بوون» دا بڵاو دەکاتەوە.

## ۱- یاری نادیار

ئەستووری‌ی بیر و باوەڕی بابا تاهیر لە سەر دوو جەوهەر دامەزراوە «من» و «تۆ»، «من» بابا تاهیرە، دروشمی هەژاری و کەساسی و بێ دەسەڵاتی و پڕ گوناهی‌یە، نوێنەری هەموو سۆفی و دەروێشێکە کە بە شوێن ڕاستی دا دەگەڕێ. بابا تاهیر دەبێ وابێ، ئەگەر وا نەبێ دەبێتە بەشێک لە «تۆ» (کردگار) و مەسەلەکە کۆتایی پێ دێ، بەڵام نابێ مەسەلەکە کۆتایی پێ بێ.

بۆ مەبەسی هەڵبژاردنی دوو بەیتەکانی بابا تاهیر وەکو بەڵگە بۆ ئەم کتێبە باوەڕ بە دەسنووسی کۆن و بڵاو کراوەی ڕۆژهەڵاتناسەکان کراوە، هەرگیز تخوونی ئەو دووبەیتانە

نەکەوتووین کە گفتوگۆ و چەندو چوونیان لە سەرە و ئاووڕیشمان لە چاپە ڕەنگاوڕەنگە زۆر و زەبەندەکانی ئێران نەداوەتەوە.

«تۆ» خۆی لە یار و چاو ڕەش و دڵ و دڵسووتاو و دڵبەر و جووان (کردگار) دەنوێنێ. بابا تاهیر رەمزی نەگەیشتن بە ڕاستی‌یە (حەقیقەت) و هەوڵ دەدا بگاتە ئەو ڕاستی‌یە، ئەگەر بیگاتێ قۆناغی تووانەوەیە لە ناو کردگار دا، ئیتر «من» و «تۆ» نامێنێ.

## ١- من = بابا تاهیر و هەموو قەلەندەرێک

بابا تاهیر دەبێ دوور بێ (مجرد) لە هەموو «شت»، لە گێتی‌ی مەتریالی دا نی‌یە، ئەگەر لەوێ بێ مەبەس تێک دەچێ، لەم لایەنەوە دەڵێ:

مـــوو ئان ڕەندم کـــە نامم بێ قـــەلەندەر
نە خـــوون دێروم نە مـــوون دێروم نە لەنگەر
چوورۆچ ئایۆ بگەردوم گـــەردی گـــێـــتی
چوشـــە و ئایۆ بەخـــشـــتی وانەهەم ســـەر

واتاکەی:
(من ئەو ڕەندەم کە ناووم قەلەندەرە
نە ماڵم هەیە، نە سامانم هەیە، نە لەنگەر
کە ڕۆژ دادێ لە سەر زەوی دەسووڕێمەوە
کە شەو دەکشێ سەرم لەسەر خشتێک دادەنێم)

هەروەها دەڵێ:

بی‌تە ســـەردەر گـــریبـــانوم شـــەو و رۆچ
ســـریشک ئەز دیدە باروونوم شـــەو و ڕۆچ
نە بیـــمـــاروم نە ژایوم مـــیکەرۆ دەرد
هەمی زوونوم کـــە نالوونوم شـــەو و ڕۆچ

واتاکەی:
(بێ تو شەو و ڕۆژ لە بیابانان دا دەژیم
شەو و ڕۆژ فرمێسک لە چاووم وەکو باران دێتە خووارەوە
نە ئازارم هەیە و نە دەردەداریشم
هەر ئەوەندە دەزانم کە شەو و ڕۆژ دەناڵێنم)

لێرەدا سنوور بۆ «کات» و «جێگە»ی شاعیر نی‌یە، کات هەموویەتی، شەو و ڕۆژ، جێگەش هەموویەتی، هەموو ڕووی زەوی، هەروەها نەوەکو بە لەش لە مەتریال دوورە، بەڵکو بە گیانیش لە ئێش و نێش و دەرد و ئازار دوورە، کەچی فرمێسک هەر دەڕێژێ و لە نالە نالێش ناکەوێ چونکە نەگەیشتۆتە ڕاستی (حەقیقەت).

ئەم «بوون»ەی تازە نی‌یە، لە تەمەنی لەشی زۆر درێژترە، لە «قالوو بەلا» (قالوا بلی)وەیە، بۆ ئەمە دەڵێ:

مــــوو ئەز قـــالوو بەلا تەشــــویش دێروم
گــــــوناه ئەز بەرگی داروون بیش دێروم
چوو فەردا نوومە خوونون نوومە خوونن
مــوو دەرکەف نوومە سەردە پیش دێروم

واتاکەی:

(من لە قالوو بەلاوە ترسم هەیە
لە گەڵای دار و درەخت زیاتر گوناهم هەیە
لەو ڕۆژەی کە هەر کەس کتێبی خۆی دەخوێنێتەوە
کتێبی دەستم شان و پیلم دەچەمێنێتەوە)

شاعیر زۆری ماوە لە ڕاستی (حەقیقەت) نزیک بکەوێتەوە، چونکە گوناهی یەکجار زۆرە، لە گەڵای دار و درەختی هەموو ڕووی زەوی زیاترە.

بابا تاهیر کە لە ڕۆژی قیامەت دا، وەکو هەموو کەسێکی تر، دەفتەری خۆی لەگەڵ خۆی دا هەڵدەگرێ، دەفتەرەکە لەبەر قورسی هەموو شان و پیلی دێنێتە خووارەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەش دا شاعیر عاشقی ڕاستی‌یە و هیچ کۆڵ نادا و دەبێ بگاتە خۆشەویستی، دەڵێ:

مــووەم ئان ئازەرین مــورغی کــە دەر حــال
بســـــووجم عـــــالەم ئەز بەرهەم زەنەم بال
مــوســەووير گــەر کــەشــە نەقــشم بە دیوار
بســـووجم خوونە ئەز تەئسیری تیمــســال

واتاکەی:

(منم ئەو باڵندە ئاگرینەی کە دەست بە جێ

هەموو عالەم دەسووتێنم ئەگەر باڵم بشەکێنمەوە
وێنەگر ئەگەر وێنەم بکێشێ لە سەر دیوار
خانوو دەسووتێ لە تەئسیری وێنەکە)

شاعیر زۆر ڕاستە لە بیر و باوەڕی، عاشقێکە گەیشتۆتە پلەی سووتان، واتە تووانەوە و لە ناو چوون لە ناو مەعشووق دا، لەبەر ئەوەیە ئاگری عەشقی ئەوەندە بە تینە هەموو گێتی دەسووتێنێ، نەک تەنیا وەکو «لەش» بەڵکو ئەگەر وێنەشی لە سەر دیوار بکێشرێ، وێنە دەبێ بە ئاگر و گڵپە و خانووەکە دەسووتێنێ.

## ٢- تۆ = مەعشووق

«من» لەلای شاعیر «تۆ»یە، یاخود «تۆ» لە ناو «من» دایە، چونکە من عەوداڵی تۆم، من تۆم ڕاکێشاوەتە ناو خۆم، لەو کاتەی کە من ئارەزوو دەکەم تۆ من بکێشییە ناو خۆت، بەمە «یەکێتیی بوون» دێتە دێ:

ز دل نەقشی جەمالت دەرنەشی یار
خەیالی خەتت و خالت دەرنەشی یار
مژە سازوم بە گەردی دیدە پرچین
کە خوون رێژە خەیالت دەرنەشی یار

واتاکەی:

(نەقشی جوانیت لە دڵم دەرناچێ ئەی یار
وێنەی خەت و خاڵت لە خەیاڵم دەرناچێ ئەی یار
برژانگم دەکەمە پەرژین لە دەوری چاووم
بۆ ئەوەی وێنەت دەرنەچی کە فرمێسکی خوێنین دەرێژم ئەی یار)

لەبەر ئەوەی شاعیر خۆی بێ تووانا و گوناهبار دادەنێ، لەوە دەترسێ لە پڕێک دا مەعشووق لە دڵی بچێتە دەرەوە یا لە خەیاڵی بسڕێتەوە، بۆیە برژانگی دەکا بە پەرژین بۆ ئەوەی وێنەی مەعشووق لەگەڵ فرمێسکی خوێنین کە ئەویش لە ناخی دڵەوە هەڵدەقوڵێ نەچێتە دەرەوە.

دیارە شاعیر تەنیا بە عەشقی خۆی دەزانێ، ئەوەی لەلا ئاشکرایە کە ئەو مەعشووقەی ڕاکێشاوە بۆ خۆی، با مەعشووقەش گوێی نەداتێ، بەڵام هەر مەعشووقەیە کە شاعیر

خاوەنی بێ:

نیگارینا! دل و جانم تە دێری
هەمە پەیدا وو پەنهانم تە دێری
نەزوونم موو کە ئین دەرد ئەز کی دێروم
هەمێ زوو نوم کە دەرمانم تە دێری

واتاکەی:

(ئەی جووان تۆ خاوەنی دڵ و گیانی منی
تۆ خاوەنی بوون و نەبوونی منی
من نازانم ئەم دەردەم لە کوێوە هاتووە
بەڵام ئەوە دەزانم کە دەرمانم لای تۆیە)

ئەوەی نهێنییە و لای شاعیر ئاشکرا نییە ئەوەیە کە نازانێ لەبەر چی مەیلی بۆ مەعشووقە هەیە، واتە بە دەردی دڵدارییەکە ناگا، بەڵام لەوە دڵنیایە کە ئەم ڕەووشتەی ڕاستە، واتە توانەوە لە ناو مەعشووقە ئامانجی دووایییە و ئەگەر عەشق دەرد بێ، ئەوا دەرمان لای مەعشووقەیە.

بابا تاهیر زیاتر «یەکێتی»یەکە ڕوون دەکاتەوە کە دەڵێ:

بورە بورە کە جانانوم تو وێ تو
بورە بورە کە سولتانوم تو وێ تو
تو خود زوونی کە غەیرەز تو نەزوونوم
بورە بورە کە ئیمانوم تو وێ تو

واتاکەی:

(وەرە وەرە جانی جانم هەر تۆی
وەرە وەرە سوڵتانی من تەنیا هەر تۆی
تۆ خۆت دەزانی کە لە تۆ زیاتر کەس ناناسم
وەرە وەرە بیر و باوەڕم هەر تۆی)

لێرە دا کە دوو شت «من» و «تۆ» بەرامبەر بە یەکتری دادەنێ، مەبەسی ئەوەیە هەر دووکیان بکا بە یەک، یاخود هەر دووکیان هەر یەکێکن، «من» بەلایەوە ناتەواوییە، ئەوەی تەواوی دەکا «تۆ»یە، ئەم «تۆ»یە خۆی یەکێکە و تەواوە، بێ «من»یش هەر

تەواوە، لەبەر ئەوەیە، «من» کە «نەبووە» بە «تۆ» دەبێ بە تەواو.

## ٣- نزیکی دوور - دووری نزیک

گەیشتن بە دڵبەر ئەو پەڕی ئاواتی بابا تاهیرە، ئەگەر بە یەکتری گەیشتن (ویساڵ = وصال) ڕاستەوخۆش نەبێ، با ناڕاستەوخۆ بێ:

خوورەم ئانان کە هەر شامان تە وینون
سوخون واتە کروون واتە نشینون
ئەگەر دەستوم نەوی کایوم تە وینون
بشوم ئانوون بوینم کە تە وینون

واتاکەی:

(بەختیاری بۆ ئەوانەیە کەشەوان تۆ دەبینن
لەگەڵت دا قسە دەکەن و لە تەکت دا دادەنیشن
ئەگەر بۆم نەگونجێ تۆ ببینم
دەچم ئەو کەسانە دەبینم کە تۆیان دیوە)

لێرەدا ئەو یارە یاری هەموو کەسێکە، مەعشووقەی هەموو عاشقانە، لەبەر ئەوەیە بابا تاهیر ئەو کەسانە بە بەختیار دەزانێ کە گەیشتوونەتە ویساڵی مەعشووقە، دیارە خۆی جارێ هەر لە ڕێیە و هێشتا نە گەیشتۆتە نازەنین، ئەگەر تووشی ئەو کەسانە ببێ کە بە مەعشووقە شاد بوون ئەوا ئەویش بەختیار دەبێ چونکە ئەو عاشقانە بۆنی مەعشووقەیان پێوەیە.

لە غەزەلی ڕۆژهەڵات شەڕ و شۆڕ و مەیدانێکی زۆرانبازی دروست دەکرێ بۆ ئەو جووانەی هەموو کەسێک خۆشی دەوێ، ئایا لە دووا جار دا دەبێ بە هی کێ؟! بەڵام باباتاهیر ئەو جووانە لە گێتیی لەش دێنێتە دەرەوە و دەبێ بە بت، کە بوو بە بت دەبێ بە ئایین، ئیتر ئەو کەسانەی بە پەرستن (عیبادەت) دەتوانن بگەنە «بینین» دەبن بە ڕێبەری ئەوانەی لە ڕێگەن. بەم جۆرە بابا تاهیر دیمەنێکی ڕۆمانتیکی دروست دەکا، دڵدارییێکی وا دەخاتە ڕوو بە کەڵکی ئەرزیش و ئاسمانیش بێ.

بیر کردنەوە لە مەعشووقە زیکری شەو و ڕۆژی شاعیرە، بووە بە هۆی هەوێنی خەیاڵبازی و داهێنانێکی وێنەی جووانی کە هەرگیز پێش ئەو نەووتراوە. خۆشەویست دوورە و نزیکیشە، ئەگەر چی ویساڵ بە وێنە ماددییە بەڵام لە ڕاستی دا ئیدیالییە (خەیاڵی)، شانۆی ویساڵ لە سەر بارەگای خەیاڵی گیانە، بۆیە شاعیر دەڵێ:

نەسیمی کەز بونی ئان کاکول ئایوو
مەرا خۆشتر ز بۆیی سونبول ئایوو
بە شەو گیرەم خەیالەشرا دەر ئاغووش
سەحەر ئەز بەستەرەم بۆیی گولّ ئایوو
واتاکەی:
(ئەو شنە بایەی لە نێوان کاکۆڵت دێ
بۆ من لە بۆنی سونبول خۆشترە
بە شەو دەست لە ملی سێبەرت (تارماییت) دەکەم
بەیانی بۆنی گوڵ لە نوێنم هەڵدەستێ)

دڵداریی شاعیر وەکو دڵداریی خەڵکی تر نییە، مەعشووقەی ئەو وەکو مەعشووقەی عاشقەکانی تر نییە، عاشقان بەلای ئەوەوە دوو جۆرن: عاشقی موتلەق و عاشقی زەمینی، ڕێگەی گەیشتن بە عەشقی موتلەقی ڕاست چەتوونە، ئەوەی تر ئاسانە. چەتوونەکەیان عاشقی وا هەیە بڕیوبەتی، هی واش هەیە نەیبڕیوە، هی وەکو بابا تاهیر، بۆیە دەڵێ:

دلم ز دەردی تە دایم غەمینە
بە بالین خشتم و بستر زەمینە
هەمین جورمم کە مو تە دۆست دێروم
نە هەر کەس دۆست دارە حالەش ئینە
واتاکەی:
(دڵم لە دەردی تۆ دایم غەمگینە
خشت سەرینمە و زەوی نوێنمە
گوناهم ئەوەیە چونکە دۆستم هەیە
بەڵام هەموو کەسێکی دۆستی هەیە حاڵی وانییە)

دووریی مەعشووقە گەلێ درێژە لای بابا تاهیر، ئەو دوورییە بێ کۆتاییە، بە بەڵگەی ئەوەی تا تەمەنیشی بە سەر دەچێ هەر ناگاتە دڵبەر کە دەڵێ:

بێ تە ئەشکم ز مۆژگان تەر ئایوو
بێ تە نەخلی ئومێدم بی بەر ئایوو
بێ تە دەرکونجی تەنهایی شەو و رۆچ
نەشینم تاکە عومرم بەر سەر ئایوو

واتاکەی:
(بێ تۆ فرمێسک لە چاووم دێتە خووارێ
بێ تۆ داری ئومێدم بێ بەرە
بێ تۆ لە کونجی تەنیاییم شەو و ڕۆژ
هەروا دەمێنمەوە تا عومرم بە سەر دەچێ).

دەبێ بابا تاهیر نەگاتە ئەو «شت»ەی عەودالّیەتی، چونکە ئەگەر بیگاتێ جادووەکەی بەتالّ و ئەفسانە و نهێنییەکانی ئاشکرا دەبن.

## ٤- یەکێتیی بوون و پاڕانەوە

ڕەنگە ئەو بەلّگە هەلّبژێرراوانەی کە بۆ مەبەسی «یەکێتیی بوون» لە شیعری بابا تاهیر دا دەخرێنە ڕوو لە سەردەمی ئێستامانا وەکو وێنەیێکی دووبارە کراو بێتە پێش چاو، چونکە لە پاش بابا تاهیر گەلێ لە شاعیرەکانی تری سۆفیزمی موسولّمانیی عەرەب و فارس و تورک و کورد و هی تریش داهێنانی یەکجار بەرزیان هەیە لەم مەیدانەدا هی وەکو فەریدەدینی عەتتاری نیشابووری (لە ١٢٣٠م مردووە)، ئیبنولفاریز (١٢٣٥م مردووە)، محیەدینی ئیبنی عەرەبی (لە ١٢٤٠م مردووە)، جەلالەدینی ڕۆمی (١٢٧٣م مردووە)، فەزلولّلای حورووفی (لە ١٤٠٢م مردووە)، نوورەدینی جامی (لە ١٤٩٢م مردووە) و هیتریش. بەلاّم ئەگەر ڕەچاوی سەردەمەکە بکەین دەبینین بابا تاهیر دەبێتە سەر پشک و لە یەکەمین ئەو کەسانە دەژمێررێ کە ئەم وێنانەیان هێناوەتە ناو ئەدەبەوە وەکو داهێنانێک لە قالّبی سۆفیزم دا، باباتاهیر دەلّێ:

بە دەریا بنگرم دەریا تو وینوم
بە سەحرا بنگرم سەحرا تو وینوم
بە هەر جا بنگرم کۆه و دەر و دەشت
مەگەر ئان دەم کە زیبایی تو وینوم

واتاکەی:
(کە ڕوو لە زەریا دەکەم، لە زەریا تۆ دەبینم
کە ڕوو لە سارا دەکەم، لە سارا تۆ دەبینم
ڕوو لە هەر جێیێ بکەم؛ کێو و دەر و دەشت
تەنیا جووانیی تۆ دەبینم).

دڵبـەر هەمـوو شـتـێکە و لە هەمـوو جێیێکە، واتە «بوون» لەوە، یا لەوەوەیە، ئیـتـر «بوونی من» واتە بابا تاهیر، بەشێکە لە «بوونی تۆ» واتە «دڵبەر»، ئەمانە لە یەکتری جـیـا نابنەوە، ئەگـەر چی وەکـو دوو جـەوهەر خـۆیان دەنوێنن، بەلاّم لە ڕاسـتـی دا یەک جەوهەرن، بابا تاهیر ئەمە بەم جۆرە دەر دەبڕێ:

ئەگـــەر دل دلبـــەرە دلبـــەر چ نوومـــە
وەگـــەر دلبـــەر دلـە ئەز چ نوومـــە
دڵ و دلبـــەر بە هەم ئامـــێـــتـــە دێروم
نەزوونـوم دل کـــەهە دلبـــەر کـــو دوومـــە

واتاکەی:

(ئەگەر دڵ دڵبەرە دڵبەر ناوی چی‌یە
ئەگەر دڵبەر دڵە دڵ ناوی چی‌یە
دڵ و دڵبەرم تێکەڵ بە یەکتری بوون
نازانم دڵ کێهەیە و دڵبەر کامەیانە)

ئەم یەکـێـتی‌یە هەمـوو شتـێک کـۆدەکـاتەوە، هیچ «بوون»ێک نی‌یە لە جـەوهەری هەرە گەورە بچێتە دەرەوە، واتە هەمـوو شتێک وێنەی ئەو جەوهەرەی تێدایە، جەوهەری هەرە گەورە ، هی هەمـوو شتێکە، هی هەمـوو کەسێکە، بۆیە لێک بوونەوە و جیـا بوونەوە لە ئارادا نی‌یە:

ئەگـەر مـەسـتـانی مـەسـتـیم ئەز تە ئەیموون
وەگـــەر بێ پاو و دەســـتـــیم ئەز تە ئەیموون
ئەگـــەر گـــەوریم و تەرســـاو و مـــوســـولموون
بە هەرمـیـللەت کـە هەسـتـیم ئەز تە ئەیموون

واتاکەی:

(ئەگەر مەستی مەستانیش بین لە تۆ ئیمان داوا دەکەین
ئەگەر بێ پێ و دەستیش بین لە تۆ ئیمان داواو دەکەین
ئەگەر زەردەشتی و دیان و موسوڵمانیش بین
لە سەر هەر مەزهەبێک بین لە تۆ ئیمان داوا دەکەین)

هەمـوو شتێک لە دەست کردگارە، ئەوەی خۆی دروستی کردووە وێنەی خۆی دەنوێنێ و بەشێکە لە خۆی، واتە نابێ جیا ببێتەوە لێی، لەبەر ئەوە بە دڵنیایی‌یەوە شاعیر دەڵێ:

ئەز ئان ڕۆچـی کـــە مـــارا ئافـــەریدی

به غـەیرەز مـەعـسـیـەت ئەر مـا چ دیدی
خـودا وەند! بە حـەقـقی هەشت و چاورت
ز مـــوو بگوزەر شـــتـــر دیدی نە دیدی

واتاکەی:

(لەو ڕۆژەوە کە ئێمەت دروست کردووە
لە عاسی بوون بەدەر چی‌ترت لە ئێمە نەدیوە
خودایە! بە هەقی هەشت و چووارت (دووازدە ئیمام)
لێمان خۆش بەو وا بزانە گوناهمان نەکردووە).

شاعیر پڕ باوەڕە کە خوداوەند لێی خۆش دەبێ و لە «دوور»ی ئەم نامێنێتەوە بەڵکو لێی «نزیک» دەبێتەوە.

## ٥- ڕێکخراوی دڵداران (عاشقان)

گـوڵ و بلبل، یەکـەمـیـان دروشـمی جـەوهەری هەرە گـەورەیە (کـردگـار)، دووەمـیـان ڕەنگدانەوەی کردگارە و هەمیشە عەودالی ئەوەیە بچێتەوە ناو گەوهەرە هەرە گەورەکەوە، بەڵام بابا تاهیر خۆی و عـاشقـانی تر لە ئادەمزاد لە عەشقـیان دا بە گەرمـتر دەزانێ لە عەشقی بلبل بەرامبەر بە گوڵ، ئەوەی بووە بە نیشانە و بەڵگەی خۆشەویستی لە ئەدەبی هەموو نەتەوەکانی گێتی دا، بابا تاهیر دەڵێ:

بـووره ســـــوتـه دلـوون هـوون تـا بـنـالـیـم
ز هـیـــجـــری ئان گـــولـی رەعنا بنالیم
بشـــیم با بلبلی شـــەیدا بە گـــولشـــەن
ئـەگـــــەر بـلـبـل نـەنالـه مـــــا بـنـالـیـم

واتاکەی:

(وەرن ئەی دڵسووتاوان تا هەمووومان بناڵێن
لە دووریی ئەو گوڵی رەعنایە بناڵێن
لەگەڵ بلبلی شەیدا دابنیشین لە گوڵشەن دا
ئەگەر بلبل نە ناڵێ با ئێمە بناڵێن)

بابا تاهیر خۆی لە دڵداران جیا ناکاتەوە، هەموو کۆمەڵێک ئامانج و رەووشتی خۆی هەیە، تاکەکانی ئەو کۆمەڵە هەست بە ئازاری یەکتری دەکەن، چونکە بۆ یەک ئامانج هەوڵ دەدەن، ئەویش گەڕانەوەیە بۆ جەوهەری هەرە گەورە، شاعیر لەم لایەنەوە دەڵێ:

نەوایی ناله غـــــــەم ئەندووته زونوو
عــــەیاری زەرِری خـــالیس پۆته زونوو
بووره ســــــووته دلوون دل هەم بنـالیم
کـــە حـــالی ســـووته دل دلســـووته زونوو

واتاکەی:

(ئاوازی ناله غەمخۆر دەیزانێ
عەیاری زێرِی خالیس بۆته دەیزانێ
وەرن ئەی دڵسووتاوان با پێکەوه بناڵێن
دڵسووتاو حاڵی دڵسووتاو دەزانێ)

ناوەرِۆکی ئەم دوو بەیتە بە شێوەیێکی فراوان لە ئەدەبی نەتەوەکانی گێتی دا بڵاو بۆتەوە، رِەنگە هەر کەسە بە داهێنانی خۆی بزانێ، کەچی رِاستی‌یەکەی ئەوەتا بابا تاهیر ئەم وێنە بەرزە تازەیەمان بۆ یەکەم جار دەخاتە بەر دەست. جا ئەوەی پێ‌ی زانیوە، یا پێ‌ی نەزانیوە، گرنگ نی‌یە، چونکە لە دووای ئەو ووتوویەتی، هونەر دەگەرِێتەوە بۆ ئەوەی یەکەم جار ووتوویەتی.

## ٢- دڵداری‌ی سۆفیزم لە جووانی مەتریالی دا

با ئەندامانی رِێکخراوی سۆفیزمی سەر رِووی زەوی و ئیماندارانی ئایینی یارسان و هەموو خاوەن دڵێک لە سەر ئەو باوەرِە بن کە دوو بەیتەکانی بابا تاهیر هەمووی رِەمز و نهێنی‌یە و کەس تێ‌یان ناگا، خۆیان نەبن، بەڵام هەر ئەو رەمزانەش بوون بە نموونەی قووڵترین دڵداری و خۆشەویستی لە نێوان ئادەمزادا. لەو کاتەی کە مانای نهێنی لە ناو دوو بەیتەکانی بابا تاهیرا هەیە وەکو ئەوان دەڵێن، بەڵام ئێمەش دەڵێین مانای جووانی دڵداری‌ی رِۆمانتیکیشی هەیە، ئەمەی بە شێوەیێکی ئەدەبی‌ی پرِ لە داهێنان دەر برِیوە.

### ١- دڵبەر کچێکی جووانە

لێرە دا خۆشەویست پەیکەرێکە، نیگارێکی خان و مان و باڵا بەرز و نازدارە، زلفی گوڵاوی‌یە، چاوی بە کل رِێژراوە، ئەوەی ئەم هەموو جووانی‌یەی هەبێ چۆن دەبێ سەرسام بێ، یا چۆن دەبێ پەیکەری وا هەر دەم لە پێش چاوی پیاو نەبێ، شاعیر دەڵێ:

تە کـەت نازندە چەشمـوون سـورمـە سـایە

تـه کـــــــــەت بـالـنـده بـالا دل روبـايـه
ته کـەت مـوشکينه گـێـسـوو دەر قـەفـايه
ئەبی واجی کـــە ســـەر گـــەردوون چرايه
واتاکەی:
(تۆ کە خاوەن چاوی بە کل ڕێژراو و پڕ نازی
تۆ کە خاوەن باڵای بەرز و دڵگیری
تۆ کە خاوەن زلفی موشکینی
بۆ سەرسام و سەر گەردانی لە سەر ڕووی زەوی)

لە دوو بەیتێکی تر دا دەڵێ:
نـیـگاری تازە خـــیـــزی مـــوو کـــوجـــایی
بە چەشـمـوون سـورمـە ریزی مـوو کـوجـایی
نـەفـــەس بەر ســـینـەیی تاهیـــر رەســـیـــدە
دەمی رەفـــتـــەن عـــەزیزی مـــوو کـــوجـــایی
واتاکەی:
(ئەی تازە جووانی ئێمە لە کوێی
ئەی خاوەن چاوی بە کل ڕێژراوی ئێمە لە کوێی
هەناسە لە سنگی تاهیر دەرچوو «گەیشتە گەروو»
ئەو دەمەی ڕۆیشتی، ئەی خۆشەویستی ئێمە لە کوێی)

ئینجا دێتە سەر «لە خۆبایی بوونی نەمر»ی دلبەر بە جووانی خۆی، دەزانێ هەموو کەس گرفتاریەتی، بۆیە بێ باکە، هەروەها بێ وەفاشە، وەفای ئەو هەمیشەیی نییە، کورتە لە تەمەنی گوڵ دایە:
ئەلالـەی کـــۆهســـاروون هەفـــتـــەیی بێ
بنەوشـــەی جـــۆ کناروون هەفـــتـــەیی بێ
مـــونـادی مـیکـــرم شـــەهروو وەشـــەهروو
وەفـــایی گـــولعـــوزاروون هەفـــتـــەیی بێ
واتاکەی:
(هەلاڵەی باغی ناو شاخان هەفتەییە
بنەوشەی گوێی ئاوان هەفتەییە
بانگدەر با شار بە شار بانگ بدا کە

وەفای گوڵڕووان هەفتەیی‌یە)

## ٢- دڵ مەڵبەندی خراپەیە

دڵ لای شاعیر مەڵبەندی دڵداری‌یە، بارەگای یار و خۆشەویستە، ئەمە «جەوهەرێکی ئاسمانی» یا «پەیکەرێکی زەمینی» بێ گرنک نی‌یە. دڵ شتێکی پیرۆزە، جێی هەست و نەستە، نزیک ترین شتە لە ئادەمزاد، بەڵکو گیان و بوونی ئەو ئادەمزادەیە، بەڵام کە دەبێتە مەڵبەندی دڵبەر لە خاوەنی ڕاستەقینەی خۆی دوور دەکەوێتەوە و دەبێتەماڵی دڵبەر، ئیتر شاعیر ناچار دەبێ خۆی لێ بێ بەری بکا، بەم جۆرە دەبێتە مەڵبەندی خراپە، شاعیر دەڵێ:

مەگەر شێر و پەلەنگی ئەی دل ئەی دل
بە موو دایم بە جەنگی ئەی دل ئەی دل
ئەگەر دەستوم فەتی خوونت وەرێژوم
وە وینم تا چ رەنگی ئەی دڵ ئەی دل

واتاکەی:

(دیارە ئەی دڵ تۆ شێر و پڵنگی
لەبەر ئەوەیە هەمیشە لەگەڵ ئێمە لە جەنگ دای
ئەگەر بکەویە بەر دەستم خوێنت دەڕێژم
بۆ ئەوەی ببینم تۆ ڕەنگت چۆنە ئەی دڵ)

کە دڵ وەکو شێر و پڵنگ وابێ دیارە ڕەق و ووشک و بێ بەزەیی دەبێ، لەبەر ئەوە هیوا و ئامانجی شاعیر لەوەدایە کە لێی دوور بکەوێتەوە، زۆر دوور بکەوێتەوە بگاتە کاکێشانی فەلەک.

لە پاشانا زۆر هونەروەرانە بە دڵی دەڵێ کە گوناهی زۆرە، ئەم گوناهە بێ گومان لە لەش دا خۆی دەنوێنێ، بۆیە دەڵێ لەشی قورسی پڕ گوناهت بەجێ بهێڵە تا بەسووکی بگەیە جێ و بارت قورس نەبێ.

دلا! راهی تەپڕ خار و خەسەک بێ
گوزەرگاهی تە بەر ئەوجی فەلەک بێ
گەر ئەز دەستت بەر ئایوو پۆست ئەز تەن
بە رەفکەن تاکە بارت کەمتەرەک بێ

واتاکەی:
(ئەی دڵ ڕێگەت با پڕ لە دڕک و داڵ بێ
ڕووت بەرەو کاکێشانی فەلەک بێ
ئەگەر بۆت کرا پێستت ڕزگار بکەی «لە دەست لەش»
لەشت بەجێ بهێڵە تا بە کۆڵێکی سووک دەربچێ)

ئینجا بەلای شاعیرەوە کە دڵ ڕەق بێ، بەزەیی تێدا نابێ، کە دەڵێین «دڵ دەسووتێ» واتە پڕ لە هەست و نەستە، کە «دڵ نەسووتێ» واتە بێ هەست و نەستە. یاری خۆشەویست دڵی وەک بەردەو بە دڵدار ناسووتێ. بەڵام شاعیر دەڵێ من خۆم دەسووتێنم تا دڵی دڵبەر بسووتێ، چونکە هەر دووکیان هەر یەکێکن و دڵی دڵبەر وا لە ناو دڵی شاعیر دایە. بەم جۆرە دڵەکە لە ناو دەبا چونکە تەڕایی تێدا نی‌یە، بۆیە دەسووتێ، نابینی هەموو شتێک بە ئاگر دەسووتێ تەنیا داری تەڕ نەبێ:

دڵت ئەی سەنگدل بەر ما نەسووجە
عەجەب نەبوە ئەگەر خارا نەسووجە
بسووجم تا بسووجوونم دلت را
دەر ئاتەش چووپی تەر تەنها نەسووجە

واتاکەی:
(ئەی خاوەن دڵی وەک بەرد دڵت بە ئێمە ناسووتێ
سەیریش نی‌یە ئەگەر بەرد نەسووتێ
من دەسووتێم تا دڵی تۆ بسووتێنم
لە ناو ئاگر تەنیا داری تەڕ ناسووتێ)

بابا تاهیر سەرسام ماوە لە دەست ئەم «دڵ»ە، تێی ناگا، نازانێ چی‌یە، هێشتا هەر لە ڕێگایە و نەگەیشتۆتە «ڕاستی»ی دڵەکە، ژیانی ئەمریش بەلای ئەوەوە ئەوەیە کە تێی نەگا و هەر خەریک بێ بۆ ئەوەی تێی بگا، بەڵام هێشتا تێشی نەگەیشتووە:

دلێ دێروم کە بەهبوودەش نەمی بوو
نەسیحەت میکەروم سوودەش نەمی بوو
بە بادەش می‌دەهەم نەش میبەرەد باد
بە ئاتەش می‌نەهەم دوودەش نەمی بوو

واتاكەی
(دڵێکم هەیە قەت حاڵی چاک نابێ
ئامۆژگاری دەکەم بەڵام سوودی نی‌یە
دەیدەمە بەر با بەڵام با نایبا
دەیهاوێمە ناو ئاگر بەڵام دووکەڵی نی‌یە - ناسووتێ).

بەلای بابا تاهیرەوە نابێ لە هیچ کارێک دا ئەنجام هەبێ، چونکە کە ئەنجام ببێ کارەکە کۆتایی دێ، کە کاریش کۆتایی بێ داهێنان نامێنێ، لەبەر ئەوەیە زۆربەی داهێنانی شیعری لەئەدەبی نەتەوەکانی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست دا لە ئەدەبی سۆفیزمی کۆزمۆسی دا دەبینرێ.

## ٣- وێنەی داهێنراوی نەمر

لەگەڵ ئەوەی دوو بەیتەکانی بابا تاهیر هەر یەکەی بۆن و بەرامەیێکی تایبەتی‌ی هەیە و وێنەی داهێنراوی ئەوتۆی هێناوەتە ناوەوە بووە بە نموونەی نەمری ئەدەبی کلاسیکی‌ی گێتی. بەڵام دیسانەوە بەرامبەر هەندێ نموونەی یەکجار بەرز دەوەستین، ڕەنگە هۆی بەرزی ئەم بەرهەمانە ئەوە بێ کە لە ئەدگاری ناوچەیی وەرگیراوون و بە زمانێکی ساکار و ئاسان خراونەتە ڕوو، بەڵام وەستایەتی و شاعیریەتی بابا تاهیر ئەو نموونانەی گەیاندۆتە پۆپە و لووتکە و بوون بە ماڵی هەموو مرۆڤایەتی.

## ١- دڵداری بە هێزترە

دڵداری لە هەموو شتێک و توانایێک بەهێزترە. هەڵۆ ڕاوکەری باشە، بەڵام نێچیری دڵبەرە (ڕەمزی عەشق و دڵداری)، هەڵۆ و شێر و پڵنگ و قارەمانان و شاهنشاهان و بە توانا و زەبر بە دەستان بێ دەسەڵات دەبن بەرامبەر بە عەشق، لە بەر ئەوەیە شاعیر با هەڵۆ بێ، نێچیری هەموو باڵندە و فڕندەی سەر زەوی بێ، ئەو ڕاوکەرە بە توانایە دەبێتە نێچیری چاو ڕەشێکی جووان کە بە برژانگی دەیپێکی:

جـوره بـازی بدوم رەفـتـوم بە نـەخـچـیـر
سـیـەهـ چەشـمێ بزەد بە بـالـی مـوو تیـر
برەو غـافـیل مـەچەر دەرکـۆهسـاروون
هەر ئون غـافـیل چەرە غـافـیل خـوره تیـر

واتاکەی:
(هەڵۆیێکی بەهێز بووم و چوومە ڕاووشکار
چاو ڕەشێک تیرێکی لە باڵم دا
بڕۆ ئەی گێل لە ناو شاخان مەگەڕێ
هەر ئەو گێلەیە کە تیری غافیل «بێ نیشان» دەخوا)

## ٢- فرمێسکی خوێناوی

شاعیران دڵ بە سەرچاوەی فرمێسک دەزانن، لەوێوە هەڵدەقوڵێ، هەر لەبەر ئەوەشە فرمێسک خوێناوە و ڕەنگی سوورە، بەڵام بابا تاهیر دەڵێ فرمێسکی لەبەر ئەوە خوێنی سوورە، چونکە شتێکە ڕەگ و دەماری لە ناو خوێناو دایە:

دلی نازک بە سانی شیشەئەم بێ
ئەگە ئاهی کەشەم ئەندیشەئەم بێ
سریشکم گەر بووە خوونین عەجەب نیست
موو ئان دێرەم کە دەرخوون دیشەئەم بێ

واتاکەی:
(دڵی ناسکم وەک شووشە وایە
ئەگەر ئاه بکێشم گێتی دەسووتێ
سەیر نییە فرمێسکم ببێتە خوێناو
من ئەو شتەم دەمارم لە ناو خوێن دایە)

## ٣- دووری

دووری لەلای بابا تاهیر پڕ لە تەنگوچەڵەمەیە، سووچ و کون و کەلەبەری زۆرە. دووری «موتلەق» لای ئەو نەک تەنیا نزیکییە بەڵکو تووانەوەیە، ئەو تووانەوەیە «هەیە»، یا دەبێ ببێ، بەڵام جارێ وای پیشان دەدا کە ڕووی نەداوە، ئەمە دەخاتە وێنەی مەتریالی هەست پێ کراو. دڵبەر لێی دوورە، بەڵام فەرامۆشی ناکا، وەکو دامەنی کراسی وایە، هەمیشە لەگەڵیەتی تا ڕۆژی مەحشەر:

دلا! پۆشم ز هیجرت جامەیی نیل
کەشم باری غەمت چون جامە بەر زیل
دەم ئەز میهرت زەنەم هەم چون دەمی سوبح

ئەزین دەم تا دەمی ســـووری ســـرافـــیل
واتاکەی:
(ئەی دڵ لە دووریت بەرگی نیلی دەپۆشم
باری غەمت وەکو دامەنی کراسم بە دوواما دەکێشم
هەناسە بە دڵداریی تۆوە دەکێشم وەکو چۆن بەیان هەناسە
دەکێشێ
لە ئێستاوە تا سەردەمی سووری ئیسرافیل)

بەبێ قیامەت بابا تاهیر دەیەوێ لەم گێتی‌یە بچێتە دەرەوە، بۆ کوێ بچێ؟ دەیەوێ دوور بڕوا، لە چین و ماچینیش دوورتر، وەزعی لێ تێک دەچێ، لە پیاو چاکان دەپرسی کە حاجی‌یانن، دوورتر بڕوا یا نا؟ بەڵام ئەوی ڕاستی بێ شاعیر لە سەر ئەو باوەڕەیە کە ئەم دووریی‌یە بێ کۆتایی‌یە، ئەو دیو چین و ماچینیش هەر نزیکە:

بشـــوم واشـــوم ئەزین عـــالەم بەدەرشـــوم
بشـــوم ئەز چین و مـــاچین دیر تەرشـــوم
بشـــوم ئەز حـــاجـــیـــان حـــەج بپـــرســـوم
کـــە ئین دیری بەســـە یا دیر تەرشـــوم
واتاکەی:
(هەوڵ دەدەم کە لەم گێتی‌یە بچمە دەرەوە
لە چین و ماچینیش دوورتر بڕۆم
لە ڕێی سەفەردا لە حاجی‌یان دەپرسم
ئەمەندە دووری بەسە یا دوورتر بڕۆم)

دەرد و ناسۆریش لای شاعیر بێ پایانە وەکو دووری، دەردی دڵی لەبەر دووریی یار ئەوەندە زۆرە ئەگەر دابەشی بکا بە سەر خەڵکی دا هەموو دڵێک دەردەدار دەبێ و دڵی بێ دەرد نامێنێ:

بێ تە یەک دەم دلم خـــوورەم نەمـــوونە
وەگـــەر روویی تە وینەم غـــەم نەمـــوونە
ئەگـــەر دەردی دڵم قـــیـــســـەت نەمـــوویەن
دلی بێ دەرد دەر عـــــالەم نەمـــــوونە

واتاکەی:
(بەبێ تۆ هیچ کاتێک دڵم گوشاد نییە
ئەگەر ڕووی تۆ ببینم غەمم نامێنێ
ئەگەر دەردی دلم دابەش بکەم
دڵی بێ دەرد لە گێتی دا نامێنێ)

## ٤- دڵدار و دڵبەر یەکێکە

بەلای شاعیرەوە لەگەڵ دڵبەر بووە بە یەکێک ئەگەر لە ڕووی پراکتیکییەوە دوو لەش بن، لە ڕووی تیۆرییەوە لە یەکتری جیا نابنەوە، ئەم دوو لەشییە گومانی لا پەیدا کردووە، لە خودا دەپارێتەوە چونکە نازانێ خۆی کێیە ئەگەر لە یاری جیا بێ. ئیتر یەکێتی لە لای شتێکە نابێ نەبێ، چونکە ئەگەر کەس وەری نەگرێ و نەیگرێتە خۆی، ئەی لە کێیە؟ بێ گومان لە یارەکەیەتی:

خـــوداوەندا کـــە بووشم باکـــە بووشم
مـــوژە بەر ئەشکی خـــونین تاکـــە بووشم
هەمـــە کـــەز دەر برانـون ســـووتە ئایوم
تو کـــەم ئەز دەر بەرانـی واکـــە بـووشم

واتاکەی:
(ئەی خودا من کێم؟ لەگەڵ کێم؟
تاکەی موژەم پڕ ئەشکی خوێنین بێ
کە من دەردەکەن، ڕوو لە تۆ دەکەم
ئەگەر تۆ دەرم بکەی ڕوو لە کێ دەکەم؟

هەر لەبەر ئەوەشە لەشیان (مەعشووق و مەعشووقە) لە یەکترییەوە دوور بێ یا نزیک بێ، جەوهەریان یەکێکە، بۆیە شاعیری عاشق بەرگەی هەموو ئێش و ئازارێکی دڵبەر دەگرێ:

ئـەگـــــر ئـایـی بـە جـــــانـت وا نـواژوم
وەگـــەر نـایـی ز هیـــجـــرانت گـــوداژوم
هـەر ئـون دەردی کـــــە داری بـەر دلـم نـە
بمیـــــرم یـا بســــووجم یـا بســـــاژوم

واتاکەی:
(ئەگەر بێیە لام بە گیان و دڵ پێشوازیت دەکەم
ئەگەر نەیێیە لام لە دووریت دەتوێمەوە
هەموو دەرد و ئازاری کە هەتە بخەرە ناو دڵم
بمرم بسووتێم بەرگەی دەگرم)

### ٥- وێنەی هەمیشەیی

بابا تاهیر بۆ دەربڕینی هەستی بەرامبەر بەوەی لە دڵی دایە کە هەر «یار»ە و عەودالی ئەوە، وێنەی ڕەسەنی ئەوتۆ دروست دەکا کە دەبێتە نموونە و هەرگیز فەوتانی بۆ نییە، خراپەی ڕۆژگار ئەوەندە زۆرە برینی پڕ خوێ دەکا، برین خوێی تێ بکرێ ئێش و ژان و ئازار چۆن دەبێ! دووکەڵی ئاهی ئەوەندە دوور دەڕوا تا ئاسمان، لە ئاسمان دوورتر نییە، فرمێسکیش دێتە خووارەوە ئەوەندە دوور دەڕوا دەگاتە ماسی، دیارە لە ماسیش دوورتر نییە بۆ خووارەوە کە زەوی لە سەر پشتیەتی:

ز شـــۆر ئەنگێـــزی بی چەرخ و فـــەلەک بێ
کـــە دایم چەشـــمی زەخـــمم پڕ نمەک بێ
دەمـــا دەم دوودی ئاهم تا ســـەمـــاوات
تەنم نالان و ئەشکم تا ســـەمـــەک بێ

واتاکەی:
(بە هۆی ئەو خراپی‌یەی لە چەرخ و فەلەکەوە بۆم دێ
هەمیشە چاوی برینم پڕ خوێ دەبێ
دەماودەم دووکەڵی ئاهم تا ئاسمان دەڕوا
لەشم دەناڵێ و فرمێسکم دەگاتە ماسی)

بابا تاهیر وێنەییێکی داهێنراوی تر دەخاتە ڕوو، عەشق دڵی گێژ کردووە، ئەگەر برژانگەکانی وێک بنێتەوە فرمێسک وەک سولاوکە دێتە خوارێ، دڵی عاشق وەکو ئەو دارە تەڕە وایە سەرێکی دەسووتێ و سەرێکی خوێناو دەڕێژێ:

دلێ دێروم ژ عـــیـــشـــقت گـــێج و ویجـــە
مـــوژە بـەرهەم زەنوم خـــوونا بەریجـــە
دلی عـــاشق بســـانی چووپی تەر بێ

ســـەری ســـووژە ســـەری خـــونا بەریجـــە
واتاکەی:
(دڵێکم هەیە لە عیشقت گێژ و وێژە
برژانگەکانم وێک بێنمەوە سولاوکە دێتە خوارێ
دڵی عاشق وەکو داری تەڕ وایە
سەرێکی دەسووتێ و سەرێکی خوێناو دەڕێژێ)

بابا تاهیر لە وێنەیێکی تر دا مەسەلەی جوانی دەکاتە شتێکی مەتریالی هەست پێ کراو، چاو پێوەندیی بە گیروودەیی و گرفتاریی دڵەوە هەیە. هێلانە و مەڵبەندی دڵداری دڵە، دڵ لە ڕێگەی چاوەوە جوانی دەدۆزێتەوە:

بـــەلایـــە دل بـــەلایـــە دل بـــەلایـــە
کـونەهـ چەشـمـوون کـرون دل مـوبتـەلایە
ئەگـــەر چەشـــمـــوون نەوینێ ڕوویی زیبـــا
چ زونوو دل کـــە خـــوبوون دەر کـــوجـــایە
واتاکەی:
(بەڵایە دڵ بەڵایە دڵ بەڵایە
گوناهی چاوە کە دڵی موبتەلا کردووە
ئەگەر چاو ڕوخساری جووان نەبینێ
دڵ چوزانێ جووانان لە کوێن)

مانای تازە یەکێکە لە خاسیەتە هەرە دیارەکانی شیعری بابا تاهیر، کابرایێکی بێ توانا و هەژاری وەکو خۆی ئەگەر نەترسێ، یارێکی بەهێزی دەوڵەمەند کە بووە بە دروشمی جوانی و نەوەکو تەنیا گێتیی ئێمەی بە دەستەوەیە، بەڵکو گێتیی یەکەی تریش، جا ڕووتەڵەیێکی وەکو بابا تاهیر نەترسێ، ئەم نموونەی هێز و توانایە بۆ دەبێ بترسێ:

کـــوشـــیـــمـــون ئەر بە زاری ئەزکـــە تەرسی
بەرانی ئەر بە خـــواری ئەر کـــە تەرسی
مـــو وا ئین نیـــمـــە دل ئەز کـــەس نەترســـەم
دوو عـــالـەم دڵ تە داری ئەز کـــە تەرسی
واتاکەی
(ئەگەر بمکوژی بە دڵ شکاوی لە کێ دەترسی

ئەگەر دەرم بکەی بە کەساسی لە کێ دەترسی
منی لاواز بەنیو دڵ لە کەس ناترسم
تۆ دڵی دوو گێتیت هەیە لە کێ دەترسی!)

خۆشەویستی شاعیر دڵبەری هەموو کەسێکە، لە شوێن وێنە و مانا دەگەڕێ، دەیەوێ بڵێ زۆر کەس گرفتاری ئەو یارەیە، زۆر زۆری ژماردووە، ئیتر لە ژماردن کەوتووە لەبەر زۆری، بۆیە وەستاوە. بەڵام زوو بەزوو پێمان دەڵێ ئەو نەژمارادراوە زۆر زیاترە لەوەی ژماردراوە، وەکو ئەوەی شاعیر بڵێ نەوەکو تەنیا هەموو ئادەمزاد گرفتاری ئەو یارەیە، بەڵکو لە «هەموو»ش زیاتر:

هەزارت دل بە غـــارەت بردەویشــه
هەزارانت جیگەر خوون کرده ویشه
هەزاران داغ و ویش ئەرویشم ئەشمرت
هەنی نەشمرته ئەز ئەشمرته ویشه

واتاکەی:
(هەزار دڵت بە غارەت بردووە
هەزاران جگەرت پڕ خوێن کردووە
هەزاران برینم ژماردووە
ئەوەی نە ژماردراوە لەمە زۆر زیاترە)

***

سەر دەستەی شاعیرانی کورد بابا تاهیری هەمەدانی لەگەڵ نموونەی داهێنانی بەرز دوو بەیتەکانی لاپەڕەی زێڕینیان لە مێژووی ئەدەبی کوردی کلاسیکی دا بۆ خۆیان تەرخان کردووە. بابا تاهیر بە کوردی ژیاوە و بە کوردی بیری کرۆتەوە، باوەڕی بە ئاینێک (یارسان) بووە زمانی کوردی زمانی لاهووتی و پیرۆزی ئەو ئایینە بووە. سرووودەکانی بابا تاهیر بە شێوە و ڕوخسار بە زمانی کوردین، بەڵام بە ناوەرۆک ڕەنگدانەوەی هەست و نەستی هەموو مرۆڤایەتین و لە قاڵبی سۆفیزمی کۆزمۆسی دا خۆیان دەنوێنن.

# بەشی دووازدەم

# شیعر و ئەدەبیاتی ئایینی یارسان

## ۹۰۱م - ۱٦۰۰م

لە سەدەی دەیەمی مەسیحی لە پاڵ دوو بەیتەکانی بابا تاهیر - کە ئەوانیش بە شێوەیێکی تر بە ئەدەبی یارسان دەژمێررێن - ئەدەبی ئایینی یارسان بە بەردی بناغەی باڵەخانەی ئەدەبی ڕەنگینی کوردی دادەنرێ. ئەو ئەدەبە بۆ خزمەتی بیر و باوەڕێکی گەلێ کۆن کەوتە ناوەوە، ئەو بیر و باوەڕە شێوەیێکی سۆفیزمی وەرگرت بوو، خەریکی «یەکێتی‌ی بوون» بوو. بە گشتی سۆفیزمی ئیسلامی کە بەشێک بوو لە سۆفیزمی کۆزمۆسی لەو سەردەمەدا لە ڕوودا بوو. بیر و باوەڕی یارسان هەر ئەوەندە شێوەی ئیسلامی وەرگرت بوو، چونکە بایەخێکی تایبەتی‌ی بە عەلی‌ی کوڕی ئەبوو تالیب دەدا، بەوەی یەکێک بوو لە پەروەردگارە گەورەکانیان و بەپێ‌ی دۆنا دۆن بە لەش ئادەمزاد و بە گیان کردگار بوو.

بەپێ‌ی بیروڕای یارسانەکان لە سەردەمی تازەدا، واتە دەورەی پاش ئیسلام کردگار حەوت جار خۆی لە بەرگی ئادەمزاددا نوواندووە، هەر جارەش «چار مەلەک» یا پێنج فریشتەی بووە، وەکو لای خووارەوە:

| | ١ | ٢ | ٣ | ٤ | ٥ |
|---|---|---|---|---|---|
| کردگار | جوبراییل | میکاییل | ئیسرافیل | عیزراییل | ؟ |
| عەلی‌ی مورتەزا | سەلمان | قەنبەر | | نەسیر | فاتیمە |
| شا خۆشێن | بابا بزورگ | کاکە ڕەزا | بافیقی | بابا تاهیر | ماما جەلالە |
| سوڵتان سەهاک | بنیامین | داوود | پیر مووسا | مستەفا | دایراک |
| قرمزی | کامری جان | یاری جان | یارلی | | ڕەزبار |
| محەمەد بەگ | جەمشید بەگ | ئەلماس بەگ | ئەبدال بەگ | ؟ | پەری خان |
| خان ئاتەش | خان جەمشید | خان ئەلماس | خان ئەبدال | ؟ | دۆستی خانم |

ڕاستی لە بارەی یارسانەوە ئەوەیە بیر و باوەڕیان لە فەلسەفە ئایینی‌یە هەرە کۆنەکانی ڕۆژهەڵات میترایزم و زەردەشتی و هیندۆکی وەرگرتووە. لە ئایینی دیانان دا لاسایی «لە دایک بوونی عیسا»یان کردۆتەوە، وەکو ئەوەی لە سەر ئەو باوەڕەن کە شا خۆشێن و سوڵتان سەهاک لە دوو کچ بەبێ ئەوەی پیاو تخوونیان بکەویتەوە لە دایک بوون، پێوەندیی ئەمانە بە دایکیانەوە وەکو عیسا و مریەم وایە. گەلێ خوو و ڕەووشتیان بە تایبەتی لە کۆ بوونەوەی نان خواردنیان لە جەمخانە (نیاز خانە) لە «دووا نان خواردن»ی عیسا دەکا لەگەڵ یارانی.

ژمارەییێکی زۆر لە نەتەوەی کورد لە سەر ئەو ئایینە بوون، زمانی ڕەسمیی ئایینەکە زمانی کوردی بوو، لەبەر ئەوە وەکو هەموو نەتەوەییێکی خاوەن زمانێکی ڕەسەنی خۆی و ئایینێکی تایبەتی ئەدەبیاتی ئایینەکە بە زمانە نەتەوایەتی‌یەکە پەیدا بوو.

پێشەوایانی ئایینی یارسان ناویان کوردی بوو (لوڕی و گۆرانی و کرمانجی)، حەوت وێنەی کردگارەکانیان هەموویان کوردی کوردستان و لوڕستان بوون، عەلیی لێ دەربچێ.

## ڕەنگدانەوەی فەلسەفەی یارسانەکان لە شیعریان دا

بیر و باوەڕی ئایینی یارسان کە لە سەر بنچینەی دۆنا دۆن دروست بووە، ئەوە دەگێڕێتەوە کە کردگار حەوت جار دێتە خووارەوە بۆ سەر زەوی و بە شێوەی ئادەمزاد خۆی دەنوێنێ، هەر جارەش چووار فریشتە (یارانی چار مەلەک)ی لەگەڵدا دەبێ. کردگار لەگەڵ فریشتەکان دا یەکێتی‌یێکی تەواو و بێ کەمو کووڕی دروست دەکا. لە کتێبی پیرۆزی تیرەییێکیاندا «دەفتەری تیرەی هەیاسی» ئەمە بە شیعر هاتووە:

جەبرەییل دانا
پیر بنیامین، جەبرەییل دانا
دووەم ئیسرافیل، داوود وانا
سێیەم میکاییل، مووسا نە مانا
چارەم عیزراییل، مستەفاش زانا
پێنجەم حوورلعەین، ڕەمزەن وە مەعنا
شەشەم شەنتاییل، مالک کیانا
هەفتەم ئیسماعیل، ئەیووت بروانا

واتاکەی:
(جبراییل دانایە
پیر بنیامین، جبراییلی دانایە
دووەم ئیسرافیلە ئەمە داوودە
سێیەم میکاییلە خۆی لە موسادا دەنوێنێ
چووارەم عیزرائیلە بە مستەفا دەناسرێ
پێنجەم حوورولعەینە، رەمزە لە ناو مانا
شەشەم شەنتاییل بە شێوەی مەلەک نێرراوە
حەوتەم ئیسماعیلە بە ناوی ئەیووت هاتووە)

بەم جۆرە لای یارسانەکان هێزی دروستکەر «گیان» لە ئاسمان دەبێ و «لەش» لە سەر زەوی دەبێ. بە لایانەوە لەگەڵ ئەوەی کردگار لە بنج دا هەر گیانێکە، بەڵام چونکە دەچێتە ناو لەشی جۆراو جۆرەوە خۆی لە قاڵبی جیاواز دا پیشان دەدا، بەم پێیە بە ناویش وەکو لەش زۆر دەبێ، بۆ بەڵگە لە «دەفتەری پردیوەری» دا سوڵتان سەهاک لە شیعرێک دا بە زمانی بنیامین (جوبراییل) دەڵێ:

داوود رەهبەرەن، وە شوون و شەسا
خواجام «قودرەت» بێ، غولام سەرمەسا
یاران بەیانی، شاهێد و گەوا
یادیم وە دەرگای، خواجای «شەنتیا»
ئەوسا پادشام، نە دەوون «یا» بی
نە ئەرز نە سەما، نە سوورەییا بی
نە زات نە بەشەر، نە شەرت نە قەرار
نە لەوح نە قەڵەم، نە دەنگ نە دیار

واتاکەی:
داوود رێبەرە و نێرراوە
خواجام (مورشیدم) قودرەتە، من غولامی (مریدی) سەر مەست بووم
یاران بەڵگە و شاهیدی دەدەن
لە دەرگای خواجەی شەنتیا (داوود)

ئەوسا پادشام (لە دۆنا دۆن) «یا» بوو
نە ئەرز، نە ئاسمان، نە ئەستێرەکان هەبوون
نەزات، نە بە شەر، نە ئەرز نە قەرار
نە لەوح نە قەڵەم نە ئاواز نە خەڵک هەبوون

لێرەدا ناوەکانی «قودرەت» و «شەنتیا» و «یا» ناوی کردگارن لە ئایینی یارسان دا.

مینۆرسکی لە بابەت «یا» کە ناوی کردگارە، لە سەر ئەو باوەڕەیە کە ووشەی «بنیامین» بە مانای «کوڕی (یا)ی ئەمین هاتووە»، موعادەلەکە بەم جۆرە دادەنێ: «بنیامین = بن (بە مانای کوڕ)+ یا+ ئەمین = کوڕی (یا)ی ئەمین».

لە پاش دروست کردنی حەوتەکەی خاوەن کار (کە گیانی خودان)، چل مەخلووقی تر دروست کرا، بە شێوە و ئەدگار و سیما لە حەوتەکە دەکەن. شێخ ئەمیر لەم لایەنەوە دەڵێ:

چل شەمع، چل چرا، چل دانە فەنەر
چل گول، چل گەوهەر، چل جامی جەوهەر
هەر چل یەکێ بی، یەکێ هەر چل بی
سەرمایەی ئەسلەش، شای بەرزەمل بی

واتاکەی:

چل مۆم، چل چرا، چل دانە نەفەر
چل گول، چل گەوهەر، چل جامی لؤ لؤء و مرواری
هەموو چلەکان یەکێکن، یەکیش هەموو چلەکانە
بنج و بناوانیش شای گەردەن کەش و سەر بڵندە

ئایینی یارسان تەنیا خەریکی هێزی چاکە نەبووە لە «بوون» دا، ئەویش وەکو هەموو ئایینەکانی تر بیروڕای تایبەتی بووە لە بارەی هێزی خراپەوە.

بەم جۆرە ئەوانیش شتێکی وەکو شەیتانی موسوڵمانان و ئەهریمەنی زەردەشتی‌یان و ئیبلیسی ئایینەکانی تریان هەیە، بەلام بیروڕایان بەرامبەر بەم هێزە لەگەڵ بیرو ڕای ئایینەکانی تر یەکتری ناگرنەوە. ئەوان لە سەر ئەو باوەڕەن کە «مەلەک تاووس» کەسێکی خێر خوا و باشە، چونکە ئەوانەی فەرمانی خودا بەجێ ناهێنن و پیاوی خراپن دەدرێنە دەست مەلەک تاووس بۆ ئەوەی تەنبێ‌یان بکا و سزایان بدا، بەم کردەوەیەی دەبێتە شەڕ بۆ خراپان، هەر لەو کاتەدا لە لایێکی ترەوە وێنەی دروشمی خێر و چاکە دەنوێنی.

لەم ڕووەوە شاعیریان دەڵێ:

نــــــــاوەش نــــــــاووس بــــــــی
زاتی شـــــاخـــۆشین، ناوەش ناووس بی
عــەلی‌ی مــورتەزا، هەم کــەیکاووس بی
خــواجــە عــەلادین، «مــەلەک تاووس» بی

واتاکەی:

ناوی ناووسە
زاتی شاخۆشێن ناوی ناووسە
عەلی‌ی مورتەزا کەیکاووسە
خواجە عەلائەدین مەلەک تاووسە

هەموو بەرهەمی شیعری ئاینی یارسان جگە لە نرخی ئیستێتیکی وەکو بەرهەمێکی ئەدەبی - هونەری داهێنراو، سەرچاوەیێکی گرنگ و بنچینەییشن بۆ زانینی ڕاستی‌ی ئەم ئایینە و نووسینەوەی مێژووی پەیدا بوون و پەرەسەندن و بە سەرهاتی بە تایبەتی لە دەوری تازەی دا کە دەکەوێتە دەوری ئایینی موسوڵمانی لە کۆمەڵی کوردەواری دا.

## کتێبی سەرەنجام

شیعری ئایینی یارسان وەکو هەموو ئەدەبی ئایینی بە درێژایی ڕۆژگار دروست بووە و لە پاشانا کۆ کراوەتەوە، گەلێ جار خاوەنی ئەم شیعرانە نەناسراون. بەڵام خۆیان شیعرەکان دەدەنە پاڵ کردگار و فریشتە و پیر و پیاو چاکانیان. بەم پێیە لە هەر ناوچەیێک دا کۆمەڵێک شیعر پەیدا بووە، یا کۆمەڵە شیعری شاعیرێک کۆ کراوەتەوە، ئیتر بە ناوی ناوچە، یا ڕۆژگار، یا ناوی خاوەنەکەیەوە کەوتۆتە ناوەوە. بە دەسنووسی کۆمەڵە شیعرەکان دەڵێن دەفتەر، شیعرەکەش خۆی «کەلام»ی پێ دەووترێ، هەندێ جاریش بە ناوی قۆناغ (دەورە)ی کردگارەکە، یا فریشتەکەوە دەنرێ، وەکو «دەورەی شا خۆشێن» واتە ئەو شیعرانەی لە ڕۆژگاری ژیانی شا خۆشێن ووتراوون، لە لایەن خۆیەوە یا یارانی‌یەوە.

لەمەوە ئەوە دەردەکەوێ کە یارسانەکان تەنیا یەک کتێبی پیرۆزیان نەبووە، بەڵکو هەموو تیرە و بەش و تایەفە و بنەماڵەیێک کتێبی تایبەتی‌ی خۆیانیان هەیە، هەندێ جار جیاوازی و تەنگوچەڵەمەش بەدی دەکرێ لە ناوەڕۆکی کتێبەکانیان دا.

کتێبی سەرەنجام یەکێکە لە کتێبە گرنگەکانی ئایینی یارسان، مینۆرسکی لە ساڵی ١٩٠٢ دەسنووسێکی ڕاستی ئەم کتێبەی دۆزی بووەوە، لە سەردەمی گەشتەکانی لە ئێران و کوردستان دا، دەسنووسەکە لە ساڵی ١٢٥٩ھ/ ١٨٤٣م نووسرا بووەوە. ئەم کتێبە گرنگە بریتی‌یە لە مێژووی ئایینی یارسان، لە پاشانا مینۆرسکی دەسنووسەکەی بڵاو کردەوە، زۆربەی بە زمانی فارسی بوو، هەندێ پەخشان و شیعریشی تێدا بوو بە دیالێکتی گۆرانی‌ی زمانی کوردی، ئەمەی هەموو گۆڕی‌یە سەر زمانی ڕووسی و لە ساڵی ١٩١١ بڵاوی کردەوە.

ماشەڵڵا سووری کتێبی سەرەنجامی ناو ناوە «سروودی ئایینی یارسان»، کتێبەکە بریتی‌یە لە کۆمەڵێک لە سروود و گۆرانی‌ی ئایینی. سەرەنجام ناوی دەفتەرێکی بە ناوبانگە لە دەفتەرەکانی یارسانان. ئەم کتێبە بە پەخشان دەست پێ دەکا و بە شیعر دووایی دێ، بە دیالێکتی گۆرانی‌ی زمانی کوردی نووسراوەتەوە. یارسانەکان سەرەنجام بە بەرهەمی سوڵتان سەهاک دادەنێن، لە سەر ئەو باوەڕەن کە خەڵکی ساکار ئەو توانایەیان نی‌یە لە ماناکانی بگەن. بڵاو کەرەوە لە کۆتایی کتێبەکەدا دەڵێ: لەو کاتەی ویستم سوپاسی سەید فەروخ ئاتەش زەرکە بکەم بۆ یارمەتی‌یەکانی لە دانانی کتێبەکەم دا، ووتی: کەس ناتووانێ لەم کەلامانە بگا، ئەمە موعجیزەی سوڵتان سەهاکە.

کتێبی سەرەنجام یا سروودی ئایینی یارسان لە دوو بەش پێک هاتووە، بەشی یەکەمی پەخشانە و بەشی دووەمی شیعر. پەخشانەکان لە پارچە پێک هاتوون، سەرەتای پەخشان بە دروست بوونی «بوون = گەردوون» دەست پێ دەکا، خوو و ڕەووشت و ڕەسم و عادەتی یارسانەکان دەخاتە ڕوو. هەرچی سرووده شیعری‌یەکانیشن بریتین لە (١٠) پارچە، وەکو لای خووارەوە:

سروودی یەکەم: «خان ئەلماس وەسفی دروست کردنی بوون دەکا».
سروودی دووەم: «عالی قەلەندەر وەسفی گۆڕرانی ناوەوەی خۆی دەکا».
سروودی سێیەم: «گفتوگۆی سوڵتان سەهاک لەگەڵ ڕێبەر میکاییل».
سروودی چووارەم: «لە بابەت گرنگی‌ی کردگارناسین و لێ بووردنەوەیە».
سروودی پێنجەم: «لە بابەت ڕەسم و شەعاییری قوربانی‌یەوەیە».
سروودی شەشەم: «لە مەدحی داوودە».
سروودی حەوتەم: «لە مەدحی مەعشووق عەلی‌یە».
سروودی هەشتەم: «لە مەدحی یادگارە».

سروودی نۆیەم: «لە مەدحی جەمشیدە».

سروودی دەیەم: «لە تەلقینی مردووە».

جێی خۆیەتی لەم ماوەیەدا سروودی حەوتەم و هەشتەم وەکو نموونە و بەڵگەیێک بخرێنە ڕوو، چونکە سروودی حەوتەم لە بابەت عەلییەوەیە، کە بە نەتەوە عەرەبە، وە سروودی هەشتەمیش لە بابەت بابا یادگارەوەیە کە بە نەتەوە کوردە. بەڵام دەبێ ئەوەش بزانین کە یارسانەکان خۆیان و هەموو سەرکردەکانیان بە نەژاد کوردن.

سروودی حەوتەم:

ئەووەل ئاخیر یار

بووا نام سەنای، ئەووەل ئاخیر یار
یار یەعنی مەولام، ساحیب زولفەقار
ئوستادی ئەزەل، جە بەر تا وە بار
میعماری کەونەین، سەما سێ و چار
سەمای چار مەلەک، پەیکی پەیغام ئار
یەک لومەع نووری، وەرا نام خۆوەر
قەرار دا نە ڕووی، سەما چون گوهەر
یەک نووری هەنی، قورسی قەمەرەن
موسەووەر نە ڕووی، عەرشی ئەنوەرەن
ئەختەر بێ شەمار، سابیت و سەییار
پەرێ ڕۆشنایی، شەبستانی تار

واتاکەی:

سەرەتا و کۆتایی تەنیا یارە
سەنا خووانی بە، سەرەتا و کۆتایی تەنیا یارە
یار یەعنی مەولام، ساحیبی زولفەقارە (عەلی)
وەستای «بوون»ە، لە ووشکایی و زەریا
هەر دوو گێتی و هەر سێ و چووار (حەوت) ئاسمانی دروست کردووە
ئاسمانی چووار مەلەک و پەیکی پەیام هێنەر (جبراییل)ی دروست کردووە
تیشکێک لە نووری ناونرا ڕۆژ

جێی خۆی لە ئاسمانا گرت وەک گەوهەرێک
نوورێکی تری بوو بە مانگ
وێنەیان لە ڕووی عەرشی ئەنوەر کێشراوە
ئەستێرە بێ ژمارەیە، نەبزووتوو و گەڕۆک
بۆ ئەوەی تاریکە شەو ڕووناک بکاتەوە

سروودی هەشتەم:
یادگاری یار
دەخـــیـلەن ئامـــــان، یـادگــــاری یـار
یا زاتی زات پاک، ســـەرداری ســـەرکـــار
نـــازی نـــاز ڕەواج، ژ پـــەروەردگـــــــــار
چلانـە چل تـەن، ســــەبز پۆش نـوور پۆش
ســـەرانەی باقی، تیـــژ هۆش تیـــژ گـــۆش
ڕەواجی هەر دین، ســەر حـەلقــەی شــاهان
جـەمـشــیـدی جـەم بەن، شـۆن بەری ڕاهان
ئیـــرەجی یەحـیـا، ســیـا وەحـشی کـــەی
حـــوســـێن شــەهیــد، نە کـــەربەلای تەی
عـــالی قـــەلەندەر، تاهیـــر قـــەلەندەر
هەنـی چیش وا چووم، پووری ئـەسکـەندەر

* * *

یادگـــــار دەخـــــیـل، تۆ تاجی شــــاهی
تۆ تاجی تاجیـــەخش، جـــیـــهـــان نەمـــایی
یادگـــار وە حـــەق، ســـوڵـتـــانی ســـەرجـــەم
وە ئیـــســـمی ســـوڵـتـــان، ســـەد هەزاران کـــەم
وە حـــەقـــــقی داوود، ڕەهبـــەرەن وە نـــوور
وە حەقـقی عـیـسا، مـووسـای کـۆهی توور
وە شــــای یەرزەمـــــەل، پیـــرە ڕەنگینەن
پیـری ئەو شاهەن، ئیـســمـەش ســەنگینەن
مـــەتلەبی حـــاجـــەت، «فـــاریغ» ڕەواکـــەر
وە ســـاحـــیب کـــەرەم، ســـوڵـتـــان ســـەروەر

واتاکەی:
یادگاری یاری من
دەخیل و ئامان، یادگاری یاری من
ئەی زاتی زات پاک، تۆ سەردار و سەرکاری
پەروەردگار نازی تۆ هەڵدەگرێ
چل فریشتەی کە نووری سەوزیان پۆشیوە
نویشکی بیر و ئاوازی نەمرن
سەرداری ئایین و سەر هەڵقەی شاهانی
جەمشیدی جەمی، ڕێ پیشاندەر و شوون هەڵگری
ئیرەجی یەحیا و سیاوەشی کەی
حوسێنی شەهید لە سارای کەربەلا
عالی قەلەندەر و تاهیر قەلەندەر
هەرچی تریش بڵێم تۆ زیاتری، کوڕی ئەسکەندەری

***

یادگار دەخیلتم تۆ تاجی شاهانی
تۆ تاج پێشکێش بە هەموو شاهان دەکەی
ئەی یادگار بە هەقی سوڵتان جەم
بە ناوی سەد هەزاران سوڵتان هێشتا هەر کەمە
بە هەقی داوود، ڕێبەری ڕووناکی
بە هەقی عیسا، بە مووسا کێوی توور
بە شای بەرزەمل، بە پیر ڕەنگین
پیری ئەو شاهەیە کە ناوی سەنگینە
نیازی (فاریغ) بهێنە دی
بە هەقی ساحیب کەرەم و سوڵتانی سەروەر

## قۆناغەکانی ئەدەبی ئایینی یارسان

پیری یارسانەکان خاوەن بیر و باوەڕ و خوێندەوار بوون، بە زمانی کوردی بیریان دەکردەوە و قسەیان دەکرد، بیروڕا و فەلسەفەی ئایینەکەیان بە شیعر دەردەبڕی، لە قاڵبی شیعری میللی فۆلکلوری نەدەچوونە دەرەوە، هەر ئەو قاڵبەیان بەکار دەهێنا بۆ مەبەسی دەربڕینی هەست و نەستی دەروونیان و دەستووری ئایینەکەیان. بێ گومان ئەم پیرانەی

ئاییینی یارسان بەم بەرهەمانە دەبن بە شاعیر و خۆیان و شیعریان دەچنە ناو مێژووی ئەدەبی نەتەوەوە.

ئەدەبیاتی ئاییینی یارسان بە گشتی بە سەر سێ قۆناغ دابەش دەکرێ:

١- قۆناغی یەکەم: ئەدەبیاتی ئاییینی یارسان لە سەدەکانی (١٠- ١٢م)یە، ئەم بەرهەمە ئەدەبی - ئاییینی‌یە لەو دەفتەر و نامانەدا پارێزراوون کە بە ناوی «دەورەی بالوول»، «دەورەی بابا سەرهەنگ»، «دەورەی شا خۆشێن»، «دەورەی بابا ناووس» تۆمار کراوون، نویشکی ئەمانە لە کتێبی «سەرەنجام» دا نووسراونەتەوە.

یارسانەکان لە سەر ئەو باوەڕەن کە لە دەورەی ئیسلام دا، لە سەدەی دووەمی هیجری بالوولی دانا (٨٠٦م کۆچی دوایی کردووە) یەکەمین کەس بووە کە ئاییینی یارسانی لە هەورامان تازە کردۆتەوە، هەندێ شیعری کوردیشیان بە ناوی ئەوەوە لە بڵاوکراوەی «دەورەی بالوول»دا نووسیوەتەوە!

٢- قۆناغی دووەم: ئەدەبیاتی ئاییینی یارسان لە سەدەکانی (١٣- ١٥)یە، ئەمە بریتی‌یە لە گرنگترین دەوری تازە کردنەوەی ئاییینی یارسان کە لە سەر دەستی سوڵتان سەهاک بووە. کتێبی سەرەکی ئەم ئاییینە «سەرەنجام»ە و لە نووسینی سوڵتان سەهاکە.

ئەو شیعرانەی سوڵتان سەهاک و یارانی دایانناوە هونەرێکی سەرکەوتووە و پۆپەی ئەدەبیاتی ئاییینی یارسانە. جگە لە سەرەنجام لە ڕۆژگارانی ژیانی سوڵتان سەهاک گەلێ کتێبی تر کەوتوونەتە ناوەوە، وەکو «دەفتەری پردیوەری» کە «دەفتەری دیوانە گەورە» شی پێ دەڵێن، «دەفتەری ساوا»، «دەفتەری رامیار»، «دەفتەری زولال زولال»، «دەفتەری گەواهی غولامان»، «دەفتەری شندروێ»، «دەفتەری عابیدینی جاف» و هی‌تر.

٣- قۆناغی سێیەم: ئەدەبیاتی ئاییینی یارسان لە سەدەکانی (١٦- تا سەرەتای سەدەی ٢٠)ە، ئەمە دووبارە کردنەوەی بیروڕای سوڵتان سەهاکە. لە پاشانیشا بزووتنەوەی شیعری ئاییینی یارسان تا سەرەتای سەدەی بیستەم بەردەوام بوو، بەرهەمە هەرە گرنگەکانیان ئەم دەورەو کەلام و دیوانانەن: « دەورەی ئاتەش بەگی»، «دەورەی بابا جەلیل»، « دەورەی چل تەن»، دەورەی حەیدەری – سەید براکە»، «دەورەی هەیاس»، «دەورەی هەفتەوانە»، «کەلامی ئەلماس خان»، «دیوانی دەروێش قولی‌ی کرندی»، «دیوانی زولفەقار»، «دیوانی سەید یەعقووبی ماهی دەشتی»، «دیوانی شا تەیموری بانی یارانی»، دیوانی قاسید = قاصد»، «کەلامی شێخ ئەمیر»، «کەلامی نەورۆز». بە پێی

بەرنامەی ئەم کتێبە تەنیا قۆناغی یەکەم و دووەم لە ئەدەبی ئایینی یارسان دەکەونە ناو ئەم بەرگەوە، ئەوەی تر لە دواییدا لە شوێنی خۆی دا باسی لێوە دەکرێ.

## قۆناغی یەکەمی شیعری ئایینی یارسان

ئەم قۆناغە ناوی هەندێ لە پیری یارسانمان بۆ دەور دەکاتەوە، بێ گومان بەرهەمی شیعری ئەم شاعیرە پیرۆزانە بە سەرەتای ئەدەبێکی ئایینی بەرز دادەنرێ لە مێژووی ئەدەبی کوردی دا.

### بابا سەرهەنگی دەودانی ۹۳۵م - ۱۰۰۷م

بابا سەرهەنگ کوڕی ئیبراهیمی دەودانی‌یە، لە هەرێمی دەودان، لە ناوچەی شاخی شاهۆی هەورامانی لهۆن لە خوارووی شاری سنە لە ساڵی ۳۲٤ﻫ/ ۹۳۵م لە دایک بووە. ساڵی لە دایک بوونی بەم دێڕ شیعرە تۆمار کراوە:

وە سەنەی سێ سەد بیست و چوار هیجری

هاتیف نامی ئەو جە شاهۆ چری

لە دووا ساڵانی سەدەی چووارەمی هیجری (۳۹۸ﻫ/ ۱۰۰۷م) کۆچی دوایی کردووە و لە گوندی تەوێڵە نێژراوە، زۆربەی ڕۆژگاری ژیانی لە هەورامان بردۆتە سەر.

هەندێ دوو بەیتی بابا سەرهەنگ و یارانی لە «دەفتەری دەورەی بابا سەرهەنگ» پارێزراوون. ئەوەی سەرنج ڕادەکێشی ئەوەیە بەرهەمی شیعری دەورەی بابا سەرهەنگ هەمووی بە شێوەی دوو بەیتە، وە هەر چووار نیو دێڕە شیعر لە سەر یەک قافیە دەبێ.

۱

پەی ئامانتان، پەی ئامانتان
گرد ئامادە بان، پەی ئامانتان
ئەز مەلهەم مەنیە و نە زامانتان
مەرەسم وە هەق ئیمامانتان

واتاکەی:

(پێویستمان بە یارمەتیتان هەیە
هەموو کۆ ببنەوە بۆ یارمەتی
برینتان مەلحەم دەکەم
مافی رابەر و ئیمامانتان ڕا دەگرم)

لەم شیعرەدا ئەو ڕاستی‌یەمان بۆ ئاشکرا دەبێ کە لەو سەردەمەدا گەلێ بیروڕاو تێبینی بەرامبەر بە ئایین لە ناو ئیسلام خۆیدا پەیدا بوو بوو، لەبەر ئەوە چەند و چوون و زۆرانبازی نەوەکو تەنیا لە نێوان دەسەڵاتی خەلیفەی عەباسی کە پیڕەوی شەریعەتی دەکرد لە ناوەوە بوو و دەسەڵات بەربەرەکانی‌ی دەکرد، بەڵکو بێ بەزەیی‌یانە قەلاچۆی پاشماوەی ئایینە کۆنەکانیشیان دەکرد. لەمەوە دەتووانین بیر لەوە بکەینەوە کە بابا سەرهەنگ ئەم شیعرەی لە کاتێک دا ووتبێ کە تەنگو چەڵەمە لە نێوان دەسەڵاتی خەلیفەی عەباسی و هاووڵاتی‌یانی شارەزوور و هەورامان لە ناوەوە بوو بێ، لەمە ئەوەمان بۆ ئاشکرا دەبێ کە ئایینی یارسان لەم ناوچەدا بەهێز بووە و کاری ئایینە کۆنەکانی پێوە دیار بووە بە تایبەتی ئایینی زەردەشتی.

٢

سەرهەنگی دەودان، سەرهەنگی دەودان
ئەز کە نامان، سەرهەنگی دەودان
چەنی ئێرمانان، مەگێلم هەردان
مەکۆشم پەرێ، ئایینی کوردان

واتاکەی:

(من کە سەرهەنگی دەودانم
ئێمە کە ناومان سەرهەنگی دەودانە
لەگەڵ یاران لە زەوی و هەردان دەسووڕێینەوە
تێدەکۆشین بۆ زیندوو کردنەوەی ئایینی کوردان)

شاعیر لێرەدا بە تەواوی دیاری دەخا کە ئایینی یارسان بەردەوامی ئایینە کۆنەکانی پێش ئیسلامی ئەو ناوچانەیە، دیارە مەبەسی لە ئایینی پێشووی کوردان ئایینی زەردەشتی‌یە.

٣

ها یاگەم چۆڵەن، ها یاگەم چۆڵەن
وە وێنەی فەرهاد، ها یاگەم چۆڵەن
لالم نە باڵەن، پۆستم نە کۆڵەن
هامدەمم کۆهەن، یاران نە هۆڵەن

واتاکەی:
(جێگەم چۆڵ و بیابانە
وەکو فەرهاد جێگەم چۆڵ و بیابانە
بازیبەند لە قۆڵ و پۆست لە کۆڵم دایە
هاو دەمم کێوە، یارانم بێ ئارامن)

شاعیر لەم دوو بەیتەدا دەگەڕێتەوە سەر شێوەی ڕەمزیی سۆفیزم، وێڵ و سەر گەردان لە دەشت و چۆڵ و هەردو بیابانان دەسووڕێتەوە و لە شوێن ڕاستیدا دەگەڕێ.

٤

هەفتم سەر خێڵەن، هەفتم سەر خێڵەن
جە ئاسمان دا، هەفتم سەر خێڵەن
هەر یەک وەرەنگێ، نەگەیشت و گێڵەن
هەر یەک پەی کارێ، ئاوارە و وێڵەن

واتاکەی:
(حەوت تەنم سەر دەستەی خێڵی فریشتەکانن
لە ئاسمانا حەوت تەنم سەر دەستەیە
هەر یەکەی بە ڕەنگێ خەریکی کارە
هەر یەکە عەودالی کارێکە و بە ئاسمانا بلاو بوونەتەوە)

مەبەسی شاعیر لە «حەوت لەش» حەوت فریشتەیە، ئەمانە لە پێش دروست بوونی ئادەمزاد هەبوون، کاری ئاسمان و زەوی‌یان پێ سپێررا بوو. مێشکی ئەو فریشتانە کردگار خۆی بوو. لە ئاڤێستاش باس لەو حەوت فریشتەیە کراوە، بەلام لەوێ شەش فریشتەن، مێشکی هەموویان دەبێتە فریشتەی حەوتەمین و «ئەهورامزدا»ی لێ دروست دەبێ.

## پیر شالیار ١٠٠٦م - ١٠٩٨م

پیر شالیار (پیر شەهریار) ناوی خودا دادی کوڕی جاماسپە، بە پیری شالیاری هەورامی ناوبانگی دەرکردووە. یەکێکە لە پیر و گەورە و پێڕەوانی ئایینی یارسان. بەپێی ئەو زانیاری‌یانەی لە یەکێ لە دەسنووسەکانی سەرەنجام و کتێبی «دەورەی شا خۆشێن» بلاو کراوەتەوە، لە دووا سالانی سەدەی چووارەمی هیجری (٣٩٧ھ/ ١٠٠٦م) لە هەورامان لە دایک بووە. لە سەردەمی لاویەتی ڕووی کردۆتە لوڕستان بۆ لای شا

خۆشێن، سێ ساڵ لای ماوەتەوە، لە پاشانا لەسەرداوای شاخۆشێن گەڕاوەتەوە هەورامان و خەریکی بڵاو کردنەوەی بیر و باوەڕی یارسان بووە. زانایێکی گەورە بووە لە زانستییەکانی دانایی و کەلام و مەنتیق. لە دووا ساڵانی سەدەی پێنجەمی هیجری ٤٩٢هـ/ ١٠٩٨م) کۆچی دوایی کردووە.

لە ناو شارەزایانی مێژووی کولتووری کورد لە کوردستانا ئەوە بڵاوە کە لە هەورامان پیرێکی پڕ بیر و باوەڕی ئایینی لە موغانەکانی زەردەشت ژیاوە، ناوی پیر شالیار بووە کتێبێکی ئامۆژگاری و دانایی لە پاش بەجێ ماوە بە ناوی «ماریفەتۆ پیر شالیار)، لەلای هەورامییەکان پیرۆزە و پیشانی خەڵکی نادەن.

لە سەرچاوەیێکی ئەدەبی یارسان دوو بەیتێک بە ناوی پیر شالیارەوە تۆمار کراوە. شاعیر لە شیعرەکەی دا باس لە ئاگردان دەکا وەکو مەڵبەندی پرتەو و هەوایێکی زەردەشتییانە لە شیعرەکەدا دەپژێ:

ئەو ئاهر خانە، ئەو ئاهر خانە
بارگەی شام وەستەن، ئەو ئاهر خانە
زەردەشتەش کیاست، پەری فەرمانە
بەر گوزیدەش کرد، نە ڕووی زەمانە

واتاکەی:

(ئەم ئاگر خانەیە (ئاتەشکەدە)
مەڵبەند و بارەگای شای منە ئەم ئاگر خانەیە
زەردەشتی کەیخوسرەوە خاوەن فەرمانە
هەڵبژاردە و تەنیای هەموو سەردەمێکە)

لەم شیعرەوە لە شیعرەکانی تری پیر شالیاریش دا بە ڕوونی شەقلی پێش موسوڵمانەتی دیارە، ووشەی عەرەبی و لێکسیکۆن (تەعبیر)ی موسوڵمانی بە سەر دا زاڵ نەبووە. ئەمەش بەڵگەیێکی ترە کە ئایینی ئیسلام درەنگ لە ناوچەی هەورامان بڵاو بۆتەوە. لە ناو خەڵکی ئەوە باوە هەورامییەکان تا سەدەی یازدەم هێشتا لە سەر ئایینە کۆنەکانی پێش ئیسلام بوون، مەلا گوشایش (گوشایشە کوێر) کوڕی پیر محەمەدی بابا مەردۆخی هەورامییە (٧٩٠هـ/ ١٣٨٨م - ٨٧٣هـ/ ١٤٦٨م) لەبەر ئەوەی چاوی کەمێ مژمۆر بوون پێیان ووتووە «گوشایشە کوێر»، دەستێکی باڵای هەبووە لە بڵاو کردنەوەی ئایینی ئیسلام لە ناوچەی هەورامان،

لەبەر ئەوەی پیر شالیار پێش سەدەی یازدەم کەوتووە، کە هەورامی‌یەکان هێشتا نەبوو بوون بە موسوڵمان بۆیە دەڵێن «ماریفەتۆ پیر شالیار» لە قورئان کۆنترە.

هەر لەو نموونە کەمەی کە لە کتێبی «ماریفەتۆ پیر شالیار» ماوەتەوە ئەوە دەردەکەوێ کە تێبینی‌ی قووڵ لە دانایی و فەلسەفە و پەند و ئامۆژگاری خراوەتە ناو قاڵبی دوو بەیتەوە. لە ڕووی کێشەوە دە سیلابی‌یەوە وەستان لە ناوەڕاست دایە وەکو زۆربەی هەرە زۆری شیعری دیالێکتی گۆرانی، لە ڕووی قافیەشەوە هەموو نیوە دێڕەکان لە سەر یەک قافیەن، ڕستەکانی کورت و سفت و ڕەونەقدارن.

پیر شالیار لە کتێبەکەی دا لە پاش هەموو دوو بەیتێک (کووپلە) ئەم بەیتە دووبارە دەکاتەوە:

گۆشت جەواتەی، پیر شالیار بۆ
هۆشت جە کیاستەی، زانای سیمیار بۆ

واتاکەی:

(گوێت لە ووتەی پیر شالیار بێ
بیرت لەلای کردەوەکانی زەردەشتی زانا بێ)

ئەو شیعرانەی پیر شالیار کە تا ئێستا دەست کەوتوون ئەمانەی خووارەوەن، گۆیا لە کتێبی «دەورەی شا خۆشێن» وەرگیراوون:

یاران جە ڕێواس، یاران جە ڕێواس
پادشام پەیدا بی، جە دانەی ڕێواس
مەشیە و مەشیانە، بەرامان جەواس
پەرێ ئازمایی، مێردان رەواس

واتاکەی:

(ئەی یاران لە ڕێواس
پاشام پەیدا بووە، لە دانەی ڕێواس
ئادەم و حەوا لە دەنکی گەنم هاتوون
تا ئەو کەسانەی لە رووەک پەیدا بوون تاقی بکرێنەوە
(ئیمتیحان بکرێن)).

٢

وەروێ وەوا رۆ، وەروە وەرێنە

وەرێســـــــە بڕیۆ، چووار ســـــــەرێنە
کــەرگێ ســیــاوە، هێــڵــێش چەرمــێنە
گـــوشـــڵێ مـــە مـــێـــریۆ، دووە بەرێنە
واتاکەی:
(بەفر دەبارێ و دەتوێتەوە
گوریس کە پارچە دەکرێ چووار سەری لێ پەیدا دەبێ
مریشکی ڕەش هێلکەی سپی دەکا
گۆزەی شکاو دوو دەرگای لێ پەیدا دەبێ)
٣
داران گــیــان دارەن، جــەرگ و دل بەرگــەن
گـــایێ پڕ بەرگـــەن، گـــایێ بێ بەرگـــەن
کــەرگــە جــە هێــڵــێن، هێــڵێ جــە کــەرگــەن
ڕەواس جـــە ڕەواس، وەرگێ جـــە وەرگـــەن
واتاکەی:
(درەختان گیانیان هەیە جەرگ و دڵیان بەرگە
هەندێ جار گەڵایان هەیە، هەندێ جا گەڵایان نییە
مریشک لە هێلکەیە، هێلکە لە مریشکە
ڕێوی لە ڕێوییە، گورگ لە گورگە)

ئەم وێنە ئەدەبی میللییانە هەندێکیان بوون بە قسەی نەستەق لە ناو خەڵکیدا، هەر چۆنی بێ ئەم جۆرە داهێنانانە لە ئەدەبی سۆفیزمەوە نزیکن.

## شا خۆشێن ١٠١٥م - ١٠٧٤م

ناوی موبارەک شایە، لەقەبی بابا خۆشێن، یا شاخۆشێنە. بەپێی سەرچاوەکانی ئایینی یارسان بە تایبەتی «سەرەنجام» لە ساڵی ٤٠٦ه/ ١٠١٥م لە لوڕستان لە دایک بووە.

ئەوەی لە ئەفسانە ئایینییەکانی یارسان هاتووە ئەوە دەگەیێنێ کە شا خۆشێن سێیەمین ئەدگاری کردگارە لە سەر ڕووی زەوی. لە لوڕستان پەیدا بووە. گۆیا لە ماما جەلالەی کچی میرزا ئەمانا بووە، ماما جەلالە کچ بووە و بەبێ ئەوەی نێرینە تخوونی بکەوێ شا خۆشێنی بوو. ئەم گێڕانەوەیە لە بەسەرهاتی لە دایک بوونی مەسیح دەکا.

نویشکی ئەفسانەی لە دایک بوونی شا خۆشێن بەم جۆرەیە: «میرزا ئەمانا یەکێ بوو لە

گەورە و دەوڵەمەند و سەردارانی لوڕستان. شەش کوڕ و کچێکی هەبوو، کچەکە ناوی ماما جەلالە بوو. ڕۆژێ ماما جەلالە کە لە خەو هەڵدەستێ، بۆ یەکەمین جار ئەو بەیانی‌یە ڕووناکیی ڕۆژ بە دەموچاوی دەکەوێ، گلۆڵەیێک تیشکی ڕۆژ دەچێتە ناو دەمیەوە و لە گەروویەوە بۆ خووارەوە دەڕوا، ئەموستی بۆ ناو قورگی دەبا، هەر چەندە دەکا بێ سوود ئەموستی بەر هیچ ناکەوێ، چونکە شتێکی مەتریالی نەبوو لە گەرووی بێتە دەرەوە. لە پاشانا ماما جەلالە ڕووداوەکەی بۆ دایکی گێڕایەوە.

ماوەییێک تێپەڕی، زگ پڕی پێوە دیار بوو.

دایک و باوک و براکانی لێی کەوتنە گومانەوە. باوکی ماما جەلالە کوڕەکانی ئاگادار کرد کە پێویستە خوشکیان ببەنە جێگەییێکی نادیاری نەهێنی و بیکوژن. کوڕەکان بۆ هێنانەدی ئارەزووی باوکیان، خوشکەیان لەگەڵ خۆیان برد و لە ئاوایی چوونە دەرەوە، تا گەیشتنە ئەو جێیەی پێویستە تێیدا لە ناوی ببەن. دیار بوو برای هەرە بچووک سۆزی شیری دایکێتی بزووتوو بووەوە، لەبەر ئەوە ووتی:

لام وایە هیچ کامێکمان نایێتە دڵی خوشکی خۆی بکوژێ، چاکتر وایە لەم چۆڵ و بیابانە بە تەنیایی بەجێی بهێڵین، تا دێوێک یا دڕندەییێک تووشی دەبێ و دەیخوا. بەڵام یەکێ لە براکان دڵڕەق دەبێ و دەڵێ: من لە فەرمانی باوکم ناچمە دەرەوە، ئێوە ئەگەر دەتانەوێ بڕۆن، فەرموون من بە تەنیا دەیکوژم، ئیتر ئەوان ڕۆیشتن و خوشک و برایان بە تەنیا بەجێ هێشت.

برا کە دەستی کردە هێنانەدی فەرمان، لە پێشانا دەست و چاوی جەلالەی بەست و شمشێری هەڵکێشاو دەستی بلند کرد بەڵام لە پڕ دەستی لە سەر سەری ووشک بوو و نەهاتە خووارەوە، وای زانی ئەمە کاری شیری دایکێتی‌یە، ئەم جارەیان بە دەستی چەپ شیری هەڵکێشا بەڵام دیسان هەر چەندە کردی دەستی نەهاتە خووارەوە. لە پڕ ئەو منداڵەی لە ناو زگی جەلالە بوو، بە زمان هات و ووتی: «جەلالە داوێن پاکە، ئەو منداڵەی لەو پەیدا دەبێ، جیلوەییێکی خودایی‌یە». لەو کاتەدا کاکە ڕەزا پەیدا بوو و دڵی مامە جەلالەی دایەوە و مژدەی دایە کە ئەو منداڵەی لەو دەبێ جیلوەییێکی خودایی‌یە، ناو و ناوبانگی گێتی پڕ دەکا.

برا لەشی کەوتە لەرزین و لە کردەوەی پەشیمان بووەوە و کەوتە سەر دەست و پێی خوشکی و داوای لێ بوردنی لێ کرد، هەر دووکیان پێکەوە گەڕانەوە ماڵێ، کوڕەکە

هەموو شتێکی بۆ باوکی گێڕایەوە.

لەو کاتەی کە ماما جەلالە بە تەما بوو باری بخاتە سەر ڕووی زەوی میرزا ئەمانا فەرمانی دەرکرد کە خەڵکی کۆ بکەنەوە بۆ ئەوەی بە چاوی خۆیان ببینن کچەکەی چۆن منداڵی دەبێ. لەو کاتەدا تەشتێکی زێڕ لە ئاسمان هاتە خووارەوە و لە پڕ گڵۆڵەیێک پرتەو لە دەمی جەلالە هاتە دەرەوە و چووە ناو تەشتەکەوە، لە ناو نوورەکە منداڵێکیان بەدی کرد، کوڕ بوو. قوماشی نایاب و گرانیان هێنا و منداڵیان پێچایەوە و ناویان نا موبارەک شا، لە پاشانا بە ناوی شا خۆشێن دەنگی دەرکرد».

شا خۆشێن سەردەمی منداڵی لە لوڕستان بردۆتە سەر، لە پاشانا ڕووی لە خوێندن کردووە، ئینجا بۆ ماوەیێک چووە بۆ هەمەدان. لە تەمەنی ٣٢ ساڵی‌دا، لە کاتێک دا لە سەر لووتکەی کێوی یافتە لە خوڕەم ئابادی لوڕستان موناجاتی لەگەڵ کردگارا کردووە نووری خودا پەیدا بووە و چۆتە لەشیەوە و بووە بە ڕێبەری یارسانان. ئەم گێڕانەوەیەش لە ڕووداوی مووسا و کێوی توور دەکا.

لە ساڵی ٤٦٧ھ/ ١٠٧٤م کە لە گەشتی کرماشان بووە، لە نزیک هەرسین کۆچی دووایی کردووە.

شا خۆشێن لەسەردەمی لاویەتی‌دا دووبەیتی دادەنا، لەسەر ئاوازی تەنبور لەجامخانە لەلایەن یاران و پێڕەوانیەوە بە گۆرانی دەبێژران، ئەو شیعرانە شاخۆشێن و شیعری یاران و پێڕەوانی لە پاشانا بوون بەو کۆمەڵە شیعرەی کە بە ناوی «دەورەی شا خۆشێن»ەوە ناونران.

شیعری بابا خۆشێن لە چووار چێوەی ئیدیۆلۆجیەتی ئایینی یارسان ناچنە دەرەوە، وەکو لەم نموونانەی لای خوووارەوە دەردەکەوێ.

١

یارسـان وەرا، یارسـان وەرا
وای هەق راسـیـەن، بـرانـان وەرا
پاکی و راسـتی و نـێـوەکی و ردا
قـەدەم وە قـەدەم، تا وە مـەنزلگا

واتاکەی:

(ئەی یارسانان وەرنە سەر ڕێ

ڕێی هەق ڕاستی و دروستی‌یە
هەموو دەبێ لە ڕێی ڕاست بڕۆن
هەنگاو هەنگاو تا دەگەنە مەنزڵگا)

شا خۆشێن لەم سروودەدا یارسان بە ئایینی ڕاست و ڕاستی دەزانێ و بەو ڕێیەی دادەنێ کە پیاو دەگەیێنێتە بەختیاری، لە شیعرەکەدا بە ئاشکرا داوا دەکا کە هەنگاو بە هەنگاو شەعائیری ئایین پێویستە بێتە دی.

٢

حەیدەری نازار، حەیدەری نازار
ئەز چەنی تۆمەن، حەیدەری نازار
پەرێ قەبالە، مەکەرە ئینکار
لزا کاوەرۆش بگیرە قەرار

واتاکەی:

(ئەی حەیدەری نازدار و میهرەبان
هەموو شتێکی بۆ من حەیدەری نازدار
نهێنی‌یەکانی یارسانان ئینکار مەکە
لزا خانم ئەو نهێنی‌یە دێنێ و بە ئێوەی دەڵێ)

لەم دوو بەیتە دا قسە لەگەڵ عەلی دەکا و دەیەوێ تێی بگەیێنێ کە ئەویش وێنەیێکە لە کردگار، با بە ئاشکرا لە ناو خەڵکی بە ناوی ئایینێکی تر ناسرا بێ.

٣

مامام جەلالە، کاکام ڕەنگینە
دۆن وە دۆن ئامام، چینە وە چینە
ها ئیسا یوورت و نامم خوەشینە
هەر کەس بشنا سۆم، پاکش مەوکینە

واتاکەی:

(دایکم جەلالەیە، کاکم ڕەنگینە
لە گیانێک بۆ گیانێک دێم و دەچم
ئێستا بە ناوی خۆشێن دەرکەوتم
هەر کەس بمناسێ دڵی لە کین دوورە)

لەم دوو بەیتە دا بە ئاشکرا ئەفسانەی لە دایک بوونی خۆی دەردەبڕێ، تەنیا ناوی دایکی دەهێنێ وەکو مەسەلەکەی مەسیح.

٤

ئەز چەنی تۆمەن، شەهریار بێ گەرد
قەڵای کەنگاوەر، ئانە بێ وەگەرد
دوڕنەتای دەریا، ئێمەی بەروارەرد
نامەکەی مەشیە، ئێمەی بەرد ئەوفەرد

واتاکەی:

(ئەی پیر شالیاری پاک
ئێستا قەڵای کەنگاوەر ویران و پڕ غوبارە
لەو ڕۆژەی کە دوڕ لە دەریا پەیدا بوو
ئێمەش بە ناوی ئادەم هاتینە ئەم گێتی‌یە)

شاعیر لێرەدا باس لە دوو ڕووداو دەکا، یەکێکیان قەڵای کەنگاوەرە، ئەویتریان دوڕە. قەڵای کەنگاوەر بریتی بوو لە قەڵا و کۆشک و باڵەخانەییێکی کۆن، پەرستگاییێکی تێدا بووە لە گەورەترین پەرستگای گێتی دەژمێررا. دوڕەکەش، یا دوڕی سپی یەکەمین دروست کردنی کردگارە، گەوهەری پاکی پێ دەڵێن، لەوەوە «بوون» پەیدا بووە.

شا خۆشێن لەم دوو بەیتە دا لەگەڵ پیر شالیار قسە دەکا و دەڵێ: ئەی پیر شالیاری پاک، قەڵای کەنگاوەر ئەوەی ترسی خست بووە دڵی خەڵکەوە، بە فەرمانی خودا ویران بوو، لەو ڕۆژەوە کە گەوهەری پاک دروست بوو، ئادەم پەیدا بوو و ئێمەش لە پشتی ئەوەوە هاتینە خووارەوە.

٥

ئەی مەیی بێ گەرد، ئەی مەیی بێ گەرد
راستیم دا وە تۆ ئەی مەیی بێ گەرد
راستیم دا وە تۆ شەرتم ڕەدا بەرد
نامی مەشیانە ئێمەی برد وە فەرد

واتاکەی:

(ئەی مەیی کیژی پاک
من ڕاستی بە تۆ دەڵێم ئەی مەیی کیژی پاک

من ڕاستی بە تۆ دەڵێم پەیمانیش دەدەم بە ڕەدا
ناوی حەوا ئێمەی لە دوڕی زەریا دەرهێنا)

شا خۆشێن لەم دوو بەیتە دا لەگەڵ خاتوون مەیی کیژ دەدوێ، پێی دەڵێ ڕاستی بە تۆ دەڵێم و پەیمانیش بە کاکە ڕەزا دەدەم کە لە ڕاستی لا نەدەین، بە ناوی مەشیانە (حەوا) لە دوڕی زەریا هاتووینەتە دەرەوە،

## بابا ناووسی جاف ١٠٨٤م -١١٦١م

ناوی ئیبراهیم و باوکی ئەحمەدە، لەلای یارسانان بە ناوی بابا ناووسی جاف ناسراوە، یەکێکە لە پیرە گەورەکانی یارسان و چووارەمین ئەدگاری کردگارە لە سەر ڕووی زەوی، بەپێی گێڕانەوەکانی کاکە ڕەزایی لە ساڵی ٤٧٧ھ/ ١٠٨٤م لە گوندی سەرگەت لە هەورامانی لهۆنی کوردستان لە دایک بووە.

لە کتێبی سەرەنجام دا ئەوە هاتووە کە بابا ناووسی جاف لە سەرەتای ژیانی دا خوێندەواری وەرگرتووە، بەڵام لە پاشانا وازی هێناوە و خۆی خەریکی لایەنی پراکتیکی دەروێشی و دێوانەیی و سۆفیزم بووە، ئەمە لە سەرانسەری دوو بەیتەکانی دا دەردەکەوێ. لە ناو خەڵکی دا بە «بلە شێتە» ناوبانگی دەر کردووە. لە ساڵی ٥٥٧ھ/ ١١٦١م هەر لە هەورامان کۆچی دوایی کردووە.

هەندێ دوو بەیت لە بابا ناووسەوە ماوەتەوە لە کتێبی «دەورەی بابا ناووس» دا تۆمار کراوە، زۆربەی لە بابەت ئامۆژگاری و پەند و قسەی نەستەق و زانستی و دانایییەوەیە.

١

نام مەن بلە و شۆرەتم ناووس
با بۆم ئەحمەدەن، ساحیب جاو کووس
پێکانم وە سەر جووقەی پەڕ تاووس
زات ئاسوارەنان چەنی کەیکاووس

واتاکەی:

(ناووم ئیبراهیمە و شوهرەتم ناووسە
باوکم ئەحمەدە و خاوەن جێ و ڕێیە
کلاوی پەڕی تاووس لە سەر دەنێم
لەگەڵ کەیکاووس یەک گیانمان هەیە)

لەم دوو بەیتە دا شاعیر خۆی پێمان دەناسێنێ، بە تایبەتی ئەوە دەردەخا کە شای گێتی‌یە و خاوەنی «بوون»ە. بەپێی فەلسەفەی دۆنا دۆن گیانی کەیکاووس شاهنشای کۆن هاتۆتە ناو لەشی ئەوەوە. ئەوەی ئاشکرایە ئەوەیە کە کەیکاووس بەلای یارسانەوە یەکێکە کە گیانی کردگاریان چۆتە لەشەوە لە دەورەی یەکەمی پاش پەیدا بوونی مەشیە و مەشیانە (ئادەم و حەوا).

٢

ئەز ناوو سانان، جەی بەرزە ماوا
ئاسیاووم نیاوە، جەی تاشی کاوا
هەر کەس نەهارۆ، لەلا نیاوا
فەردا مەوینی، رووشان سیاوا

واتاکەی:

(من ناووسم لە جێی بەرز و بڵند دەژیم
ئاشی خودا پەرستیم لەم کێوە داناوە
هەر کەسێک باراشی لەم ئاشەدا نەکا
سبەینێ دەبینێ رووی ڕەش بووە)

بابا ناووس باس لە خواردنی بنچینەیی ئادەمزاد دەکا کە گەنمە، ئاشی لە سەر کێو دروست کردووە، چونکە کردگار دەبێ لە جێی بڵند بێ، ناوی ناوە ئاشی خودا پەرستی، لەبەر ئەوەی گەنم مایەی ژیانە پێویستە باراشی لە ئاشی خودایی لێ بکرێ، ئەگەر لە ئاشێکی تر لێی بکا سبەینێ رووی ڕەش دەبێ، واتە لە ڕۆژی قیامەت دا بە ڕوو ڕەشی دەمێنێتەوە.

٣

جەوێما جەوێم، جەوێما جەوێم
دەرد و دەرمانم، جەوێما جەوێم
لوام وە ملە و دەست بەردم وەنێم
دیم تیری باران کەفتەن ئەو دلێم

واتاکەی:

(لە ناو خۆم دایە
دەرد و دەرمانم لە ناو خۆم دایە

چوومە سەر گرد و دەستم بۆ درەختی نێم برد
دیم کە تیرە باران دەکرێم)

لەم دوو بەیتە دا بابا ناووس لە تۆبە کردن دەدوێ، وا دەردەخا کە پیاو هەست بە گوناهی دەکا، دەبێ خۆی پاک بکاتەوە، بۆ ئەمە دەچێتە سەر گرد و دەستی بۆ درەختی «نێم»ی بۆن خۆش دەبا. کردگار تیرە بارانی دەکا و دڵی دەپێکی، بەمە لە گوناه پاک دەبێتەوە.

٤

جەویێم پەنهانا، جەویێم پەنهانا
تیرێ وەم کەفتەن، جەویێم پەنهانا
تیر جە گەوهەرا، گەوهەر جەکانا
تا نەخی مێردان، بدۆ بێستانا

واتاکەی:

(تیرێکی نهێنی
تیرێک بریندارى کردم، تیرێکی نهێنی
تیر لە گەوهەرە، گەوهەریش لە کانە
بۆ ئەوەی پۆلی مێردان بگەنە بێستان)

بابا ناووس هەمیشە خەریکی ڕێ پیشان دانە، لە سەر ئەو باوەڕەیە کە ئێش و ئازار پیاو لە گوناه پاک دەکاتەوە. تیری خودایی کە دڵی ئادەمزاد دەپێکی پاکی دەکاتەوە، ئەو تیرە لە گەوهەری یەکانەیە لە کانی خودایی، واتە هەمیشەیی‌یە، ئیتر بە پاک بوونەوەی گوناهیان مێردان دەگەنە بێستانی سۆزی خودایی.

٥

ئەز ناووسانان، مەیۆ نان جە سەر
تیغی دوو دەمم، نیان نە کەمەر
جە سینەم مەگنۆ، مرواری و گەوهەر
زات ئاسوارانان، چەنی شا حەیدەر

واتاکەی:

(من ناووسم لە جێی بڵندەوە دێم
شمشیری دوو دەمم (زولفەقار) لە کەمەر دایە
لە سینگم دا مرواری و گەوهەر شارراونەتەوە

من و شا حەیدەر (عەلی) لە یەک دانە گەوهەرین)

لەم دوو بەیتە دا شاعیر دەیەوێ ئەوە دەربخا کە گیانی هاتۆتە ناو لەشی ئەوەوە و هەر دووکیان لە یەک دانە گەوهەرن. دیارە ئەوەش لە بیر ناکا کە لە ئاسمانەوە هاتۆتە خووارەوە، واتە گیانی کردگارە، شمشێری زولفەقاری عەلیی لە کەمەر دایە.

جەبێ یاوەری، جەبێ یاوەری
خەریک مەندەنان، جەبێ یاوەری
تۆ وێت بشناسا و بکەر داوەری
ئیتر چۆن باوەڕ، وە مەرگ ماوەری

واتاکەی:

(لە بێ یاری و مەعشووقی
لە بێ یاری وێڵ و سەر گەردانم
تۆ خۆت بناسە و ئەقڵت بە ڕاستی بشکێ
ئیتر چۆن باوەڕت بە ئەهریمەن دەبێ و دەیناسێ)

شاعیر جوان و ساکارانە ئەوە دەر دەبڕێ کە ئەو کەسەی خۆی بناسێ ئیتر چۆن باوەڕی بە خراپە دەبێ.

٧

جە سەراو سەرێ، جەبان و ماهێ
چەنی کۆڵدر و گوم کەردە ڕاهێ
شین بین وە مێهمان، یەک شان و شاهێ
فەرقمان نابێ نە رووی تەختگاهێ

واتاکەی:

(لە جێی بڵند و شاخێ کە بارەگای خودایە
ڕێمان لە عابید بزر کردووە
چووینە میوانداریی سوڵتان و شاهێک
هیچ جیاوازییێک لە نێوانمان دا نەبوو)

بابا ناووس لە زۆربەی شیعرەکانی دا خەریکی ئاسمان و جێی بڵندە، ئەمە دیارە لەبەر ئەوەیە چونکە خۆی بە گیانی کردگار دەزانێ. هەموو کەسێکی کە لە ڕاستی بگەڕێ بێ گومان دەگاتە بارەگای سوڵتان و شا و هەموو یارسانان و لە ناو گەوهەری یەکانە دەتوێتەوە (یەکێتیی بوون).

٨

جــــەزاو و ســــەری، جـــەکـــۆ و دەشـــتی
جـــــە دلی باغــی، وێنــەی بــەهەشــــتی
جــەم بیم مــەگـیلیــام، پەی بەخت نەشــتی
تـا بیــم وە هامــــــدەم زیـوا ســـــەرشــــــتی

واتاکەی:

(لە سەرەوە لە کێو و دەشت
لە ناو باغی وێنەی بەهەشت
جەمشید بووم تووشی بەختیاری هاتم
تا بوومە هاودەمی زیوا سەرشتی)

لێرەدا شاعیر پەنجە بۆ داستانی جەمشیدی جەمی پیشدادی درێژ دەکا، وەکو ئەو چۆن جەمشید بە کچی گەورەنگی شای زابلستان شاد بوو، بابا ناووسیش بە زیوا سەرشتی (زیبا سەرشتی) شاد بوو.

## قۆناغی دووەمی شیعری ئایینی یارسان

ئەم قۆناغە بەردەوامی قۆناغی یەکەمە کە شاعیری گەورە شا خۆشێن بوو. لەم دەورەدا ئەدەبی ئایینی لە پێشوو زیاتر پەرەی سەند، نەوەکو تەنیا لە ڕووی قەوارەوە لە قۆناغی یەکەم زیاتر بوو، بەڵکو لە ڕووی ناوەڕۆکیشەوە نموونەی هونەرێکی بەرز بوو. سەر دەستەی شاعیرانی ئەم دەورە سوڵتان سەهاک بوو، قۆناغەکە هەر لەویشەوە دەست پێ دەکا، لە سەدەی یازدەمەوە تا سەدەی هەڤدەم.

### سوڵتان سەهاک (ئیسحاق) ١٢٧٢م - ١٣٨٨م

سوڵتان سەهاک (ئیسحاق) کوڕی شێخ عیسای کوڕی بابا عەلیی هەمەدانییە، لە نیوەی دووەمی سەدەی سێزدەم (٦٧١ھ/ ١٢٧٢م) لە گوندی بەرزنجە لە دایک بووە. دایکی خاتوون دایراک ڕەمزباری کچی حوسێن بەگی جافە.

سوڵتان سەهاک تازەکەرەوەی ئایینی یارسانە، ئەو ئایینەی بەپێی سەرچاوەکانی خۆیان «دەوری ئیسلامی» لە بالوولی داناوە دەست پێ دەکا، بە لای ئەوانەوە بالوول ئایینەکەی هێنایە کوردستان و لە ناوچەکانی کرماشان و خانەقین بڵاوی کردەوە. ئایینەکە لە سەدەی سێزدەمی مەسیحی پەراگەندە و نابووت بوو بوو، سوڵتان سەهاک ڕێکی

خستەوە، یارسانەکان بە چووارەمی ئەدگاری کردگاری دادەنێن لە سەر ڕووی زەوی.

سوڵتان سەهاک سەردەمی لاویەتی بە خوێندن بردۆتە سەر، بە تایبەتی لە زانستی‌ی دانایی و فەلسەفە و ئەدەبیات سەرکەوتوو بووە. بە هۆی ئەوەی سوڵتان سەهاک برای زۆر بووە، لە پاش مردنی باوکی ناخۆشی کەوتۆتە نێوانیانەوە، بۆیە بەرزنجەی بەجێ هێشتووە و ڕووی کردۆتە دێی شێخانی هەورامان لە سەرووی زێی سیروان، لە پاشانا لە گوندی پردیوەری نزیک شێخان لای ڕۆژهەڵاتی سیروان نیشتۆتەوە. ئینجا دەستی کردووە بە بڵاو کردنەوەی بیر و باوەڕی یارسان لە ناوچەکانی هەورامان و شارەزوور و جوانرۆ و شاخی داڵەهۆ و هەموو ئەو ناوچانەی دیالێکتی گۆرانی‌ی زمانی کوردی‌یان تێدا باوە.

سوڵتان سەهاک بۆ ڕێکخستنی بیر و باوەڕی یارسان لە ڕووی پراکتیکی‌یەوە حەوت خانەوادەی دروست کرد، هەر خانەدانەی بریتی‌یە لە ڕێکخراوێک، پێوەندی‌ی نێوانیان ئامانجەکانی ئایینی یارسان دێنێتە دی، خانەوادەکان ئەمانەن: شا ئیبراهیمی، یادگاری، خامۆشی، عالی قەڵەندەری ، میرە سووری، مستەفایی، حاجی باوەیسی. لە سەدەکانی (١٧ تا ١٩م) چووار خانەوادەی تر بەناوی: زەنووری، ئاتەش بەگی، شا هەیاسی، بابا حەیدەری پەیدا بوون.

سوڵتان سەهاک دەوری دیاری هەبوو لە چاک کردنی باری ئایینی یارسان، بۆ ئەم مەبەسە گەلێ کەموکووڕیی چاک کردەوە و شتی تازەشی خستە ناو ئایینەوە وەکو بایەخ دان بە «نیازخانە» و «جەمخانە». لەساڵی ١٣١٦م ڕێکخراوەکانی سوڵتان سەهاک لە پۆپەی جموجۆڵی دا بوون.

پیری گەورەی یارسانان لە سەد ساڵ زیاتر ژیاوە، هەر لە مەڵبەندی خۆی، لە پردیوەر لە ساڵی ٧٩١ھ/ ١٣٨٨م کۆچی دوایی کردووە و لەوێش نێژراوە.

زۆربەی بەرهەمە ئەدەبی‌یەکانی سوڵتان سەهاک چوونەتە ناو نامەی «سەرەنجام». هەندێکیشی کەوتوونەتە ناو تۆمار کراوەکانی تری ئایینی یارسان. یەکێ لە شیعرە هەرە گرنگەکانی «بێ گاوان گاوێ» سروودی چووارەمە لە کتێبی سەرەنجام.

بێ گاوان گاوێ، بێ گاوان گاوێ
گاوی بێ گاوان، بێ گاوان گاوێ
تا سەر نەسپارن، کەردە وە لاوێ
تا هەق نەشناسن، دوور نەگەشت باوێ
هەر سەرێ نە لەوح، وە حزووری جەم

نه سوجوود وه دەست، خەلیفە و خادەم
بێ شک ئەو سەرە، وە تۆمار نی‌یەن
نە ڕۆژی حەساو، وە شمار نی‌یەن
تۆمار پیر مووسا ، قەڵەم باقی‌یەن
جەمی چلانە، بنیام ساقی‌یەن
ڕەهبەر داوودەن، دەسی دامانگیر
تەکبیر چی باتین، بنیامین پیر
جۆز نە گژنیژە، نە عەرەق بنیام
ئاوەردەن وەجەم، پەری سەرەنجام
جەم نە دڵی جۆز، جۆ نە دڵی جەم
نیازم زات بی، چوارکەس دەرهەم
شەرت دام وە بنیام، هەق دام وەرەزبار
دەفتەر پیر مووسا ، ناز وە یادگار
ڕەهبەر داوودەن، چل تەنش وە شۆن
پەرچینش ئەڵماس، هەق وە دۆنا دۆن
نەواو ئاوازی، ببۆ وە هامتام
بنیام مەغزی جەم، جەم مەغزی بنیام
زیکر کەران نەجەم غولامان تەمام
نەڕای مەغزی دوڕ، مەولای خاس و عام
نەوام عەتری جۆز، جۆز عەتری نەوام
غولامان گردەن، قەوا وە قەوام
جۆزم شکەنا ، سەریچم سپەرد
پۆسم پاچنا ، مەغزم بەر ئاوەرد

واتاکەی:

(گای بێ گاوان
ئەگەر گا گاوانی نەبێ سەرگەردان دەبێ
ئەگەر سەر نەسپێرێ پەڕاگەندە دەبێ
تا هەق نەناسی، لە ڕێی ڕاست دوور دەبێ
هەر سەرێک لە تۆماری جەم نەبێ
سەر دانەنوێنێ بۆ خەلیفە و خادیم

بێ گومان ئەو سەرە لە دەفتەردا نەنووسراوە
لە ڕۆژی قیامەت دا هیچی بۆ ناکرێ
دەفتەر و تۆمار و قەڵەمی پیر مووسا هەرماوە
جەم لایەتی و بنیامین مەی گێڕە
داوود ڕێبەرە بۆ یاران نیاز دەکا
پیر بنیامین ئاگاداری نهێنیی ناوەوەیە
گوێز لە گژنیژی ئارەقەی بنیامینە
لە دوایی دا هەموو دەگەڕێتەوە لای جەم
جام لە ناو دڵی گوێز دایە، گوێز لە ناو دڵی جام دایە
مەبەسم لە جام زاتی چووار کەسەکەیە (نەزرەکە بەوانەوە بەستراوە)
بەڵێن بە بنیامین دەدەم، هەقیش بە ڕەمز بار دەدەم
دەفتەریش دەدەمە پیر مووسا و نازیش دەدەمە یادگار
ڕابەر داوودە لەگەڵ چل کەسەکەی لە دوایەوەن
پەرژینی ئەڵماسە، هەق لەگەڵ دۆنا دۆنایە
دەنگ و ئاوازی (گوێز) بوو بووە هاوتام
بنیامین مێشکی جەمە و جەمیش مێشکی بنیامینە
غولامان هەموویان لە کۆبوونەوەدا زیکر دەکەن
لە ناو ناووکی دوڕ مەولای خاس و عام کۆتایی دێ
ژیانم عەتری گوێزە، گوێزیش عەتری ژیانمە
غولامان دەست بە داوێنم دەگرن
تا گوێز بشکێنم و سەرم بسپێرم
قەپێلکم داماڵی و ناووکم دەرهێنا)

سروودی سێیەمی سەرەنجام بریتییە لە گفتوگۆی نێوان سوڵتان سەهاک و پیر میکاییل.

پیـــــرە مـــــیکاییل، دەودانی مــــاوا
چەنی شــێخ ســەهاک، کــەر پەیی دەعــوا
مــار کــەرد وە قــەمچی، سـوار بێ وەشــێر

شــێــرش مــێــرانا وه خــوازی دەلێــر
ســـوار بی وەشـــێــــر، ڕاناوه هەی هەی
تـارەس وه لەب ســــیـــــروانـی بێ پەی
ئاوازش کــەرد هەی شــێــخی ســەهاک
قــەبوولم نی‌یەن، تۆ نەی مــاوا خــاک
قـــــەبـوولـم نـی‌یـەن، تـۆ نـه پـردیـوەر
بســـــازی یـانـه، بـنـمــــانـی هـونـەر
ئەو ڕۆژە یـار داویـد مــــه ســــازا دیـوار
شـــــاه وات وه داویـد ســــوار بۆ دیـوار
بچـــۆ وه راوه، بێ خـــۆف بێ ئەنـدیش
بزان مـــیـکـاییـل، ئامـــان پەرێ چێش
ســـــــــوار بـی دیـوار، داویـد دانـا
وه جـــۆش هەی هەی، دیـوار مــــەرانـا
مــیـکاییـل واتش، شـێـخ ســەهاک ئینه
ئەســـــپـش دیـوارا مـــــەنما نـۆ وینـه
وه قـــەوڵی قـــەدیم تا حـــال کێ دی‌یەن
سـەهاک سـیـحـر بازەن، جـا دووگـەری‌یەن
ئاوازش کــەرد، ئەهای شـــێخ ســـەهاک
وه ئەســـپت واچه، پەریم سـوخـــەن پاک
داوید وات غـولامی، سـوڵتـان سـەهاکم
غـــولامی یەک ڕەنگ، شـــاهی بێ باکم
مـــــیـکـایـیـل واتـش، بـەچـو بـاچه پـێـش
وێش مــەیۆ ئەحـــوال، به پرسم جـــەنیش
وه ســـــرری قــــودرەت، وه زۆری خـــــاوه
قـــــەدەم ڕەنجنا، شــــــاه هـات وه راوه
ئەو ڕۆژ کـه سـیـروان، چەمش کەفت وه شا
شـەوقی شـا مـەولام، سـیـروان خـرۆشـا
شا وات مـیکاییل، سیـروان هات وه جۆش
باچه وه سـیــروان، دەنگەش بۆ خـامـۆش
مــیـکاییـل واتش، نه مــیـــر و وه دەس

سـیـروان فـەقـارەش، هانە جـۆش خـەس
شـا سـولّتـان سـەهاک، وە ئاوازی بەرز
خوڕاوە سیـروان، سیـروان نیـشت وە مـەرز
شـاوە قـالیـچـە، نیـشت وە ڕووی سیـروان
چەنی مـیکاییل، وە بێـدە بەسـتـان
مـیکاییـل واتش، شـای ڕۆژی وە دەس
نەوسم وە رشیـیا، فـەرد فـەریاد ڕەسی
شا سولّتـان سەهاک، دەسش کەرد وە بەحر
مـاهی بەرشـتـە، بەر ئاوەرد وە بەر
واتش مـیکاییـل، گـۆشـتش کـەرە نۆش
سو خوانش مەشکەن، غـەمـدەری پڕ جۆش
یەک مـاهی ژ بەحـر، سـەر ئاوەرد ئەو دەر
سـەلام سـەد سـەلام، ئەمـیـری سـەفـدەر
وە جـوفت سـاز نای، دونیـا بەحـر و بەڕ
کـۆ وە جـوفـتی من، دەرکـەندی خـەیبـەر
جـیـفـتم داینە تۆر، وە پیـر دەودانی
یا شـاه جـیـفـتم دەر، شـاهی مـەردانی
شـا سـوقـان مـاهی، گـرد وە بانی دەست
مـاهی زیندە کـەرد، پادشـای ئەلەست
وە سـرری قـودرەت، نووری ئیـلاهی
مـاهی زیندە کـەرد، پەی جـیـفـتی مـاهی
ئەو ڕۆژ مـیـکاییـل، ئاورد ئەی وەلّلا
وات هـەقـم تـوبـی، ئـەلّـلا ئـەی وەلّـلا

واتاکەی:

(پیر میکاییل لە گوندی دەودان کە مەڵبەندیەتی)
لەگەڵ شێخ سەهاک گفتوگۆیان کرد
ماری کردە قامچیی دەستی و سواری پشتی شێر بوو
ئازایانە شێری بانگ کرد
سواری شێر بوو بە هەی هەی

تا گەیشتە قەراغی زێی سیروان
بانگی کرد هۆ شێخ سەهاک
ڕازی نیم لێرە بمێنیتەوە
قوبوولم نی‌یە تۆ لە پردیوەر
خانوو دروست بکەی و هونەر بنوێنی
ئەو ڕۆژە داوود دیواری دروست کرد
شا (سوڵتان سەهاک) بە داوودی ووت سواری دیوار بە
بچۆ بە ڕێوە بێ ترس و لەرز
بزانە میکاییل بۆچ هاتووە
داوودی دانا سواری دیوار بوو
بە زۆری هەی هەی دیوار کەوتە غار
میکاییل ووتی شێخ سەهاک ئەمە
ئەسپی دیوارە و موعجیزە دەنوێنێ
لە کۆنی کۆنەوە تا ئەمڕۆ کێ دیویەتی
کە سەهاک سیحر باز و جادووگەر بێ
دەنگی بەرز کردەوە و ووتی: ئەی شێخ سەهاک
بە ئەسپت بڵێ قسەی باشم بۆ بکا
داوود ووتی: غولام (یاری)ی سوڵتان سەهاکم
غولامی یەک ڕەنگ شاهی بێ باکم
میکاییل ووتی: بڕۆ پێی بڵێ
خۆی بێ هەواڵم لێ بپرسێ
بە سرری قودرەت و هێزی کردگار
سوڵتان پێی بەرز کردەوە و گەیشتە ئەوێ
ئەو ڕۆژە کە سیروان چاوی بەشا کەوت
لە خۆشی هاتنی خرۆشا و دەستی کرد بە گرم و هۆڕ
شا ووتی: میکاییل سیروان هاتۆتە جۆش

پێی بڵێ بابێ دەنگ بێ
میکاییل ووتی: ناوێرم
سیروان قین و قاری هاتۆتە جۆش
شا سوڵتان سەهاک بە دەنگی بەرز
لە سیروانی خوڕی، سیروان ترس و لەرزی لێ نیشت
شا بە سوواری قالیچە (مافوور) نیشتە سەر ڕووی سیروان
لەگەڵ میکاییل مامەلە و سەواد دەکەن
میکاییل ووتی: شا رزق و رۆزی بە دەستە
خەریکە گیانم دەردەچێ، بگەرە هانام
شا سوڵتان دەستی درێژ کرد بۆ زەریا
ماسیی بەرشتەی هێنایە دەرەوە
ووتی: میکاییل گۆشتی بخۆ
ئێسقانی مەشکێنە و تەواو ئاگاداری بە
ماسییێک لە زەریاکەدا سەری هێنایە دەرەوە
ووتی: سڵاو سەد سڵاو ئەی ئەمیری سەفدەر
هەر دوو دونیاو ووشکایی و زەریا بە دەست تۆبە
کوانێ جووتی من ئەی سەرداری خەیبەر
هاوسەری تۆم داوەتە پیری دەودانی
ئەی شا هاوسەرم بدە بە شاهی مەرد
شا ئێسقانەکانی ماسی خستە سەر دەستی
پاشای ئەلەست ماسی زیندوو کردەوە
بە سرری قودرەت و نووری خودایی
ماسیی زیندوو کردەوە بۆ جووتێ ماسییەکە
ئەو رۆژە میکاییل ناوی خودای هێنا
ووتی: هەقم تۆی پاشا، وەڵڵا تۆ ئەڵڵای...).
سوڵتان سەهاک دیارترین و بە ناوبانگترین کەسانێکی یارسانەکان بوو لە دەورەی

نوێیان، واتە دەورەی دوای ئیسلام، وەکو ئاشکرایە یەکەمین وێنەی کردگار لە (عەلی) دا بوو، بەم جۆرە لە کۆمەڵەی کوردەواری دا لە پاش عەلی سوڵتان سەهاک بە ناوبانگترین رەمزی ئەم ئایینەیە.

## بیر و باوەڕی یارسان لە شیعری سوڵتان سەهاک دا

بەرهەم و نوسین و کردەوەکانی سوڵتان سەهاک دەستووری بنچینەیی ئایینی یارسانە، لەلاییێک پێوەندیی کۆمەڵایەتی لە نێوان یارسانەکان ڕێک دەخا، لەلاییێکی ترەوە ڕێ و شوێنی بیر و باوەڕی ئایینی‌یان بۆ جێ بەجێ دەکا.

سوڵتان خۆی بە مەتریال (زات = ذات) و گیان (پرتەو) دادەنێ، لەشی حەوت کەسەکە و پرتەوی حەوتەوانە ئەوانیش دەگەڕێنەوە سەر جەوهەری بنچینەیی کە «یەک»ە:

وەسڵ و پێوەنا
ها زات و نوورم، وەسڵ و پێوەنا
نەویر ما هەفتەوان، زاتم هەفت تەنا
زات و نوور جەیەک، چەشمە وێم هەنا

واتاکەی:

(پێوەندی و بە یەکتری گەیشتن
من زات و نوورم هەر دووکیان پێکەوە
نوور حەفتەوانەیە زات حەوت تەنە
زات و نوور لە یەک سەرچاوە هەڵقولاون)

لە شیعرێکی تری دا سوڵتان سەهاک لە بیر و باوەڕی دۆنا دۆن دەدوێ، لەلای ئەو هێزی کردگار یەکێکە، بەڵام جێی خۆی لە لەشی جیاواز دەگرێ و لە سەردەمی ئادەمەوە تائێستا لە گەلێ لەش دا خۆی نوواندووە:

تاسیکە نەبۆ، جۆز نی‌یەن قبوول
هەر لەباوە ئایەم، تا ئاخر ڕەسوول
دۆن وە دۆن ئامایمێ، ئوسوول وە ئوسوول
راهـ یاری هەقـقەن. پەی یاران قبوول

واتاکەی:

(ئەگەر ناووک نەبێ گوێز بوونی نی‌یە

هەر لە باوکە ئادەمەوە تا دوا پێغەمبەر
پشت بەپشت هاتین بە ڕێکوپێکی
ڕێی هەق پشتیوانمانە، لەلایەن بادانەوە قوبووڵ کراوە)

لە شیعرێکی تری دا ئەوە دەگێڕێتەوە کە گیانی عەلی چۆتە لەشییەوە:

غـــــولامـــــان وایە، غـــــولامـــــان وایە
پـەی ڕۆژی بـاقـی، نـیـــــــــانمـان وایـە
ڕەجـــــاو رەزا و ڕەمـــــز، نەشــــۆ وەزایە
ئاســـــمـــــانا مـــورغـــا، زەمـــینا هایە
سـتـارەی مـەزیـۆ، نەجـامـەی خـورشـیـد
پیـشـانی حـەیدەر، جـای بیم وە ئومـیـد
هەر دوو جــفت وە هەم، وێنەی مــادەونەر
مـــادەش بنیـــامین، نەرشـــەن قـــەنبـــەر
دەســـتـــووری ئامـــان، پەری گـــردیشـــان
شـوکر و فـیکر و زیکر، وە خواجای وێشـان

واتاکەی:

(مەنسووبەکانمان وان
تا ڕۆژی قیامەت نیازمان وایە
ڕەجا و ڕەزامەندی و ڕەمز بە فێڕۆ نەچێ
لە ئاسمانا ڕۆیشتن لە ئەرزا نیشتنەوە
ئەستێرەی درەوشاوە لە بەرگی ڕۆژ دایە
جیلوەی حەیدەر بوو بەجێی ئومێدم
هەر دووکیان بوون بە یەک وەکو نێر و مێ
مێ بنیامینە نێریش قەنبەر
دەستوورێک هاتووە بۆ هەموویان
شوکر و فیکر و زیکر بۆ مورشیدیان)

لەم شیعرەشی دا، سوڵتان سەهاک باس لە چل تەن، واتە چل فریشتە و داوود دەکا:

نـــــــــــــاز ڕەوای یـــــــــــــاران

حـــوســـێنی شـــەهیـــد، ناز ڕەوای یاران
توحـفـەی عـەجـووز ڕەنگ، تەبرێز شـاران
قـــــــــەریـنـت نـی‌یـا، هـەوار هـەواران
داوود ســــــەر قــــەتار، چل تـەن چلانـە
شـەفـەق کـێش سـوبح کـە بوو نیـشـانـە
ســــوبح و ڕۆ ڕەنگن، جـــــەو ڕای دێوانە
حـــەواڵەن بارۆ، پیـــــروەی مـــەکـــانـە

واتاکەی:

(ناز کردن شایستەی یارانە
حوسێنی شەهید، ناز کردن شایستەی یارانە
نەختینەی زەوی شاری تەورێزە
وێنەی تۆ نی‌یە لە هیچ جێ و مەکانێک
داوود پێشڕەوە، چل کەسەکە لە ناو ئەون
شەفەقی بەیانی‌یان بۆتە نیشانەیان
بەیانی و ڕۆژهەڵات ڕەنگی دێوانە دەنوێنن
باپیری گەورە گوزەر دەکا بۆ ئەو شوێنە)

سوڵتان سەهاک لە شێعرێکی تریدا، باس لە حەوتەوانە دەکا، لە راستی‌دا حەوتەوانە بریتی‌یە لە حەوت یارانی سوڵتان کە یاریدەدەری بوون بۆ بەڕێوە بردنی لایەنی گیانی‌ی ئایینی یارسان، حەوتەوانە ئەمانە بوون:

سەید محەمەدی گەورە سوارە، سەید ئەبولوەفا، سەید باوەیسی، میر سوور، سەید مستەفا، شێخ شەهابەدین، سەید حەبیب شا.

ئـــا دەرگـــــــــــــــــا و پـــەردە
غـــولامـــان نیگـایکەر، ئا دەرگـــا و پەردە
بـەیـان بـو وێـنـان، وێـڵ کـــــــــەران هـەردە
جـە ســـری قـودرەت، جـە ڕەنگیم کـەردە
بـیـــــــای ســـــاجی نـار ئـیگـام ئـاوەردە
غـــولامـــان وێڵ نەوان، ئی ســەراو پەردە
ســــاز نام هەفت نوور، جـــام بێ گـــەردە

جـه ئەزەل مـێـردان، سـەر پـێش سـپـەردە
واتاکەی:
(ئەم دەرگا و پەردەیە
غولامان سەرنجی ئەم دەرگا و پەردەیە بدەن
با وێنەکان دیار بن لەوانەی لە شاخ گومڕا بوون
لە نهێنی قودرەت دا ڕەنگم دیارە
من ساجی ئاگرم بۆ ئێرە هێناوە
با غولامان لەم سەراو پەردەیە وێڵ نەبن
دروست کردنی حەوت نوور وەک جامێکی بێ گەردە
هەر لە ئەزەلەوە بڕیاری لە سەر دراوە)

جەمخانە و نیازخانە وەکو بارەگا و پەرستگای ئایینی یارسان دەورێکی باڵای هەیە، بە تایبەتی جێی هێنانەدی هەموو دەستوورە پراکتیکی‌یەکانی ئەم ئایینەیە، سوڵتان سەهاک لە ژیانی‌دا بایەخێکی زۆری بە کۆبوونەوە ئایینی‌یەکان دەدا، لەم لایەنەوە لە شیعرێکی دا دەڵێ:

ئـیـــبــــراهیـم یـەکـــتـــا
جـە هەفت و هەفـتـەن، تۆ مـەنی یەکـتـا
یەکـتـا کـەس نیـەن، وە وێـمـەن ئاگـا
ئـیـنـە ئـارمـــــای، ئـەزەلـی بـی‌یـا
دەست جـــەم جـــە من، قـــودرەتەش بی‌یا
ڕەنجـــە دڵ نـەوی، وێم کـــەردم ئـێـگـا
جـــەم قـــیـــبلەگـــا، یارانم بـی‌یان
خـاسـە غـولامـان، نە جـوملە ئەشـیـان
هەر کـەس نە جـەم دا، نە پیـر و ئەرکـان
وە ڕاست بگـێـرۆ، دامـــان ســـوڵـتـــان
ئانە حـەقـیـقـەت، مـێـر، دیاری‌یەن
جـــە ڕۆژی حـیـســاو، ئای وە دیاری‌یەن
واتاکەی:
(ئیبراهیمی تاک و تەنیا

لە حەوت و حەوتەکان تۆ بە یەکتایی ماوی
کەس یەکتا نی‌یە خۆم ئاگادارم
ئەمە دەستوورێکە ئەزەلی‌یە
دەستی جەمخانە بۆ من لە قودرەتی ئەوەوە بوو
تۆ دڵت نەڕەنجێ من خۆم ئەم بڕیارەم داوە
جەمخانە قیبلەیە، یاران وەرن
لە ناو هەموویان غولامان (یارەکان) بێن
هەموو کەسێک لە جەمخانە دا لە پیر و ماقووڵان
بە ڕاستی دامانی سوڵتان بگرن
ئەمەیە حەقیقەت، پیاوی گەورە دیارە
لە ڕۆژی حیساب دا باشتر دیارە)

جەمخانە لە ڕۆژگارانی ڕێبەری یارسانەکان وەک دەسگاییێک و شوێنی ڕێکخراوێک دەوری باڵای هەبوو لە هێنانەدی شەعائیریان لە دوا ڕۆژ دا ئەو دەستوور و ڕەووشتانەی لەوێ دروست بوون لە لایەن یارسانەکانەوە پێڕەوی دەکران.

ئەفسانەی دەنکە هەنار

پیر میکاییلی دەودانی ئامۆزای سوڵتان سەهاک بووە، پاش ئەوەی کە دەبێ بە یەکێک لە یارە هەرە نزیکەکانی سوڵتان «سارێ = شارێ»ی کچی پێشکێش دەکا و دەبێ بە کارەکەری. لەو ماوەیەدا سوڵتان دار دەستی شا ئیبراهیم - کە هێشتا منداڵ دەبێ دەداتە پیر ئیسماعیلی گوڵان بۆ ئەوەی لە باغی نیهال دا شەتلی بکا. فەرمانی سوڵتان جێ بەجێ دەکرێ، لە پاشانا دار شین دەبێ و گوڵ دەدا و هەنار دەگرێ، هەنارێک بۆ سوڵتان دێنن، سوڵتان فەرمان دەردەکا بۆ جەم، هەموو یاران کۆ دەبنەوە، ئەمە یەکەمین جەم بووە لە پردیوەر و لە دووایی دا ناویان نا «نیاز».

سوڵتان داوا لە پیر بنیامین دەکا کە دوعای نیاز بخوێنێتەوە، بەڵام لە حوزووری سوڵتان ئەم کارەی بۆ هەڵنەسووڕا. سوڵتان ڕووی کردە داوود و پیر مووسا، ئەوانیش بۆیان نەکرا، ئینجا داوای لە چەند یارێکی تر کرد، بەڵام بێ سوود بوو کەسیان بۆی نەکرا.

ئیتر سوڵتان فەرمانی دا سەید محەمەدی گەورە سوارەی کوڕی داوای جێ بەجێ بکا،

ئەو دەستی کرد بە خوێندنەوەی دوعای نیاز:

وە ئیـــشـــارەی شـــا ، وە فـــەرمـــوودەی یـار
وە شـــەرت بنیـــامین، پیـــری ســـەر قـــەتار
وە ڕازی داوود، راهنمـــــای کـــــوفـــــفـــــار
وە قـــەڵەم زەررین، مـــووســـای دەفـــتـــەردار
وە قـەدری حـیـشـمـەت، مـسـتـەفـای زۆردار
وە خـــدمـــەت کـــەردە، پاک پیـــری ڕەزبار
وە نازی جـــــەمـــــعی، ئەولیـــــای نازار
وە نازی جەمعی، ئەولیـای عـەتـتـار (عطار نـیـــــــــــشـــــــــــابـووری)
هەر جـە ڕۆژ ئەزەل تا یەومـولشـمـــار (یوم الـشـــــمــــــار - یـوم الحـــــســــــاب)
کـــەردەیی یارســـان، ســـەف بۆ نە تۆمـــار

واتاکەی:

(بە ئیشارەی شا بە فەرموودەی یار
بە شەرتی بنیامین پیری سەر قافلە
بە ڕەزامەندی داوود ڕێ پیشاندەری کافران
بە قەڵەمی زێڕینی مووسای دەفتەردار
بە توانای حیشمەتی مستەفای بە توانا
بە خزمەت کردنی پیری ڕەزبار
بە نازی سەرجەمی ئەولیا نازدارەکان
بە هەموو نازەکانی عەتتاری ئەولیا (عەتتار نیشابووری)
هەر لە ڕۆژی ئەزەلەوە تا ڕۆژی حیساو
کردەوەی یارسانەکان دێنە تۆمار کردن)

پاش خوێندنەوەی دوعـا ، هەنار دەدەنە دەست پێش خزمەتی داوود بۆ ئەوەی بەشی بکا بە سەر ئامادە بووانی جەم، ئەویش بەشی دەکا. بە ڕێکەوت دەنکێ هەنار دەکەوێتە درزی

فەرشەکانەوە. لە کاتێک دا کە «سارێ = شارێ)دێ و جەمخانە گسک دەداو پاکی دەکاتەوە، دەنکێ هەنار دەدۆزێتەوە، هەڵی دەگرێ و دەیخاتە دەمیەوە. پاش ماوەیێک زگی پڕ دەبێ، ئینجا کوڕێکی لە دەمەوە دەبێ، موعجیزەیێکی تری کردگار دەکەوێتە ناوەوە.

سوڵتان فەرمان بۆ داوود دەر دەکا کە منداڵەکە سێ شەو و سێ ڕۆژ بخاتە تەنوورەوە و سەری بگرێ، ئەویش فەرمانی سوڵتان دێنێتە دی، پاش سێ ڕۆژەکە، سوڵتان دێتە لای تەنوورەوە و سەری هەڵدەداتەوە، منداڵ هەڵدەستێتە سەر پێو سڵاو لە سوڵتان دەکا:

یادگـــاری یار، ئەوســـا بیش مـــەنزوور
پەرێ نیـــشـــانە، نیـــاش نە تەنوور
نیـــاش نە تەنوور، نە شـــەرارەی نار
فـــەرمـــا وە داوود، ســـەر تەنوور بنیـــار
سێ ڕۆژ ســـەبرەش کـــەرد، داوودی ڕەهبـــەر
نیـــازش وەرکـــەرد، ئامـــا وە نەزەر
فـــەرمـــا وە داوود، نە عـــەینم باوەر
دیش ئامـــا وە ســـەر، پادشـــای پردیوەر
یادگـــار جـــە تەنوور، وورێزا ئەو پا
وە لەفـــزی شـــیـــرین، ســـەلام دا وەشـــا
بەرگی خـــود ڕەنگی، کـــەرد وە خـــەلاتەش
نەمـــام کـــوردســـتـــان، کـــەرد وە بەراتەش

واتاکەی:

(یادگاری یار لەو کاتەی کە ئیرادەی کرد
بۆ موعجیزە نواندن خستی‌یە ناو تەنوورەوە
خستیە ناو تەنووری پڕ لە بڵێسەی ئاگر
بە داوودی ووت سەری تەنوورەکە داخە
سێ ڕۆژ داوودی پێشەوا سەبری کرد
ئەو نیازەی کە کردی هاتە دی
بە داوودی ووت بیهێنە بەرچاووم
پاشای پردیوەر هاتە سەری

یادگار لە ناو تەنوور هەڵسایە سەر پێ
بە قسەی شیرین سڵاوی لە شا کرد
بەرگی جوانی کرد بە خەڵاتی
هەموو کوردستانیشی کرد بە بەرات و پێی بەخشی)

ئەم ڕووداوە ئەفسانەیی‌یەی کە لە شیعری ئایینی یارسان ڕەنگی داوەتەوە، بە سەرهاتی پەیدا بوونی بابا یادگارمان بۆ دەگێڕێتەوە کە لە دەنکە هەناری پیرۆز لە کیژێک لە دەمەوە لە دایک بووە، دیارە بێ باوکیشە، بۆ ئەوەی ببێتە کردگار و لە پێستی ئادەمزاد دا خۆی بنوێنێ.

## عابیدینی جاف ۱۳۲۰م - ۱۳۹٤م

عابیدین کوڕی نوورولڵای جافە، بەپێی کتێبی سەرەنجام لەساڵی ۷۲۰ھ/۱۳۲۰م لە شارەزوور لە دایک بووە، خوێندنی بەرایی لە لای مەلا ئەلیاسی شارەزووری بووە، ئینجا زانستی‌یەکانی کەلام و بەلاغەتی لای مەلا غەفووری شارەزووری خوێندووە، پێوەندیی لەگەڵ خوێندەواران و پێرەوانی سۆفیزم بەهێز بووە. لە دوواییی دا گەیشتۆتە سوڵتان سەهاک و بووە بە یەکێک لە یاران و پێرەوانی، لە دووا ساڵانی سەدەی چواردەم ۷۹۷ھ/ ۱۳۹٤م کۆچی دوواییی کردووە.

عابیدین یەکێکە لە شاعیرە ناودارەکانی یارسان، زمانی شیعری تێکەڵاوە و زیاتر دەشکێتە سەر دیالێکتی کرمانجی خوارووو، جگە لەوە بە هۆی ئەوەوە کە شیعرەکانی بە هەوای دیالێکیتی گۆرانی ووتراوون هەوڵی داوە لە ئەدەبی میللی و زمانی ساکاری ناو خەڵک نزیک بن، ئەوەی زیاتریش بووەتە هۆی ئەم ساکاری‌یە ئەوەیە کە عابیدین دەنگ خۆش بووە و لە تەنبوور ژەنەکانی سوڵتان سەهاک بووە، وەکو دەردەکەوێ لەو سەردەمەدا کۆرسی چڕینی سروودی ئایینی یارسان بایەخدار و پڕ زەوق بووە. لە دێڕە شیعرێک دا ناوی هەندێ دەنگ خۆش و تەنبوور ژەنەکانی ڕۆژگاری کۆن و دەوروبەری سوڵتان سەهاک بەم جۆرە هاتووە:

نەکیسا، ئەحمەد، باربەد، عابیدین
ها فەرهاد، داوود، شاپوور، پیر مووسین

نەکیسا و باربەد لە دەنگ خۆش و مۆسیقا ژەنەکانی سەردەمی خوسرەوی پەرویزی ساسانی بوون.

ئەوەی جێی سەرنج ڕاکیشانە ئەوەیە شیعرە لیریکی‌یەکانی عابیدینی جاف ئەوانەی دیالێکتی کرمانجی‌ی خووارووی‌یان تێ کەوتووە لە سەر کێشی هەشت سیلابی شیعری میللی (فۆلکلۆر) ڕێکخراوون، هەرچی شیعرەکانی تری دیالێکتی گۆرانی‌یە لە دەستووری کێشی شیعری گۆرانی دەرنەچوون کە دە سیلابی‌یە.

لە کتێبی «دەورەی عابیدین» دا بەشێ لە شیعرەکانی شاعیر کۆ کراوەتەوە.

لە شیعرێکی دا شاعیر بیر و هەستی دەر دەبڕێ بەرامبەر بە «مەعشووق»، زۆر بە شوێنی گەڕاوە تا دۆزیویەتی‌یەوە:

من عاشقی خاوەند کارم
عەشقی یارە وا بێ عارم
ئەمن گراو شاو چوار یارم
نوختەی خودا وا لە زارم
ئەز کە وێڵ بووم لە جێ و شارم
بەلەدمی کرد شای شاسوارم
بەزەربی دەست کەماندارم
بە فیدای یاری کردار دارم
کە منی خستە سەر ڕێی ڕاسی
هەتا بژیم بە بێ کەسی
من عابیدینی کاکەییم
ئاخر بە یاری خۆم گەییم

واتاکەی:

(من عاشقی خوداوەندم
لەبەر عەشقی یار وا سەربەست و بێ پەروام
من گیرۆدەی شا و چووار یارم (چووار مەلایەتەکەی هەموو کردگارێک)
خۆشەویستی‌ی خودا لە دڵ و دەروونم دایە
من کە دەر بەدەر و ئاوارەی ماڵ و مەڵبەند بووم
شای شاسوارم ڕێی پێ پیشان دام
بە تیر و کەوانی ئەو کوژراووم

بەڵام من بە فیدای ئەو یارە بەتوانایە دەبم
ئەوەی منی خستە سەر ڕێی ڕاستی
من تاقی تەنیام و کەسم نییە
من عابیدینی کاکەییم
لە ئەنجاما گەیشتمە یاری خۆم)

بە لای شاعیرەوە کردگار ڕێ پیشاندەر و دروست کەری هەموو شتێکە، بەختیار ئەو کەسەیە ڕێی ڕاست بدۆزێتەوە:

خـــــــــــــودا ئـــاوی دا بـــە تـــۆمم
ســــــــەوز بـوو گـــــــۆنـەڵ لـە نـاو هـۆمم
گـــــــوڵـی کـــــردە و بتـــــەی جـــــۆمم
گــــەییـــــە کــــشـــــتم بە هەفت یۆمم
هەر وەک حــــەنیف مــــیـــــۆ و مـــــۆمم
تـــــــووایـــــــەوە لـــــــە تــــــەک زۆمم
بـە دووی ڕاســــــــــتـی گــــــــەڕا دۆنم
تـا دەرکــــــەوێ جــــێگە و شـــــوێنم
دی کــــــــــــــــەس نـــیـــە بـکـــا لـــۆمم
هەڵـسێ و بـێـــــــــتــــــــە بـەر و بـۆمم
چـــــونــــکــــە پــــاک و ڕاســـــت و ڕۆنم
لــە بــۆ دوژمـــن بـــای ســــــــــــەبـۆنم
خــــــــودام ئـەوێ و وەک ئـەســــــتـــــــۆنم
لـە بـۆ خـــــــــەڵـقـی ڕەهـنـمـــــــــــــۆم

واتاکەی:

(خودا تۆوی ئێمەی ئاو داوە
لە کاتی خۆی دا تۆ پشکووت و سەوز بوو
لە پاشا گوڵی کرد
بە حەوت ڕۆژ پشکووت
وەکو حەنیف (ئایینی پاکی ئیبراهیم) شەمێی
بوونم ڕۆشن بوو

ڕۆشنایی گەیشتە خانەوادەم
گیانم بە دووای ڕاستی دەگەڕا
بۆ ئەوەی ڕێ و شوێنم ئاشکرا بێ
بۆ ئەوەی کەس تانەم لێ نەگرێ و لۆمەم نەکا
وە نەتووانی خاک و وولاتم داگیر بکا
چونکە من پاک و ڕاست و سافم
بۆ دوژمنان بای گەرمم
من خودا دەپەرستم، بەهێز و تووانایە وەک ستوون
ڕێبەر و ڕێ پیشاندەری خەڵکم)

لەم شیعرەش دا بیر و باوەڕێکی تری یارسانەکان دەخاتە ڕوو، ئەویش لە بابەت ڕۆژی حەشرەوەیە، بەلای ئەوانەوە ڕۆژی حەشر لە دەشتی شارەزوور دەبێ، لەبەر ئەوەیە شارەزوور خاکی پیرۆزیانە، وەکو هەموو ئایینەکانی تر، کە هەر یەکە خاکێکی پیرۆزی خۆی هەیە و لە سەر ئەو باوەڕەیە کە ڕۆژی حەشر و نەشر و حیساب لە سەر ئەو خاکە دەبێ، عابیدینی جاف دەڵێ:

بە پێی ووتەی سەرەنجامم
لە شارەزوورە ئەنجامم
یارم لەوێ دەدا کامم
لە بادە پڕ دەکا جامم
سارێش دەکا ڕێش و زامم
تا بگەمە هەمی دامم
من عابیدینی هەورامم
دڵداری جووانی خواجامم

واتاکەی:
(وەکو لە سەرەنجام دا نووسراوە
ئەنجام (حەشر)م لە شارەزوورەوە
یارم لەوێ بەختیاریم دەداتێ
جامم پڕ لە شەراب دەکا

هەموو برین و ئێش و ئازارم سارێژ دەکا
تا بگەمە هەموو ئامانج و ئاواتم
من عابیدینی هەورامانیم
عەشقی جووانیی خواجامم)

لە شیعرێکی تری دا عابیدینی جاف ئەوە دەر دەبڕێ کە مەڵبەند و کەس و کاری خۆی بە جێ هێشتووە، پشتی کردۆتە ناوچەی سازان و ڕووی کردۆتە پردیوەر و بووە بە یار و پێڕەوی سوڵتان سەهاک:

داوودم تۆبی، دەلیل و پیرینم
ئەمجار سارێش بوو، زۆخ و برینم
ئەووەڵ و ئاخیر، شاهی دێرینم
هاتگم بۆ بەزم، جەمی سوڵتانی
کەمترینی کەم، بەو غولامانی
دەرچووم لە ناو، قەومی سازانی

واتاکەی:

(تۆ داوودی منی، ڕێبەر و پیرمی
هەموو دەردو برینم سارێژ بوو
سەرەتا و دووایی من شای دێرینە (سوڵتان سەهاک)
هاتوومەتە بەزم کۆبوونەوەی سوڵتان
من یەکێکم لە کەمترینی غولامانی
لە ناو قەوم خویشم لە سازان دەرچووم)

لە پاش ئەوەی عابیدینی جاف بە خزمەت سوڵتان سەهاک دەگا، ئەم گفتوگۆیە لە نێوانیان دا ڕوو دەدا.

عابیدین دەڵێ:

مەلا لەینە پێ خۆشە
بەزمی مەردان پێ خۆشە
بنیام ساقی لەو هۆشە
سەریان لە ژێری کەوشە

وەرن لــە نــوێــژ کـــــــــــــەن تــۆبــە
تـۆبـەی ئـیــــــــخــــــلاس یـەک نـۆبـە
ســـــــەهـاک خــــــودای دوو ســــــەوبـە

واتاکەی:

(مەلاکان ئەمەتان پێ خۆشە
بەزمی مەردانتان پێ خۆشە
ئەی ساقی لە هۆشم بەرن
ئەوان سەریان لە ژێر کەوشەکانیانە
وەرن تۆبە بکەن و نوێژ مەکەن
یەک جار بە ڕاست و ڕەوانی تۆبە بکەن
سەهاک خودای هەر دوو بەرەیە (دوو گێتی)

سوڵتان سەهاک لە وەراما دەڵێ:

هـا قـــــــــبـــــــــوول بـیـــــــــا
ڕەجـــای عـــەبدینتـــان ها قـــبـــوول بیـــا
دیـدەم وە ڕەحـــــــمـــــــــەت پـەنـاتـان دیـیـا
مـــورغـوم وە مـەیلتـان وە دەست ئەو ئەشیـا
تـا حــــەمـــــاڵ کـــــۆڵـش نـەوەرۆ وەجـــا
نمـەیـان پـەنـەش ئـوجــــــــــڕەت کـــــــــراها

واتاکەی:

(ئەوا من قوبووڵ بووم
لە سایەی تکای عابیدین من قوبووڵ بووم
خەتا بە ملتان لە دەست ئەو شتانەوە
تا حەماڵ کۆڵی نەگەیەنێتە شوێن خۆی
کرێی ڕەنج و ئەرکی نادرێتێ)

زمانی عابیدینی جاف لە شیعری میللییەوە نزیکە، نەک تەنیا لەم لایەنەوە، بەڵکو بە گشـتی شـێـوە زمـانی جـاف بەپێی نـاوچە جـوگرافییەکـان دەگـۆڕێ، بۆیە ئاشکرایە لەو ناوچانەی نزیک بە دیالێکتی کرمانجی خـوارووی زمـانی کـوردین، شـێـوە زمـانەکـەیان

تێکەڵاوە، ئەم دیاردەیە زیاتر لە ناوچەی شارەزوور و لای ڕۆژئاوای ڕووباری سیروان هەستی پێ دەکرێ.

## شا ئیبراهیم ئەیووت ۱۳۲٤م - ۱٤۰۷

شا ئیبراهیم کوڕی سەید محەمەدی گەورە سوارەی کوڕی سوڵتان سەهاکە، نازناوی ئایینی «ئەیووت»ە، «ڕۆچیار» و «مەلەک تەیار» یشیان پێ ووتووە. بە پێی کتێبی سەرەنجام لە ساڵی ۷۲۵ھ/ ۱۳۲٤م لە گوندی شێخان لە دایک بووە، دایکی خاتوون زەینەبی کچی میر خوسرەوی لوڕستانییە، لە سەردەمی منداڵی دا لە خانەقای سەرگەرم چاوی کردۆتەوە و پەروەردە بووە. لە ڕۆژگاری لاویەتی دا دەرسی ئایینی و عەشقی خودایی لە سوڵتان سەهاک وەرگرتووە.

شا ئیبراهیم لە سەر داوای سوڵتان سەهاک بۆ ڕێبەری کردنی ناوچەکانی خوارووی کوردستان دەکەوێتە ڕێ، سەری گەلێ ناوچە دەدا، لە ئەنجاما لە گوندی سەرانە کە ئێستا بابا یادگاری پێ دەڵێن، نیشتەجێ بووە، هەر لەوێش لە ساڵی ۸۱۰ھ/ ۱٤۰۷م کۆچی دووایی کردووە. یارانی شا ئیبراهیم لە ناوچەکانی خانەقین و مەندەلی و کەرکووک «کاکەیی»یان پێ دەڵێن، ئەمانە پێڕەوی بیر و باوەڕی یارسانەکانی سەردەمی شا ئیبراهیم دەکەن.

کۆمەڵە شیعری شا ئیبراهیم بە ناوی «دیوانی ئەیووت» لە بەر دەست دایە، زۆربەی شیعرەکانی بەشێوەی بەند (کۆپلە) ڕێک خراوون، هەر بەندی لە بابەت بە سەرهات و ڕووداوی پێغەمبەرێک، یا پیرێک، یا وەلییێک، یا سۆفییێک، یا گەورە و پیرۆزێکی ئایینییە. هەمووی لە دەوروبەری بیر و باوەڕی دۆنا دۆن دەسووڕێتەوە و بە شێوەی ئێپۆسی ئەفسانەیی دەری دەبڕێ.

لە بەندێکی دا بە سەرهاتی نووح و ڕووداوی تۆفان دەگێڕێتەوە، ئەوەی لە ئەفسانەی کۆن و ئێپۆسی گلگامیش و تەورات و قورئان باسی لێوە کراوە، بیر و باوەڕی دۆنا دۆنی یارسان بە ئاشکرا لەم بەندەدا دیارە، بەوەی شا ئیبراهیم لە سەر ئەو باوەڕەیە کە گیانی لە لەشی حامی کوڕی نووح و گیانی بابا یادگار لە لەشی سامی کوڕی نووح خۆیان نواندووە، گیانی حام لە شا ئیبراهیم و گیانی سام لە بابا یادگار دەرکەوتوون:

زولاڵی کۆی کام، زولاڵی کۆی کام
یادگاری من، زولاڵی کۆی کام

چاگـــا تۆفـــانێ، مــێـــردان ووست وه دام
نـووحی نەبی بی، کـــەشـــتی یو ئەرشـــام
تیـــــرەنداز بیـــمــــان، ئەز نامم بێ حـــام
کـــاکـــەم یادگـــار، نامش بیــا ســـام

واتاکەی:

(تۆ پێوەندیت بە کێوی پاکەوە هەیە
ئەی یادگاری من، تۆ پێوەندیت بە کێوی پاکەوە هەیە
لە کاتی تۆفان دا مەردانت لەگەڵ دا بوون
نووح پێغەمبەر و یارانی لە ناو کەشتی دا بوون
من ناووم حام بوو
یادگاری کاکەم ناوی سام بوو)

لە بەندێکی تریدا باس لە بەسەرهاتی سیاوەش دەکا، ئەمە کوڕی کەیکاووسە، منداڵێکی جوان بووە، کە تەمەنی گەیشتۆتە حەوت ساڵی کەیکاووس سیاوەشی بە ڕۆستەم سپاردووە بۆ ئەوەی فێری ڕاووشکاری بکا و مەشقی جەنگاوەری لە گەڵا بکا. سیاوەش لە تەک ڕۆستەم گەورە بوو، کە بە لاویەتی گەڕاوەتەوە ماڵی باوکی سوودابەی ژنی کەیکاووس دڵبەندی بووە و حەزی لێ کردووە، بەڵام سیاوەش هیچ مەیلێکی بۆ باوەژنی نەبووە، ئەمە بووە هۆی ئەوەی کە سوودابە بکەوێتە ڕق لێی. لەپاشانا بە فەرمانی کەیکاووسی باوکی سیاوەش چووە بۆ جەنگی تۆرانیان، بەڵام لەگەڵ ئەفراسیاب جەنگی نەکردووە، بەڵکو ئاشت بۆتەوە، کە کەیکاوویس ئەمەی بیستووە گلەیی لێ کردووە و تووڕە بووە، ئیتر سیاوەش لە ترسی باوکی لە وڵاتی تۆرانیان ماوەتەوە و لەگەڵ ئەفراسیابا ژیاوە، لە پاشانا فەرەنگێزی کچی ئەفراسیابی خواستووە. گرسیۆزی برای ئەفراسیاب ڕق و کینێکی زۆری بەرامبەر بە سیاوەش بووە، ئەمە پاڵی پێوە ناوە هەموو جۆرە پیلانێک ڕێک بخا بۆ ئەوەی لە پێش چاوی ئەفراسیاب ڕەش ببێ، لە پاشانا بە فەرمانی ئەفراسیاب سیاوەش دەکوژرێ، شا ئیبراهیم لەم لایەنەوە دەڵێ:

ئیـــبـــراهیم عـــەیان، ئیـــبـــراهیم عـــەیان
دەروونم جـــۆشـــا، مـــورغم کـــەرد عـــەیان
مـــــەزهەر تووس بیم، شـــــازادەی کـــــەیان
پـووری شـــــــا نـۆزەر، زەرریـن پۆش بـەیـان

کـــاکـــەم یادگـــار، دۆنی ســـیـــاوەحش
نە پشت کـــەرد وە ئێـــران، وە دەوانی دەو
کـوشــتــە بی وە تێغ، شـای ئەفـراسـیـەو
تاگـڕەی فـانۆس، خـەسـرەو بی ڕەوشـەن
وە زۆری ڕۆســـتـــەم، هەقی با بۆش سـەن
واتاکەی:
(ئەی ئیبراهیم لێت ئاشکرایە
دەروونم دەکوڵێ و مورغی دڵم ئاگاداری هەموو شتێکە
من لە تووس بووم و شازادەی کەیانیان بووم
کوڕی شا نەوزەری زرێ پۆش بووم
کاکەم یادگار نموونەی سیاوەش بوو
بە سوواری وولاغ ناو ئاگری بڕی
پشتی لە ئێران کرد
بە شیری ئەفراسیاب کوژرا
لە وەختێک دا گڕی فانۆسی خوسرەو رووناکی دا
بە زەبری تۆڵە، هەقی باوکی وەرگرتەوە)
لە سروودێکی تری دا شا ئیبراهیم جارێکی تریش پەنجە بۆ داستانی سیاوەش درێژ دەکا:
زولاڵ کـۆی ئەلبـووس، زولاڵ کـۆی ئەلبـووس
یادگـــــار من، زولاڵ کـــــۆی ئەلبـــــووس
کـاکـەم سیـاوەحش، هوونەش جۆشا جـووش
ئەز ســـەندم هەقـــەش، یورتم بیـــا تووش
ئەوســـا نە یەک بین، مـــێـــردانی ئالووس
شـــام نەعـــرە کـــێش بی، گـــورزدار کـــاووس
واتاکەی:
(ئەی زولالی کێوی ئەلبورز
یادگاری من، ئەی زولالی کێوی ئەلبورز
کاکەم سیاوەش خوێنی دەکوڵێ

من هەقیم وەرگرتووە و شاری تووس بوو بە نیشتمانم
لەو کاتەدا مەردان غەمگین بوون
شام نەعرەتەی دەکێشاو کاووس گورزی بە دەستەوە بوو)

لە بەندێکی تریدا بە سەرهاتی یووسف دەگێڕێتەوە، ئەم بەسەرهاتە پەندێکی قووڵی سایکۆلۆجیی ناوەوەی ئادەمزاد دەور دەکاتەوە: خۆشەویستی باوک بەرامبەر بە کوڕی، ڕق و کینی برا بەرامبەر بە برا، چونکە لای باوکیان خۆشەویستترە، دڵداریی نێوان یووسف و زولەیخا خێزانی عەزیزی میسر (پووتیڤار) گەیشتە پلەیێک کە شێوەیێکی سۆفیزم وەر بگرێ.

شاعیری یارسانی کورد شا ئیبراهیم لە بەندێکی حەوت نیوە دێر شیعری یەک قافیەیی بەم جۆرە تەماشای مەسەلەکە دەکا:

زوڵاڵ کۆی کەنعان، زوڵاڵ کۆی کەنعان
یادگاری من، زوڵاڵ کۆی کەنعان
چاگا غولامان، خەجڵ بین یەکسان
تاجیر باشی بی، شام نامش ڕەحمان
کاکەمش بەرکەرد، نە قەعری زیندان
یووسف بی کاکەم، زولەیخاش ئەستان
عزیزی میسری، ئەز بیم جەومەکان

واتاکەی:

(ئەی زولالی (پاکی) کەنعان
ئەی یادگاری من، ئەی زولالی کەنعان
لەو کاتەی مێرد منداڵان خەجاڵەت بوون
لە کار و کردەوەیان
شام بازرگان باشی بوو ناوی ڕەحمان بوو
کاکەمی لە ناو زیندان هێنایە دەرەوە
کاکەم یووسف بوو گەیشتە زولەیخا
بوو بە عەزیزی میسر (لە جێی عەزیزی میسر دانیشت)

شا ئیبراهیم لە تەک بایەخ دانی بە ڕووداوی کۆن و بەکار هێنانی وەک ڕەمز بۆ

لێکدانەوەی نهێنییەکانی ئایینی یارسان، بایەخێکی زۆریشی بە دروشمە تایبەتییەکانی ئەم ئایینە داوە. لە سروودێکی دا دەڵێ: لە ڕۆژگارانی پێش «کردگار» (خالق) پەیکەری من سیمرغ بوو، پرتەوی من ڕووناکیی گەیاندە چین، من باپیری هەموو خەڵکی ئەم گێتییە بووم، ئادەم و حەوا پەیکەری من بوون، ئێستاش منم پێوەندیی نێوان کردگار و بەندە، ئەمە و سیمرغ لە سۆفیزمی یارسانەکان دا نیشانەی تەواوی و کامڵی ئادەمزادە، سۆفییان بە پرتەوی خودای دادەنێن لە قالبی مەتریالی دا خۆ دەنوێنێ.

یورتی من عەنقا، یورتی من عەنقا
نە یانەی ئەزەل، یورتی من عەنقا
نە قاڵبی چین، نوور ئەز موحەییا
جەدد و عالەمی، ئەز نان بیا
جامەی ئەز بیا، مەشیانە و مەشیا
ئیگاش نی پەردە، سککەم بی ڕەوا

واتاکەی:

(پەیکەرم سیمرغە
لە ڕۆژی ئەزەلەوە، پەیکەرم سیمرغە
نوور و پرتەوی من، ڕۆشنایی تاچین بردووە
من باپیری خەڵکی هەموو گێتیم
ئادەم و حەوا پەیکەری من بوون
من پێوەندیی خودا و بەندەم و سککەم ڕەواجی هەیە)

لە شیعرێکی تریدا شا ئیبراهیم باس لەو جۆرە دۆنادۆنە دەکا کە گیان تەنیا لە لەشی ئادەمزاد خۆی نانوێنێ، بەڵکو لە گیانی ئاژەڵ و ڕووەک و شتی تری سروشتیش دەر دەکەوێ، لەم لایەنەوە دەڵێ:

زولاڵی کۆی بید، زولاڵی کۆی بید
ئیبراهیمنان، زولاڵی کۆی بید
ئیبراهیم نامم، فەرەم بی شەدید
پادشام بلنگ بی، نەکۆی ناپەدید
ها کیشوەر بیام، ئەز نامم جەمشید
کاکەم یادگار، نامش بی خورشید

واتاکەی:
(پاکی کێوی بید
من ئیبراهیمم، پاکی کێوی بید
ناووم ئیبراهیمە بەرز و بەهێزم
پاشام پڵنگە، لە کێوی نادیار دایە
هاتمە سەر ڕووی زەوی بە ناوی جەمشید
کاکەم کە یادگارە لە ناو ڕۆژ دایە)

لە پاڕانەوەیێکی دا شا ئیبراهیم بەم جۆرە لەگەڵ سوڵتان سەهاک دا دەدوێ و پێیدا هەڵدەڵێ:

شـــــــەهنشـــــــای شـــــــاهان
بێ مـەئواو مـەکـان، شـەهنشـای شـاهان
ئاگـای هەر دوو سـەر، ڕەهنەمـای راهان
مـوتیـعـولئـەمـریم، جـە ئەمـر و خـواهان
سـەدا جـە ویـتـەن، ئێـمـە حـەبابیم
سـەدا جـەویتـەن، ئێـمـە رەبابیم
جە خومخانەی تۆ جامەی ڕەنگا و ڕەنگ
پۆشـــاک یاران بێ، شنۆ و بێ دەنگ
هەر کـەس نە ئەمـرت، بەر بشـۆ وەبەر
مـەئمـووری جـەزاش، مسـتـەفـای داوەر

واتاکەی:
(ئەی پاشای پاشایان
بێ مەئوا و مەکان ئەی پاشای پاشایان
ئاگاداری هەر دوو سەری (سەرەتا و ئەنجام) ڕێبەری هەموو ڕێیێک
سەر بۆ فەرمانەکانت دادەنوێم، هەموو ئەمرو ویستێک،
دەنگ دەنگی خۆتە، ئێمەش یاری تۆین
دەنگ دەنگی خۆتە ئێمە ئامێری دەستی قودرەتی تۆین

له خومخانەی تۆدا جلو بەرگی ڕەنگا و ڕەنگێن
یاران له بەریان کەن بەبێ دەنگ
هەر کەسێ له ئەمری تۆ دەرچێ
مەئمووری دادگای مستەفای حاکمە)

له لایەن بە سەرهاتی ئیبراهیمی خەلیلەوە شا ئیبراهیم له سەر ئەو باوەڕەیە کە خودا ئیبراهیمی هەڵبژارد وەک پێغەمبەری خۆی بۆ ئەوەی ئایینی یارسان بڵاو بکاتەوە، کە بریتی‌یە له ناسینی خودای تاک و تەنیا، بۆ ئەم ئامانجە بتی بت پەرستەکانی شکاند، ئیسماعیلی کوڕی ئیبراهیم کە پەیکەری بابا یادگار بوو بۆ ئەوەی خەڵکی بۆ خۆی ڕابکێشی خۆی کردە قوربانی‌ی ڕێی خوداوەندی کردگار، شا ئیبراهیم بۆ ئەم مەبەسە دەڵێ:

ئیبراهیم نەسەر، ئیبراهیم نەسەر
بەقای دەوری دین، یاریم کەفت نەسەر
ئیبراهیم بیانم، فرزەندی ئازەر
شکەستدا، بیم وە پێغەمبەر
کاکەم یادگار ئیسماعیل بیانی
سەرش بی وەرای، هەق و قوربانی)

واتاکەی:

(ئیبراهیم لەسەر سەرە
کاریگەری ئیبراهیم لەسەردا مایەوە
مەبەس ئیبراهیمی کوڕی ئازەرە
بتی شکاند و بوو بە پێغەمبەر
کاکم یادگار ڕووحی ئیسماعیلە
سەری بوو بە قوربانی له ڕێی هەقدا)

شا ئیبراهیم ئایینی زەردەشتیش بە ئایینی یارسان دەزانێ، لەم لایەنەوە ئەوە دەخاتە ڕوو کە زەردەشت پەیدا بوو خەڵکی له دەوری کۆ بوونەوە و دەیان ویست ئایینەکەی ڕەت بکەنەوە، بەڵام ئەو وەکو مامۆستایێکی بێ هاوتای قسەی ژیر و جووان، دەیووت هەر کەس ئایینەکەی وەرنەگرێ له هەر دوو گێتی دەبێ و مایە پووچ دەردەچێ:

زولاڵ کـــــــــــــۆی هـامـــــــــــــوون
یـادگـــــاری مـن، زولاڵ کـــــۆی هامـــــوون
چاگـــا غـــولامـــان، جـــەم بێن نە ئەســتـــوون
نامش زەردەشت بی، شـام ئاسـای ئاڵتـوون
خـــــەزنەدار بیــــمـــــان، ئەز نامم هامـــــوون
کـــــاکـــــەم یادگـــــار، نامش بی قـــــاروون

واتاکەی:

(زولاڵ کێوی هاموونە
یادگاری من کێوی هاموونە
غولامەکان لە هاموون دا هەموویان ڕێزیان بەست
ناوی زەردەشت بوو وەکو شامی زێڕین
ئێمە خەزنەدار بووین من ناووم هاموونە
کاکم یادگار ناوی بوو بە قاڕوون)

لەو کـاتـەی کـە شـا ئیـبـراهیم ئاییـنی زەردەشـتی بە ئاییـنی یارسـان دەزانێ، دیارە کتێبەکەشی (ئاڤێستا) بە کتێبی ئاییـنی یارسان لە قەڵەم دەدا. لە سەر ئەو باوەڕەیە کە ئاڤێستا بۆ زەردەشت (زەردەشت پەیکەری بنیامینە) هاتۆتە خووارەوە و پێغەمبەری خودا بووە، لەم لایەنەوە دەڵێ:

زولاڵ ئاڤـێـســتــا، زولاڵ ئاڤـێـســتــا
ئەسـڵی دەفـتـەرەن، زولاڵ ئاڤـێـســتــا
بنیـام زەردەشـتـەن، دەفـتـەر وە دەسـتــا
زاتش جـە بادەی، شـەهنشـا مـەسـتــا

واتاکەی:

(زولاڵ ئاڤێستایە
ئاڤێستا سەر دەفتەری هەموو دەفتەرێکە
بەنی ئادەم زەردەشتە، دەفتەری لە دەستە
زاتی ئەو لە بادەی شاهنشاهی دروست بووە)

یەکێ لە ئەدگارەکانی ئاییـنی یارسان ئەوەیە کە دوو سەرچاوەی ئاو و کانیـان هەیە، بە

سەرچاوە و ئاوی پیرۆزی دەزانن، بە لایانەوە بەرامبەر بە ئاوی کەوسەری بەهەشتن، ئەمانە یەکێکیان ئاوی کەسلان (غەسلان) و ئەویتریان هانەی تا (کانی تا)یان پێ دەڵێن.

لە بابەت کانیی کەسلانەوە شا ئیبراهیم دەڵێ:

زولاڵ کـــــــــەرد مـــــــــەقـــــــــام
یادگـــاری من، زولاڵ کـــەرد مـــەقـــام
دۆن وە دۆن ئامـــایم، نیـــانیل ئەنجـــام
ئەز وە قــەتڵ زەهر، سـزای ویم کـێـشـام
کـاکـەم وە دەست تیغ، سـزاش بی تەمـام
تـانـەی داڵـەهـۆ، یـا وایـمـێ وەکــــــــام
(شاهۆ) و (شندروێ)، (باڵامۆ) (مەولام)
نەوا (یافــتــە کــۆ)، دیدەدار) ســەقــام
(قەندیل) ئایر کۆ، هەفت تەختی خواجام
یـاران بـەیـانـێ، بـدانـێ پـەیـغـــــــام
یـادگـــــاری مـن، ڕۆشـنـی بـنـیــــــام
بادە غـــەســـلانی ، کـــەوســـەری نۆشـــام
غـــەســـلان یادگـــار کـــەندش پەری جـــام
نە چەهر کـــەندمـــان پەی عـــاد و ئەییـــام

واتاکەی:

(زولاڵ مەقامی پیرۆز کرد
یادگاری من مەقامی پیرۆز کرد
دۆنا دۆن هات تا گەیشتە ئەنجام
من بە مردنی زەهیر سزای خۆم کێشا
کاکم کە تیغ بە دەست بوو سزای تەواوی دام
سزای داڵەهۆ پاکی کردینەوە
(شاهۆ) و (شندروێ) و (باڵامۆ) و (مەولام)
نەوا (یافتەکۆ)، (دیدار) سەقام
(قەندیل)ی ئاگرین حەوت تەختی مورشیدن

یاران بەیانێکم بۆ بکەن پەیامێکم بداتێ
یادگاری من ڕووناکیم بۆ بنێرێ
بادەییێک لە ئاوی غەسلان ئاوی کەوسەر بنۆشم
غەسلانی یادگار کرایە ناو جامەوە
ئەم وێنەیەمان کرد بە عەهد و پەیمانی ڕۆژگار)

لە بابەت سەرچاوەی («هانەی تا» شەوە) بابا یادگار دەڵێ:

زولاڵ کـــــــــــەرد مـــــــــــاوا
ئیـــبـــراهیـــمی مـن، زولاڵ کــەرد مـــاوا
وە ڕووی بـە دانم، کـــــــــەرد نـیـش داوا
هەقــقی ئەرش ســەن، نە عــەرش (ســاوا)
گـــا فـــرزەنـدش ئەز، گـــا ئـەزش بـاوا
مـــیـــری مـــێـــرانەن، نە دەورەی کـــاوا
شـــەقـــەتار نە ڕووی، شـــەفـــەق شکاوا
هەژمش خـــەیلێـن، هیچ کـــەس نە تـاوا
داوود نـە جـــــــــامش، نـە پـاش نـە یـاوا
پەرێ یادگـــاری، کـــەندش (هانەی تا)
ئاووش جـاری کـــەرد، ســـەراوەش هام تا
هام ڕەنگی غــەســلان، نەو لێــژە و مـــاوا

واتاکە:

(جێ نشینی زولاڵ
ئیبراهیمی من جێ نشینی زولاڵ کرد
بەدەنی منی کرد بە ماوای خۆی
حەق عەرشی ئەوە ئیبراهیم نەک عەرشی (ساوا)
جارێکیان من کوڕی ئەوم، جارێکیان من باوکی ئەوم
میری میرانن لە چەرخی کاوەدا
سەر قافلەیە لە ڕووی شەفەق دا
گەلێ بەهێزە و کەس توانای ئەوی نی‌یە
داود لە بەرگی ئەودایە و نەگەیشتە ئەو

لەبەر خاتری یادگار (هانەی تا )ی دروست کرد
ئاوی لێ تەقاندەوە، پڕ بە پڕ ئاوی لێ دەرهێنا
وەکو ئاوی غەسلان لە شوێنێکی لێژدایە )

ئەم شاعیرە سەرچاوەییێکی زۆری ئایینی و ئەفسانەی ڕۆژهەلاتی بەکار هێناوە بۆ دارشتنی ڕستەی بە پێز و پڕ مانای خەیالاوی لە پێناوی دەربڕینی بیر و باوەڕی خۆی. لەمانە بە سەرهاتی ئیبراهیمی خەلیل و یووسفی یەعقووبی کەنعانی و سیمرغی لای سۆفیانی پرتەوی (ئیشراقی) و ئایینی زەردەشت و کتێبی ئاڤێستا و جێگە پیرۆزەکانی یارسانانی هەورامان و هی دیکە.

## بابا یادگار ١٣٥٩م - ١٤٨٠م

ناوی سەید ئەحمەدە، نازناوی ئایینی بابا یادگارە، یەکێکە لە پیرە هەرە گەورەکانی ئەو حەوت ڕێکخراوە ئایینییەی یارسان کە سولتان سەهاک بە ناوی بنەماڵەی بابا یادگارەوە دایمەزراند. بەپێی نامەی سەرەنجام لە ساڵی ٧٦١ه/ ١٣٥٩م لە گوندی شێخان لە دایک بووە، لای سولتان سەهاک خوێندنی تەواو کردووە، بایەخێکی تایبەتی بە تیۆرییەکانی فەلسەفەی پرتەوی (ئیشراقی) داوە، باوەڕنامەی تەواوی زانستییەکان و تەریقەتی گیانی لە سولتان سەهاک وەرگرتووە. لە پاشانا لە سەر ئارەزووی سولتان سەهاک بۆ ڕێ پیشان دانی ڕاستی (ئیرشاد) ڕووی کردۆتە هیندستان و ماوەییێک لەوێ ماوەتەوە، ئینجا گەڕاوەتەوە گوندی سەرانەی کێوی دالەهۆی کرماشان، تەمەنی درێژی لەوێ بردۆتە سەر و هەر لەوێش لە لایەن هەندێ ناحەزەوە کوژراوە، لەبەر ئەوەی زۆربەی ژیانی لە گوندی سەرانە بردۆتە سەر بە سەید ئەحمەدی سەرانەش ناوبانگی دەرکردووە، لە پاشانا بە پێچەوانەوە ئەم جارەیان بە درێژایی ڕۆژگار ناوی گوندەکە وون بووە و بووە بە بابا یادگار. بابا یادگار لە سەد ساڵ زیاتر ژیاوە، لە ساڵی ٨٨٥ه/ ١٤٨٠م کۆچی دوایی کردووە.

بابا یادگار ژنی نەهێناوە، لەبەر ئەوە منداڵی نەبووە، پێش مردنی سەید خەیال و سەید ویساڵی بە جێ نشینی خۆی داناوە.

بە سەرهاتی بابا یادگار وەکو هەندێ لە پیرەکانی تری یارسان لە ئەفسانە پێک هاتووە، هەموو ئەفسانەکانی لەم بابەتەوە لە ژیانی مەسیح و مریەم دەکەن. قارەمانی ئەو ئەفسانانە کچن، بە کیژێنی منداڵی بێ باوکیان بووە وەکو مریەم. دیارە ئەم ڕووداوانە

هەموویان لە دەوروبەری فەلسەفەی دۆنا دۆن دەسووڕێنەوە، کە گیانی کردگار لە لەشی ئادەمـزاد دا خـۆی دەنوێنێ. هەر لەبەر ئەوەشە ناوی باوکی بابا یادگار نەزانراوە.لە دوو توێی ئەم کتێبەدا «ئەفسانەی دەنکە هەنار» هاتووە ئەمەش لێکدانەوەیێکی دیکەیە بۆ منداڵ بوون لە کچێک پیاو تخوونی نەکەوت بێ.

دیوانێکی شـیـعـر لە پاش بابا یادگـار بەجێ مـاوە بە ناوی «زوڵاڵ زوڵاڵ»ەوە، ئەم بەرهەمە ئەدەبی - ئایینییە لە سەر بنچینەی بەند (کۆپلە) هۆنراوەتەوە، هەر بەندێکی لە بابەت بە سەرهاتی پێغەمبەر و وەلی و سۆفی و پیاو چاکێکە، شیعرەکانی خۆش و ڕەوانن.

لە شیعرێکی دا پەنجە بۆ بە سەرهاتی یوونس پێغەمبەر درێژ دەکا، کە ماسی قووتی دا بوو و چل ڕۆژ لە ناو زگی ماسی هەر خەریکی پاڕانەوە و تەهلیلە بوو، بابا یادگار دەڵێ:

زولاڵی کـــۆی تات، زولاڵی کـــۆی تات
ئیـــبـــراهیـــمی من، زولاڵی کـــۆی تات
چاگـا غـولامـان، وە یەک دان سـەوقـات
پادشـــام شـــابی، نامش بی ئەوقـــات
ئەز یوونس بەیام، مـــاهیم بی حـــەیات
کـــاکـــەم ئامـــاهێ، وە غـــڕ دا قنیـــات

واتاکەی:

(ئەی پاکی کێوی تات
ئیبراهیمی من، ئەی پاکی کێوی تات
لەو کاتەی کە مێرد منداڵان دیاری دەدەن بە یەک
(دڵداری دەگۆڕنەوە)
پادشام شایە و ناوی ئەوقاتە
وەکو یوونس ژیانم بە ماسییەوە بەستراوە
تا کاکەم هات و ڕزگاری کردم)

لە شیعرێکی تریدا ئاوڕ لە داستانی ئیرەج دەداتەوە، چۆن فەرەیدوون وڵاتی خۆی لە نێوان منداڵەکانی دا دابەش کرد، ئێران و عەرەبستانی دایە ئیرەج، بەڵام دوو کوڕەکەی تری سـەلم و توور بەمـە ڕازی نەبوون، شـەڕ و شـۆڕ کـەوتە نێـوانیـانەوە، لە ئەنجـام دا

ئیرەجیان کوشت و سەریان بۆ باوکیان ڕەوانە کرد (بە سەرهاتی هابیل و قابیل، یۆحەنای مەعمەدان = یەحیا)، لەو کاتەدا مەنووچەری کوڕی ئیرەج لە ژێر چاودێری باپیری فەرەیدوون پەروەردە دەبوو و دەژیا تا گەورە بوو. لەو سەردەمەدا سوپای سەلم و توور لە سەر ئاوی جەیحوون بوو، مەنووچەر بە لەشکرێکی گەورەوە هێرشی بردە سەریان و بە کوشتن و لە ناوبردنی سەلم و توور پیرۆزیی سەرکەوتنی دەست کەوت:

یادگار دۆنا دۆن، یادگار دۆنا دۆن
گەردشی دەوران، دونیای دۆنا دۆن
ئیرەج بیانی، پووری فەرەیدوون
کاکەم ئیبراهیم، فەری فەرەیدوون
چون پیری کەنعان، دوو دیدەم کوور بی؛
گەردنم وە هوون، تێغ سەلم و توور بی
تاکە مەنووچەر، ئازا وە زەروور
غەرق کەردش نە بەحر، سپای سەلم و توور

واتاکەی:

(ئەی یادگاری کە دێ و دەچێ و قەت ئاوا نابی
لەگەڵ سووڕانی چەرخ و فەلەک و ئەو دونیایە دێ و دەچێ
من وەکو ئیرەجی کوڕی فەرەیدوونم
کاکەم ئیبراهیمیش وەکو فەڕی فەرەیدوونە
وەکو پیری کەنعان هەر دوو چاووم کوێرە
گەردنم بە شمشێری سەلم و توور خوێناوی بوو
تا ئەو کاتەی مەنووچەر ئازایانە پەیدا بوو
سوپای سەلم و تووری لە زەریای خوێن دا نوقوم کرد).

بابا یادگار لە سروودێکی تریشی دا باس لە بەسەرهاتی مەنووچەر دەکا، لەم لایەنەوە دەڵێ:

زوڵاڵی کۆی سەنگ، زوڵاڵی کۆی سەنگ
ئیبراهیمی من، زوڵاڵی کۆی سەنگ
چاگا غولامان، کەفتەن نە ڕای جەنگ
سپای سەلم و توور، ئاوەردەن وە تەنگ

کـاکـەم ئیـبـراهیم، نامـەش بی پەشـەنگ
چەنی مـەنووچەر، پاک کـردش ئەو نەنگ

واتاکەی:

(ئەی پاکی کێوی سەنگ
ئیبراهیمی من، ئەی پاکی کێوی سەنگ
کە یاران بەرەو جەنگ ڕۆیشتن
سوپای سەلم و تووریان شکاند
کاکەم ئیبراهیم لە بنجدا پەشەنگ بوو
لەگەڵ مەنووچەر دوژمنیان لە ناو برد)

بابا یادگار وەکو هەموو پیر و گەورەکانی ئایینی یارسان بایەخێکی زۆری بە مۆسیقا و گۆرانی داوە و ئەم دیاردە هونەرییەی بە فەلسەفەی دۆنادۆنەوە گرێ داوە، لەم لایەنەوە دەڵێ:

زولاڵی سـەر مـەست، زولاڵی سـەر مـەست
یادگـاری نان، زولاڵی سـەر مـەست
چاگـا کـە خـوسـرەو، بەهرام دا شکەست
وە رەبک و فـەرمان ، خـواجـەکەی ئەلەست
بـار بـەد ئـامـا ، بەر بەتی نـە دەست
سێ ئاوای کـوردی، پەی دڵداران بەست
ئـەز بـار بـەد بـیم، نـەو بـەزمـگـای لـەست
کـاکـەم خـوسـرە و بی، نەگـرد بەندی ڕەست

واتاکەی:

(ئەی پاکی سەرمەست
ئەی یادگار، ئەی پاکی سەرمەست
لەو کاتەی خوسرەو بارامی شکاند
بە فەرمان و خواستی خواجەی ڕۆژی ئەلەست (خودا)
باربەد هات ئامێری مۆسیقای لە دەست بوو
سێ ئاوازی کوردی بۆ دڵداران ووت

من باربەد بووم لەو بەزمگا جووانەدا
کاکەم خوسرەو لە هەموو کۆت و پێوەندێک ڕزگار بوو)

لە سروودێکی تری دا بابا یادگار بە سەرخۆی دا هەڵدەڵێ و ئەوە ڕوون دەکاتەوە کە لە کاتێک دا وەکو زاڵ پەژمردە و غەمبار بووە، وەکو دایراک خاتوونیش دڵسۆز و میهرەبان بووە، دایراک بابا یادگاری لەگەڵ خۆی بردووە بۆ کێوی ئەلبورز و لەوێ پەروەردەی کردووە، چونکە پەروەردگار یار و یاوەری بەندەیە.

یادگار ڕووی خاک، یادگار ڕووی خاک
ئیبراهیمی من، یادگار ڕووی خاک
چاگا وە سیمرغ کە بیمان ئەوراک
خاوەندکار بی، نامی شا سەهاک
کاکەم ئیبراهیم، نامش بی ئەفلاک
بنیامین سام بی، سیمرغ بی دایراک

واتاکەی:

(ئەی یادگاری ڕووی خاک
ئیبراهیمی من، یادگاری ڕووی خاک
لەو کاتەی کە بە سیمرغ گەیشتن
پەروەردگار ناوی شا سەهاک بوو
کاکەم ئیبراهیمیش ناوی ئەفلاک بوو
بنیامین سام بوو، سیمرغ دایراک بوو)

لە دوو بەیتێکی دا بابا یادگار ئەوە پیشان دەدا کە پێوەندی گیانی لەگەڵ جەمشیدی شاهنشای پیشدادی دا هەیە، وەکو ئەو پاک و خاوێنە، بنیامین نموونەی جامی جەمشیدە و پێوەندی گیانی لەگەڵ جەمشید دا هەیە.

زولاڵی جەمشیر، زولاڵی جەمشیر
یادگار نان، زولاڵی جەمشیر
جام بنیامینا، جەم بین ئەمیر
بنیام ئافتاو، ماوەر و وە تیر

واتاکەی:

(ئەی جەمشیدی پاک

ئەی یادگار، ئەی جەمشیدی پاک
جام بنیامینە، هەموو لە دەورەی کۆ بوونەتەوە
بنیامین ڕۆژە، تیشکی وەکو تیر دێتە خوارەوە)

بابا یادگار لە یەکێ لە شیعرەکانی پەنجە بۆ داستانی پەیدا بوونی زەردەشت درێژ دەکا، ئەوە دەخاتە ڕوو کە شا ئیبراهیم ئەیووت وێنەی زەردەشت دەنوێنێ، واتە گیانی زەردەشت هاتۆتە لەشی ئەوەوە:

زولاڵی کـۆی زەمـان، زولاڵی کـۆی زەمـان
یادگـار نـان، زولاڵی کـۆی زەمـان
چاگـا غـولامـان، جـەم بێن جـە لامـان
نامش گـوشـتـاسب بی، شـام و بی گـومـان
ئەز ئەو نـاووس بـیم، ڕۆشـن کـردمـان
کـاکـەم زەردەشت بی، پوورەی ئەسـپـیـمـان

واتاکەی:

(ئەی پاکی کێوی ڕۆژگار
ئەی یادگار، ئەی پاکی کێوی ڕۆژگار
یاران هەموو لە لامان کۆبوونەوە
ناوی گوشتاسب بوو بە ئاشکرا و بێ گومان
من ئەو ناووسە بووم ڕۆشن بووینەوە
کاکەم زەردەشتی کوری ئەسپیمان بوو)

بابا یادگار لە موناجاتێکی دا لەگەڵ سوڵتان سەهاک دەدوێ:

چـاگـە نـازمـان
وە نـازی مـێـردان، چـاگـە نـازمـان
وو جـوودت مـایەی سـەر فـرازمـان
گـۆشـت شـنـەوای ڕێـزە رازمـان
هەر وەقت باقـیم وات، مـەنزوورم تۆ بیت
نە پـێچ و پـەنـهـان، پـەنای دوو هۆ بـیت
هـەر جـای تـۆ هـەنـەن، ئـانـە بـاقـی‌یـەن
شـەربەت شـیـفـای، دەسـتـی سـاقـی‌یـەن

ئەر ئـاســـــمـــــان بۆ، ئەگـــەر زەمـین بۆ
پـادشـــــام مـــــەعـین ئـامـین مـــــوبـین بۆ

واتاکەی:

(جێگەت کەس نایزانێ لە کوێیە
شانازی مەردانە جێگەت ئاشکرا نەبێ
بوونی سەر بڵندی ئێمەیە
گۆێت لە هەموو ڕاز و نیازێکمانە
کە دەڵێم (باقی) مەبەسم تۆیە
بە ئاشکرا و نهێنی هەر تۆ هەی
هەر جێیێ تۆ لێی بی هەیە و نەمرە
شەربەتی شیفای دەستی مەیگێڕە
گەر ئاسمان بێ یا زەوی بێ
پادشام هەیە، ئامین و ئاشکرایە)

بابا یادگـار فـەلسـەفـەی دۆنادۆنی تەنیـا لە ڕووداوی کـۆن و ڕووداوی مـیللی کـوردی وەرنەگرتووە، بەڵکو عـەلی وەکو پەیکەرێکی کردگار دەورێکی باڵای هەیە، لەبەر ئەوەیە بابا یادگار دەڵێ:

شـــــــــــــەرت وێـم وەجـــــــــــــا
یـادگـــــــارنـان، شـــــــەرت وێم وەجـــــا
دۆن وە دۆن ئـامـــــــام، قـــــەوا وە قـــــەوا
ئیـــمـــام حـــوســـێـن بیم، پووری شــەهنشـــا

واتاکەی:

(مەرجم دێنمە جێ
من یادگارم مەرجم دێنمە جێ
دۆناودۆن هاتووم، قاڵب بە قاڵب
ئیمام حوسێن بووم، کوڕی شەهنشا)

بابا یادگـار خـۆی لە جـووانتـرین ڕووداوی سرووشت کە ژنە دوور دەخـاتەوە، چونکە بە لای ئەوەوە تـووانەوە لە ناو کـردگـار دا، لە بەختـیـاریی لەش و لاری ژن خـۆشـتـرە؛ لە

پارچەیێکی جووانی لیریکی دا دەڵێ:

زولاڵی مەنی، زولاڵی مەنی
یادگارەنان، زولاڵی مەنی
بێزاریم واستان، نەدامی ژەنی
سەرازاد بیانی، وە لوتفی غەنی

واتاکەی:

(من پاکم
من یادگارم، من پاکم
لە داوێنی ژن بێزارم
بە لوتفی خودا سەر ئازاد دەبم)

بابا یادگار وەک ڕێبەرێکی ئایینی خۆی گەورە دەنوێنێ، وەک شاعیریش موناجاتەکانی بیر و باوەڕێکن لە قاڵبی جوانکاری دا دارێژراوون و پێوەندییان بە ژیانی گیانی و مێژووی ئایینەکەیانەوە هەیە. بێ گومان بە سەرهاتی یوونس پێغەمبەر لە ناو وورگی حووت و حیکایەتی سەلم و توور سەرچاوەی داهێنانی بەرهەمی ئەدەبین، هەروەها بابا یادگار پەنجە بۆ «عەلی» درێژ دەکا کە یەکێکە لە کردگارە گەورەکانی یارسان لە دوای دەوری پاش ئیسلام.

## قرمزی (شاوەیس قولی) ١٤٠٧م - ١٥١٤م

شاوەیس قولی کوڕی پیر قەنبەری شاهۆییە، نازناوی قرمزییە و هەر بەوەش ناوبانگی دەرکردووە، بەپێی نامەی «دەورەی قرمزی» لە ساڵی ٨١٠ھ/ ١٤٠٧م لە گوندی دەرزیانی ناوچەی شاخی شاهۆ لە دایک بووە.

لە ئەفسانەی ئایینی یارسان، شاوەیس قولی «قرمزی» بە پێنجەمین ئەدگاری کردگار دادەنرێ کە لە سەر ڕووی زەوی خۆی نوواندووە، سەرچاوە ئایینییەکانی یارسان لە دایک بوونی قرمزی بەم جۆرە دەگێڕنەوە: «کردگاری شای گێتی بڕیاری دا لەگەڵ کۆمەڵێک لە یارانی سەرێک لە ماڵی قەنبەر شاهۆیی بدا. لەگەڵ چووار فریشتەی بە دیمەن دەروێش و قەلەندەر ڕوویان کردە ماڵی قەنبەر. قەنبەر و خێزانی خاتوون زەربانوو بەخێر هاتنێکی گەرمی میوانانیان کرد. دەروێشەکان لە قەنبەریان پرسی ئایا منداڵی هەیە یا نا؟ قەنبەر ووتی: نا، لەم کاتە دا بنیامین دەستی درێژ کرد و سێوێکی پێشکێش بە ژن و مێرد کرد و

پێی ووتن: شـای گـێـتـی منداڵێکتـان پێـشکـێش دەکـا، بەڵام نـاوی مـەنێن تـا من خـۆم سەرتان لێ دەدەمەوە.

لە پاش چەند ڕۆژێک میوان خودا حافیزیyان لە خانە خۆی کرد. ساڵێک بە سەر ئەمە تێپەڕی، ئینجا یاران هاتنەوە ماڵی قەنبەر، کە قەنبەر چاوی پێیان کەوت مەسەلەکەی هاتەوە یاد و بە خێزانی ووت: لەبەر ئەوەی لەم ماوەیەدا زگت پڕ نەبوو، دیارە ئەوانیش هاتوونە بۆ پیرۆزبایی منداڵ بوون، خۆت پێیان پیشان مەدە، بۆ ئەوەی دڵیان نەڕەنجێ. خاتوون زەڕبانوو ووتی:

تۆ برۆ بەخێر هاتنیان بکە و بیاندوێنە تا من بیرێک دەکەمەوە.

قـەنبـەر خـەریکی مـیـوانان بوو، ژنەش پارچەیێک گۆشـتی لە قـوماشـێک پێچـایەوە و خسـتـی‌یە ناو جـۆلانەوە و لە پاشـانا هاتە لای مـیـوانەکـان. مـیـوانان لێیان پرسی ئایا منداڵی بووە؟ ژنە ووتی: بەڵێ. بنیـامین ووتی: برۆ بۆمـانی بهـێنە تا چاومــان پێی بکەوێ. ژنە ووتی: منداڵەکـە نووسـتـووە. ئیـتـر بنیـامین ناچار بوو خـۆی بچێ بۆ لای جۆلانەکە و سەری پارچە گۆشتەکە هەڵبداتەوە، لەو کاتە دا منداڵێکی یەکجار جووان و سوور ڕەنگ و ڕوو خۆش دەرکەوت، یاران و ژن و مێرد یەکجار بەختیار بوون، کاکە پیرە لە بنیامینی پرسی ناوی بنێین چی؟ بنیامین ووتی: شاوەیس قولی...»

قـرمـزی لە منداڵی‌یەوە دەسـتی بە خـوێندن کـردووە و لە لاویەتی‌دا شـیـعـری ووتووە، «قـرمـزی» کـردووە بە نازناوی شـیـعـری. ژنی نەهێناوە و هەمـوو کـات و دەمی بۆ بڵاو کردنەوەی بیر و باوەڕی یارسان تەرخان کردووە. لە ژیانی دا بنەمـاڵەی «شـامـیـهـمـان»ی دامەزراند بۆ ڕێبەری ئاییني یارسان، یارەکانی یا فریشتەکانی ئەمانە بوون «پیر قەنبەر، کاکە عەرەب، کاکـە ڕەحمان، کاکە پیرە، خاتوون زەڕبانوو». وەکو دەردەکەوێ دایک و باوکی هەر دووکیان لە «چار مەلەک»ەکانن. ئەوەی شایانی باسە «چار مەلەک»ی هەموو شا و سوڵتانێکی گێتی بەپێی ئاییني یارسان یا چووار کەس دەبن یا پێنج کەس، ئەگەر پێنج کەس بن، پێنجەمیان ژنە و وەکو مریەم بەبێ پیاو ئینسانێک دروست دەکا، بە لەش ئادەمزاد و بە جەوهەر گیانی کردگار.

قـرمـزی لە سـەد ساڵ زیاتر ژیاوە، لە سـاڵی ٩٢٠ھ/ ١٥١٤م کـۆچی دووایی کـردووە، بەڵام جێی ناشتنی دیار نی‌یە.

گـەلێ شـیـعـری ڕەنگین بە نـاوی قـرمـزی و یـارانی بە یادگـار مـاونەتەوە و لە نامـەی

«دەورەی قرمزی» دا تۆمار کراوون.

لە دوو بەیتێکی دا قرمزی پەنجە بۆ سێ ڕۆژەی ڕۆژووی یارسانان درێژ دەکا، کە «ڕۆژووی ئەشکەوتی نوێ»شی پێ دەڵێن.

بەپێی نامەی سەرەنجام لە کاتێک دا کە سولتان سەهاک لە بەرزنجەوە ڕوو دەکاتە شێخان، لە ڕێگە کۆمەڵێک لە هۆزی چیچک ڕێیان لێ دەگرن، سولتان و یارانی ناچار دەبن پەنا ببەنە بەر ئەشکەوتێک لە شاخی شندروێ، سێ شەو و سێ ڕۆژ لەوێ خۆیان دەشارنەوە، ڕۆژی چووارەم سرووشت تووڕە دەبێ و دەیکا بە ڕەشەبا و تۆفان، هۆزی چیچک تەفر و توونا دەبن، لە پاش ئەمە سولتان فەرمان دەردەکا کە هەموو ساڵێک سێ ڕۆژ بە ڕۆژوو بن بۆ سوپاسگوزاری کردگار، شاعیر دەڵێ:

یەرێ رۆی یاران، یەرێ رۆی یاران
هەر کەس نەگیرۆ، یەرێ رۆی یاران
ئەر ڕۆژێ سەرجار، یانەش نوور باران
قەبوولم نیەن، وە جەمش ناران

واتاکەی:

(سێ ڕۆژەی یاران
هەر کەس نەگرێ، سێ ڕۆژەی یاران
با ڕۆژێ سەد جاریش نوور ببارێتە ماڵی
ئەو کەسە قوبووڵ نیيە و نابێ بێتە جەمخانە)

قرمزی لە دوو بەیتێکی تریدا شانازیی بەوە دەکا کە کوردە و ئەمە بە داستانی بە ناوبانگی کاوەی ئاسنگەر دەبەستێتەوە کە بەهێز و توانای خەڵک بۆی کرا زۆر و ستەمی زەحاک لە ناو بەرێ، دەڵێ:

ئەسڵمەن جە کورد، ئەسلمەن جە کورد
با بۆم کوردەنان، ئەسلمەن جە کورد
من ئەو شێرەنان، چەنی دەستەی گورد
سڵسڵەی سپای، زەحاک کەردم هورد

واتاکەی:

(من کورد نەژادم

باوکم له کوردانه، من کورد نەژادم
من لەو شێرانەم که ئازا و جه سوور بوون
سوپای زەحاکم وورد و خاش کرد)

لێرەدا قـرمزی گـیـانی خـۆی بەپێی بیر و باوەڕی دۆنادۆن به گـیـانی کاوەی ئاسنگەر دەزانێ.

ئەو شـیـعـرانەی کەوتوونەته ناو دەفـتـەری «دەورەی قـرمـزی» به ناوی قـرمـزی خـۆی و یارانیـەوە تۆمـار کـراوون، زۆربەیان له گـفـتـوگـۆی نێـوان قـرمـزی و یارانی دەردەکـەون بۆ مـەبەسی ڕوون کـردنەوەی بیـر و باوەڕە پراکـتـیـکی‌یەکـانی ئایینی یارسـان کـەوتوونەته ناوەوە. ئەم گفتوگۆیه به شێوەی بەند (کۆپله)ی سێ نیوه دێر شیعری، ده سیلابی و یەک قافیەیی خۆیان دەخەنه ڕوو.

هەر لەو کاتەی که قرمزی له سەر ڕووی زەوی پەیدا بووه، کاکه پیره ووتوویەتی:

بـلا مـــــــار بـووریم، ئـەو یـانـەی یـاری
پادشـــاهان ئامـــا، گـــەنج کـــەئت شـــاری
ئـەی داد ســـــوارن، نـوورش کـــــرد داری

واتاکەی:

(بریا من مار بوومایه له ماڵی یار دا
پادشاهان هاتن، لاو کەوتنه ناو شار
ئەی داد ئەمانه سوارن، نووری ئاشکرا بوو)

کاکه عەرەب وەرامی داوەتەوە:

هاکـمـا ندار من مـۆ، ئەو کـەمـان سـەخـتی
غـــولام ئەو کـــەســەن، بشناســـۆ وەقـــتی
خــواجــەمــان ئامــا، ئەو ســەر ســەخــتی

واتاکەی:

(هەر وا بزانه من هاتم بۆ ئەو جێیه سەخته
غوڵام ئەو کەسەیه بەڵێن بەجێ بێنێ
مورشیدمان هاتووه بۆ ئەو شوێنه سەخته)

ئینجا کاکه ڕەحمان ووتوویەتی:

عـــــــەممەمــــــان دانـا، تـاهـا تـەبـارەک
بـیـــــــدی پـردیـوەر، ئـامـــــــا دلارەک
خـــوا جـــەمـــان ئامـــا، یوورتش مـــوبـارەک

واتاکەی:

(جزوەکانی (عەممە) و (تەها) و (تەبارەک) مان دانا
تەماشای پردیوەر بکەن دڵخواز هات
مورشیدمان هاتن وێردەکانیان پیرۆز بێ)

له پاشانا خاتوون زەڕبانوو ووتوویەتی:

کـــارخـــانەی خـــواجـــەم، کـــرد بەینی ریزوان
ئیـــدا و ســـواران، شـــیـــتش کـــرد خـــەزان
نـــە پـــردیـــوەر دارســـت کـــــــــــەس نـــەزان

واتاکەی:

(بەهەشتی مورشیدانمان جێی ریزوانە
ریزوان و سواران پاییزیان شێت کرد
کەس نەزان لە پردیوەر دا جێگیر بوو)

گفـتـوگـۆی قـرمـزی و یارانی لەو کـاتانەدا ڕوویـان داوە کـه بەرامـبـەر بە مـەسـەلـەیێک وەسـتـاوون، بە تایبـەتی ئەو مەسـەلانەی پێـوەندییان بە ئاییـنی یارسانەوە هەیە، هەندێ لەو مەسەلانە وەکو لای خووارەوەن:

١- کۆمەڵێک لە خـەڵکی ناوچەی شاخی شاهۆ بەراز ڕاو دەکـەن و گۆشـتـەکـەی دەکەنە کـەباب و دەیخـۆن. لـە کـاتێـک دا دەچنە لای قـرمـزی شـای گـێـتـی پێیان دەڵـێ کـە بۆنی حەرامیان لێ دێ، ئەوانیش دەڵێن بەڵێ لە تۆ ئاشکرایە، ئینجا قرمزی دەڵێ:

یـاران ئـاشـنـاســـــــــان، ئـاهـۆنـی ئـاهـۆ
هەر کـــەس گـــۆشت گلە چنش مـــەیابۆ
زەمـین و ئـاســـــمـــــــان، بـارەش تـەنـابـۆ

واتاکەی:

(ئەی یاران ئێوەم ناسیوە یەک بە یەک

هەر کەسێ گۆشتی خواردووە بۆنی لێوە دێ
زەوی و ئاسمان خەریکن بێنەوە یەک)

کاکە پیرە دەڵێ:

قـــرمـــزی ئامـــا ، ئەوســـەر تا ســـەری
رەوشـــــــان ئـاوور، جـــــــە تەنـگە بـەری
گـل کـش بـنـیـــــــامـین، وە یـار بـشـکـری

واتاکەی:

(قرمزی هات لەم سەر تا ئەو سەر
رووناکی ئاگرەکەی تەنگەبەری روون کردەوە
پەنجەی بنیامین لە یار ئاشکرا بوو)

قرمزی وەرام دەداتەوە:

یـاران ئـاشنـاســـــان، نیـــــۆ بێ بە ســـــەر
شک باران مـــیـــۆ، وە تێـــغی دوو ســـەر
گـــاوی بنیـــامین، مـــار خـــون مـــاری خـــوەر

واتاکەی:

(ئەی یاران ئێوەم ناسیوە شت نییە بێ سەر
بارانبار دەبێ بە شمشێری دوو سەر (زولفەقار)
جارێک بنیامینە، جارێکیان خاوەن مار و مارگر)

دیسانەوە دەڵێ:

کـــووچە ســـایی کـــەرد، ئەی مـــردار هوری
جـــە شـــەرت بـنیـــامین، بیـــا نام بەری
پەریشـــان کـیـــانا ، گـــۆشـــتی ئەســـتـــری

واتاکەی:

(کۆڵان سێبەری کرد ئەی مردار خۆر
بە مەرجی بنیامین، وەرە نامە بەرە
بە ناچاری گۆشتی ئێستری نارد)

٢- هەندێ لە یارانی قرمزی لێی دەپرسن ئێمەی یارسانی ئەهلی هەق بۆ دەبێ رۆژوو

بگرین؟ له وەراما قرمزی دەڵێ:

شـــا کـــەرەم کـــەردەن، ڕووزە بایـتلەن
هەر کـەس ڕووزەش کـرد، زەهری قـاتیلەن
ز شـــەرت بنیـــامین، هەم ئەو عـــاتیلەن

واتاکەی:

(شا کەرەمی کرد، ڕۆژوو باتیلە
ئەو کەسەی بە رۆژ دەبێ، زەهری قاتیل دەنۆشێ
بەپێی مەرجی بنیامین کەسێکی بێ کارە)

دیسانەوە قرمزی دەڵێ:

تەمـــامی ئەعـــزاش، مـــیکە بو ڕووزە
ئـینـکاری ئـەزەل، نـە ئـاتـەش ســـــووزە
ئـەهلـی هـەقـــــانم، مـــــەدا مـن ڕووزە

واتاکەی:

(هەموو ئەندامەکانی بە ڕۆژوو مەکە
ئەوەی ئینکاری ئەزەل بکا بە ئاگر دەسووتێ
من ئەهلی هەقم، ڕۆژوو مەدە من)

کاکە پیرە دەڵێ:

پـاشــــــا ئـەمـــــــانـە، دڵ پـڕ ئـەنـدۆوە
هەر کـــەس ڕووزە گـــرت، قـــەومی نەنۆوە
داخل وە مـــیللەت، هەفـــتـــا گـــرۆوە

واتاکەی:

(پاشا لەم شتانە دل پڕ غەم و پەژارەیە
ئەو کەسەی بە ڕۆژوو دەبێ لە قەومی نەبوونە
دەچێتە ناو حەفتا گروەکەی دۆزەخەوە)

کاکە عەرەب دەڵێ:

دۆست پادشـــام کـــەرد، مـــووچەی ناچان
وەزەمـین نـاچـە، چـووب دوو حــــــاچـان

نیـــــشـــــانه نەنۆ، ســــویـل وێش پاچان

واتاکەی:

(پاشای دۆستم مووچەی بۆ هەموو زیندەوەرێک بڕییەوە

لە سەر زەمیندا بە دوای هەموو زیندەوەرێک چوو

نیشانەی نوێ ئەوەیە سمێلی پاچیوەتەوە)

کاکە ڕەحمان دەڵێ:

هەر کـــەسی کـــە یار، نەگـــیـــرۆ ڕووزە

سێ ڕووزە گـــیـــران، نە ئاتەش ســـووزە

خــــاران نـەزانان، یەک مـــــاهـ سێ ڕووزە

واتاکەی:

(هەر کەسی دۆست بێ، با ڕۆژوو نەگرێ

سێ ڕۆژ بە ڕۆژوو بوون، لە ئاگرا ناسووتێ

برایان نەیانزانیوە، یەک مانگ سێ ڕۆژە)

عزراییل دەڵێ:

یـا ڕووزە نـەیـۆ، یـا شـــــــا ئـەمـــــــانـە

هەر کــەس ڕووزە گــرت، ئەو بێ ســامــانە

ئاخــــر کــــە شکار، گــــورگ دەمـــانە

واتاکەی:

(با بە ڕۆژوو نەبن دەخیلتم پاشا

ئەوەی ڕۆژوو دەگرێ، ئەو کەسە بێ سامانە

دواجار دەبێتە نێچیری دەمی گورگان)

لێرەدا دەبینین شەعائیری یارسانەکان بە شیعر و ئاوازەوە دەر دەبڕێ، ئەم دەستوورانە لە سەر زمانی ئەولیا گەورەکانیانەوە کەوتوونەتە ناوەوە، ئەگەر ئەم گەورانەی یارسان شاعیریش نەبوو بن قسە و ئامۆژگاری‌یەکانیان لە دوایی‌دا خراونەتە ناو قاڵبی شیعرەوە بەپێ‌ی شێوازی شیعری دیالێکتی گۆرانی‌ی زمانی کوردی بە گشتی.

پێویستە لێرەدا ئەوە ڕوون بکرێتەوە کە نازناوی «قرمزی» ووشەیێکی ئازربێجانی (تورکمانی)یە بە مانای ڕەنگی «سوور» هاتووە.

جگە لەوە لە کتێبی «سەرەنجام»ی یارسانان دا، هەندێ شیعر بە زمانی تورکمانی هاتوون لەوانەیە ئەمانە لە کوردی‌یەوە گۆڕابنەتە سەر زمانی تورکمانی چونکە بەشێک لە یارسانەکان بە نەژاد تورکمانن، بەڵام ئەوانیش زمانی ڕەسمی ئایینەکەیان هەر زمانی کوردی‌یە.

## عالی قەڵەندەر ١٤٣٤م - ١٤٨٤

عالی قەڵەندەر یەکێکە لە گەورەکانی ئایینی یارسان، بەپێی نامەی «سەرەنجام» لە ساڵی ٨٣٨ھ/ ١٤٣٤م لە دامەنی شاخی داڵەهۆ لە دایک بووە، خوێندنی سەرەتایی لە مەڵبەندی خۆی بووە، لە سەردەمی لاویەتی دا بۆ خوێندن ڕووی لە دینەوەر کردووە، لە پاشانا چووە بۆ بەغدا و خەریکی ڕێبەری‌ی ئایینی یارسان بووە، هەر لەو ناوە لە ساڵی ٨٨٩ھ/ ١٤٨٤م لە لایەن ناحەزانەوە، ئەوانەی تیرۆری بیری پیشەیانە، کوژراوە و بووەتە قوربانی‌ی بیر و باوەڕی خۆی.

عالی قەڵەندەر لە پاش سوڵتان سەهاک پەیدا بووە، لە پایە و مەقامی شا ئیبراهیم ئەیووتی بووە، لە پاش کوژرانی عالی قەڵەندەر بۆ مەبەسی بەردەوامی بیر وباوەڕ و ئەو ڕێکخراوەی سەرۆکایەتی کردووە، دوو کەس لە یارانی «دەدە عەلی» و «دەدە حوسێن» بنەماڵەی عالی قەڵەندەری‌یان پێک هێناوە.

بەرهەمی هەرە گرنگی عالی قەڵەندەر کە بۆمان ماوەتەوە «سروودی دووەم» لە کتێبی ئایینی سەرەنجام دا»یە. هەر ئەو سرووده بە پچڕ پچڕی لە دەفتەر و دیوانە ئایینی‌یەکانی تری یارسان تۆمار کراوە.

## سروودی دووەم لە کتێبی سەرەنجام دا

لە بەشە شیعری‌یەکەی کتێبی پیرۆزی ئایینی یارسان «سەرەنجام» کە لە (١٠) پارچە شیعر (سروود) پێک هاتووە، سروودی دووەم لە دانانی عالی قەڵەندەرە بە ناوی «عالی قەڵەندەر وەسفی گۆڕڕانی ناوەوەی خۆی دەکا».

ئەم سرووده لە سەر بنچینەی بەند (کۆپلە) دانراوە، بریتی‌یە لە (١٦) بەند، نیوەی بەندەکان (١٣ بەند) بریتین لە دوو بەیت (چوار نیوە دێڕ شیعر)، سێ بەندیشی بریتین لە شەش نیوە دێڕە شیعر.

دوو بەیتەکانی عالی قەڵەندەر وەکو هەموو دوو بەیتێک لە دەوروبەری بیرێکی

فەلسەفی، یا ئاووڕدانەوەییێکی دانایی، یا پەند و ئامۆژگاری، یا ڕووداوێکی کورت دەسووڕێنەوە، بێ گومان هەموو ئەم دیاردانەش لە جەوهەری بیر و باوەڕی ئایینی یارسان ناچنە دەرەوە، بەڵکو هەموویان لە پێناوی ڕوون کردنەوەی ئایینەکەن، بۆ هاندانی خەڵکی بۆ باوەڕ کردن بە ئایینی یارسان.

وەکو لە بەندەکانی ئەم سرووده دەردەکەوێ هەر بەندێکی سەربەخۆیە و پێوەندیییێکی ئەوتۆی لەگەڵ بەندەکانی تردا نییە، واتە هەر بەندێک دەکرێ بە بەرهەمێکی ئەدەبی سەربەخۆ دابنرێ، بەڵام لەگەڵ ئەوەش دا کە لەگەڵ یەکتری کۆ دەکرێنەوە هەموویان تێکرا وێنەییێکی گشتی ڕێکوپێک دەدەن بە دەستەوە، وا دەکەونە بەر چاو وەکو گیانێکی ئێپۆسی (مەلحەمی) لە سەرانسەری سروودەکەدا هەبێ، چونکە شاعیر گەڕاوەتەوە بۆ مێژووی هەرە کۆنی ئەو ئایینەی کە باوەڕی پێی هەیە، لە ئادەمەوە تا دەوری زیندەگانی خۆی، لەو ماوەیەدا لای هەڵبژاردەی پەیکەرەکان وەستاوە، ئەوانەی گیانی کردگاریان لە لەشی ئادەمزاد دا نوواندووە. شاعیر ئەم ئەفسانە جوانانەی خستۆتە قاڵبێکی سۆفیزمی کۆزمۆسی ئەوتۆوە کە هەموویان دیاردەییێکی کۆمەڵایەتی - سیاسی - لاهووتی (نەتەوە - چین - ئایین) بە هەموو تەنگو چەڵەمەیەوە لە ناو یەک شت تواوەتەوە (کردگار).

عالی قەلەندەر دەڵێ:

١

ئەو کـــــــۆی ســـــــەرەندیل
عـــالینان عـــالی، ئەو کـــۆی ســـەرەندیل
قـــــوربانیم کـــــەردەن، نەوانی زەلیل
هابیل بیـــانی، کـــوشـــتم کـــەرد قـــابیل

واتاکەی:

(ئەو شاخی سەرەندیبە (وڵاتی سەیلان، سیریلانکا)
بەرزم هێندەی، ئەو شاخی سەرەندیبە
قوربانیم داوە تا دەرگای خودا نزم نەبێ
بەڵام قابیل ئارەزووی منی نەهێنایە دی و منی کوشت)

٢

ســـــــەری وێم ســـــــانەن
عـــالینان عـــالی، ســـەری وێم ســـانەن

تەســـــویری جـــامم، هیچ کـــەس نەوەنەن
جــەمــشــیــد بیــیــەنا ، جـامی وێم بەنەن
واتاکەی:
(سەرم سوڵتانە
منی بەرز و بڵند، سەرم سوڵتانە
وێنەی جامم کەس تێی ناگا
وەکو جەمشیدم، جام بەشێکە لە من)
٣
گـــــــــــــــــــــــــەردی دۆنـــا دۆن
مــــــەیۆ بـووانیـم، گــــــەردی دۆنـا دۆن
ئامـــایم دۆن وە دۆن، بێگاندیم ئەوشـــوون
ئیـــــرەج بیــــیـــــانم، پووری فـــەرەیدوون
واتاکەی:
(گەڕانی دۆنا دۆن
دەبێ بزانی، گەڕانی دۆنا دۆن
دۆن بە دۆن هاتم تا ئەم شوێنە
ئیرەجی کوڕی فەرەیدوون بووم)
٤
مــــــــەســـــــتی مـــــــەی نۆشــــــەن
عــالینان عــالی، مــەســتی مــەی نۆشــەن
هەر وەخت کـە جیـهـان، وە هەم مـەخـرۆشـۆ
چاکـــەی ناو دەم دا، یا ســـاقم کـــێـــشـــۆ
ســــیـــاوەخـــشنان، هوونم مــــەجـــۆ شـــۆ
قـاف تا قـاف جیـهـام، وە هەم مـەخرۆشـۆ
واتاکەی:
(مەستی مەی خواردنەوەم
منی بەرز و بڵند، مەستی مەی خواردنەوەم
لە کاتێک دا گێتی هەمووی دەخرۆشێ

هەموو شت لێم یاساغ کراوە
وەکو سیاوەش خوێنم دەکوڵێ
له قاف  تا قاف (لەو سەری زەوی تا ئەو سەری زەوی)
گێتی هەمووی دەخرۆشی)

٥

ســـــــــەر چـەوێـمــــــــــێـنـان
عـــالینان عـــالی، ســـەر چەوێمـــێنان
مـــیـــهـتــەران گــرد بەیان بێــدەیمێ گــۆوا
ئەزی حـــوســـێنان پووری شـــەهنشـــا
واتاکەی:
(بێ گومانم هوشیارم
منی بەرز و بڵند، بێ گومان هوشیارم
گەورەکان هەموویان بێن شاهێدی بدەن
من حوسێنم کوڕی شاهنشا)

-٦-

تـــەن وەبـــێ ســـــــــــــــــەری
عـــــالینان عـــــالی، تەن وە بێ ســـــەری
جـــــە ئـەزەل پەرێ، غـــــەم وەستن بـەری
ئەز ئیـــمـــام حـــوســـێن، پووری حـــەیدەری
واتاکەی:
(لەشی بێ سەر
منی بەرز و بڵند، لەشی بێ سەر
له ئەزەلەوە بۆ غەم دروست کراووم
من ئیمام حوسێنی، کوڕی حەیدەرم)

٧

شــــــام بی وە مـــــیـــــهـــــمـــــان
عـــالینان عـــالی، شـــام بی وە مـــیـــهـــمـــان

چەنـی نـوهـســـــەدە، بـاش قــــەلـەندەران
بـابا تـاهیـــر بیم، مـــێـــردی هەمـــەدان
واتاکەی:
(شام بوو بە میوان
منی بەرز و بڵند، شام بوو بە میوان
نۆ سەد کەس لە قەڵەندەران میوانم بوون
من بابا تاهیری خەڵکی هەمەدان بووم)

٨

ئـەو کـــــــــــــۆ بـەســــــــــــەوی
عـــالینان عـــالی، ئەو کـــۆ بەســـەوی
بەرادەران جــەنیـم، کـــەردەن عـــەدەوی
یـووسف بیــبـــانی پووری یەعـــقـــووبی
واتاکەی:
(ئەو کێوی بە سەوی‌یە
منی بەرز و بڵند، ئەو کێوی بە سەوی‌یە
برایانم بوون بە دوژمنم
من یووسفی کوڕی یەعقووبم)

٩

مەست و دێوانە
عـــالـینـان عـــالی، مـــەست و دێوانە
یـــورت وە یـــورت یـــاوان، یـــانـــە وە یـــانـــە
خـــۆشـــاڵ ئەو گـــەلە عـــالی چۆبانە
واتاکەی:
(مەست و دێوانەم
منی بەرز و بڵند مەست و دێوانەم
گیان بە گیان و ماڵ بە ماڵ گەڕام
ئەو گەلە بەختیارە، کە عالی شوانیەتی)

١٠

ژە ئـــیـــنــــا عـــــــــــــــــــالـــی
چاگـــــا یـادگـــــار، ژە ئـینـا عــــالـی
تـێـــــغم بـرانان جـــــە هەق مــــەنالی
وە ســــتــــێنیێم ئەو ســـەد دیوانی کـــالی

واتاکەی:

(لەو جێگە بڵندە
یادگار لەوێیە، ئەو عالی‌یە
تیغم بڕندەیە و هەق لەبەر دەمیا دەناڵێ
سەد دێوانەم وەرستاندووە)

١١

گـــەلێ وەرگــــێـــلا، ژە ســـاحـــیب زەمـــان
وەیل وەیـل مـــەگـێـلا، چون گـورکی دەمـــان
پێــشـــەی شـــەریفی، نەمـــەندەن پێـــشـــان
گـــەوان گـــەوان بین، وە خـــاجـــەپ وێشـــان

واتاکەی:

(گەل لە ساحیبی زەمان هەڵگەڕایەوە
وێڵ وێڵ دەگەڕا وەکو گورگی برسی
پێشەی شەریفی پیشانمان نادا
لە شوێنی خۆمان دا بەش بەش بووین)

١٢

زەردەی کــــــــــــــەمــــــــــــەنـدار
عـــــالینان عـــالی زەردەی کــــەمـــــەندار
وە حـوکـمی خـواجـام، ســاحـیب بەڕ و بار
دۆنم نـــۆ وانـــەن بـابـــا یــادگــــــــــــــار

واتاکەی:

(زرێ پۆشی کەمەندار
منی بەرز و بڵند، زرێ پۆشی کەمەندار

به فەرمانی خواجەی خاوەن بەڕ و زەریا
گیانم بابا یادگار دەنوێنێ)

١٣

یاری هەر دوو سەر
یادگارەنان، یاری هەر دوو سەر
سەندووقم پەڕەن، ژە لەعل و گەوهەر
وەر ژە گشت میردانێ، غەردەنم وە شار
واتاکەی:
(یاری هەر دوو سەرم (هەر دوو دنیا)
یادگارم و یاری هەر دوو سەرم
سندووقکم (سنگم) پڕە لە لەعل و گەوهەر
پێش هەمووان گەیشتوومەتە شار)

١٤

یاری وەفادار
یادگارەنان یاری وەفادار
جەگاهێ زەمین، ئاسمان نەگرت پی قەرار
ئەز من رابیم ژە کارخانەی یا
واتاکەی:
(یاری وەفادارم
یادگارم، یاری وەفادارم
لە کاتێک دا زەوی و ئاسمان دروست نەبوو بوون
من لە کارخانەی یارەوە ڕێگام گرتبووە بەر)

١٥

ژە دەوڵەتی یار، نەویم پووڵەکدار
سەییدی مسکین، ژە گەردی ئاوار
شاهید وەگیرەن، گۆ واهی دەرگار
تاکە ماوەران بێوون وە ئیقرار
سوڵتان مەرمۆ، وێمنان کۆ واه
یادگار وێمەن، وە وێمەن گۆ واه

واتاکەی:
(لە دەوڵەتی یار نەبووم بە خاوەن پارە
سەیدی هەژار، ئاوارەی خواردن و خۆراکم بوو
شاهێد بۆ ئەوەی دەربارەی منەوە شاهێدی بدا
تاکو لە بارەی منەوە بڕیار بدا
سوڵتان دەفەرموێ من خۆم شاهێدم
یادگار خۆمە و شاهێدیش هەر خۆمم)

١٦

ئــەو تــەشـــــــــــــــــتــی تــەلا
سێ دۆنم چی‌یەن، ئەو تەشـــــتی تەلا
ئەووەل سـیـــاوەحش، دووەمین یەحـیــا
سێ‌یەمین حـوسـێن، پووری شـەهنشــا
وە تەشــتی تەلا، کــەردەن نەخــچـیـرم
جــودا کـــەردن، رەئسی مـونـیــرم

واتاکەی:
(ئەو تەشتە زێڕە
سێ گیانم چۆتە ناو ئەو تەشتە زێڕە
یەکەم سیاوەش، دووەم یەحیا
سێ‌یەم حوسێنی کوڕی شاهنشا
نێچیرم لە ناو تەشتی زێڕ داناوە
سەری پرشنگدارم جیا کردۆتەوە)

عالی قەلەندەر فەلسەفەی ئایینی یارسان بە شیعر لێک دەداتەوە، بۆ ئەم مەبەسە دەگەڕێتەوە بۆ سەرچاوەکانی ئەم ئایینە لە ڕۆژگاری جاری جارانی دێرینەوە. ئەمە ئەگەر سوودێکی زانیاریی تایبەتی هەبێ، وەکو شیعریش دەچێتە ناو گێتیی داهێنان و دەبێتە لاپەڕەیێکی زێڕین لە ئەدەبی کوردی کلاسیکی کۆن دا.

## سەید ئەکابیری خامۆشی ١٤٤٠م - ١٤٩٣م

سەید ئەکابیری کوڕی شێخ عەلیی خامۆشی کوڕی سەید ئەبولوەفایە. بەپێی بەڵگەی

نووسراوی یارسانەکان لە ساڵی ٨٤٤ھ/ ١٤٤٠م لە گوندی شێخان لە دایک بووە و خوێندنی سەرەتاییشی هەر لەوێ تەواو کردووە. ئاشنای زانستییەکانی ئایینی و ئەدەب بووە، زمانی عەرەبی زانیوە و شارەزای سەرف و نەحوی عەرەبی بوو، لە پاشانا چووە بۆ ناوچەی هەورامان و خەریکی ڕێبەری ئایینی یارسان بووە، لە دووا ساڵانی سەدەی پازدەم لە ساڵی ٨٩٩ھ/ ١٤٩٣م کۆچی دووایی کردووە.

تا ئێستا بەرهەمی شیعری کۆ نەکراوەتەوە، بەڵام لە دەفتەر و نامەی یارسانەکان دا تۆمار کراوون.

لە دوو بەیتێکی دا ئامۆژگاری خەڵکی دەکا کە بکەونە شوێن کەسانی شارەزا، مەبەسی پیر و پێڕەوانی یارسانەکانە:

ڕەفیقی سفڵە و هامڕایی گومڕا
هەرگیز مەکەرن، یارانی هەمڕا
مەکەفن وە شوون، کۆرمی نارەزا
پەی وێتان پەیدا، پیری شارەزا

واتاکەی:

(هاوڕێیەتی سفڵە و ڕێ وون کەرەوەکان مەکەن
مەکەونە دووای ئەوانەی ڕێیان وون کردووە
مەکەونە شوێن کەسی کوێر و نارەزا
بە شوێن پیری دانا و شارەزا بگەڕێن)

لە دوو بەیتێکی تری دا، سەید ئەکابیر بیروڕای یارسانەکان بەرامبەر بە کردگار دەخاتە ڕوو، لە سەر ئەو باوەڕەیە کە «بوون» لە شتی وورد (زەڕڕە = ئەتۆم) پەیدا بووە، ئەمە هەمیشەییە، لەشی ئادەمزادیش لەو زەڕڕەیە پەیدا بووە، لە پاش مردنی ئەم زەڕڕانە دەچنە ناو لەشی ترەوە، ئێمە ئەم زەڕڕانە لە خشتی دیواری خانوو و گڵی گۆزە و سەوزایی دا دەبینین، ئەوانیش دەردی دڵیان بۆ ئێمە دەگێڕنەوە:

کوتە خشتێ بیم، جە بنە دیوارێ
ناگا بە زمان، ئامـاوە جـارێ
واتش ئەمن بیم، بێ وانەی یارێ
ئیسا خامۆشم، هانە پێوارێ

واتاکەی:
(پارچە خشتێکم دی لە بنە دیوارێک
لە پڕ بە زمان هات و کەوتە قسە
ووتی: من دێوانە و شەیدای یارێک بووم
بەڵام ئێستا بێ دەنگ و خامۆشم لەم پەنایە دا دەژیم)

لە دوو بەیتێکی تریدا، موناجات لەگەڵ کردگار دا دەکا:

بینای گشت کاران،
ئازیز هەر تونی، بینای گشت کاران
ئەز سوەیلەنان، مەرژی نەداران
دڵدار مەوینی، سوب و ئێواران

واتاکەی:
(هەموو کارێک تۆ دەیکەی
تۆی خۆشەویستی من، هەموو کارێک تۆ دەیکەی
خۆشەویستیی تۆ لە ئەستێرەی سیوەیل و دار و
درەخت دا دیارە
هەر دەم، بەیانی و ئێوارە (شەو و ڕۆژ)
دڵداری هەر لە تۆدا دەبینم)

لەم دوو بەیتەش دا ڕووداوی ئەفسانەیی کوشتنی فیلی سپی بە دەستی ڕۆستەمی زاڵ دەگێڕێتەوە:

شی نە ئەو مەیدان، شی نە ئەو مەیدان
ڕۆستەم بری فیل، شی نە ئەو مەیدان
ڕۆستەم روستەما، ڕۆستەم موانان
یاران ڕۆستەم شان نەجم نەمانان

واتاکەی:
(بۆی چووە مەیدان
ڕۆستەم بەرەو رووی فیلی سپی، بۆی چووە مەیدان
ڕۆستەمانە و ڕۆستەم ئاسا

یارانی وەکو ڕۆستەم ناویان کەوتە ناوەوە)

سەید ئەکابیری خامۆشی زیاتر خەریکی پەند و ئامۆژگارییە. مەسەلەی پاڕانەوە و موناجاتیش لە سەرانسەری شیعری ئایینی یارسانان مەبەسێکی سەرەکییە، بە تایبەتی لە لای شاعیری ئەم ماوەیەمان خامۆشی.

## بابا جەلیلی دەودانی ١٤٧٨م - ١٥٦٠م

بابا جەلیل کوڕی جۆزی دەودانییە، بەپێی یاداشتەکانی کاکە ڕەزایی لە ساڵی ٨٨٣ھ/ ١٤٧٨م لە گوندی دەودان لە دایک بووە، بۆ ساڵی لە دایک بوونی ئەم دێڕە شیعرە ووتراوە:

وە سەنەی هەشتسەد هەشتا و سێی شەعبان
جەلیل جە دەودان، ئاماوە جیهان

واتاکەی:

(لە ساڵی هەشت سەد و هەشتا و سێ، لە مانگی شەعبان
جەلیل لە دەودان هاتۆتە گێتییەوە)

بابا جەلیل لە مەڵبەندی خۆیدا پەروەردە بووە، لە ماوەی لاویەتیدا گەشتی زۆری کردووە، خەریکی ڕێبەری ئایینی یارسان بووە. لە پاشانا گەڕاوەتەوە مەڵبەندی خۆی و لەگەڵ یاران و پێڕەوانی ڕێبەرایەتیی ئایینی یارسانی کردووە.

لە کتێبی «دەورەی بابا جەلیل» ئەوە هاتووە کە پیاوێکی ژیر و سۆفییێکی گەورە بووە، پیاوە دیار و بە دیمەنەکانی سەردەمی حەزیان بە بینینی کردووە، بەڵام ئەو گۆشەگیر بووە، زیاتر کاتی خۆی لەگەڵ یارانی بردۆتە سەر، تەمەنی درێژ بووە، لە ساڵی ٩٦٨ھ/ ١٥٦٠م کۆچی دوایی کردووە.

لە سەرچاوەکانی ئایینی یارسان ئەوە نووسراوە کە بابا جەلیل پاش شاوەیس قولی (قرمزی) کەوتووە، بەڵام پێش ئاتەش بەگ و شا ئەیاز هاتۆتە گێتییەوە. هەندێ لە یارەکانی وەکو: میر عەتار، میر هەیاس، میر جۆزی، دەدە بەگتەر، میرزا قولی، سەمەن، سایی لە دەوری ژیانی بابا جەلیل و پاش ئەویش ڕێبەری بیر و باوەڕی ئایینی یارسانیان کردووە.

شیعر و ئەدەبیاتی بابا جەلیل و یارانی لە نامەی «دەورەی بابا جەلیل»دا تۆمار

کراوون، بەشی زۆری سروودەکانی دوو بەیتین.

لەم دوو بەیتە دا بابا جەلیل بە تەواوی ئەوە دەخاتە ڕوو کە گیانی کردگار هاتۆتە ناو لەشی ئەوەوە و خۆی کردگارە:

ئـەجـــــــــر مـــــــــا عــــــــــەزیم،
ئـەز ووزوگــــەنان، ئەجـــرمـــا عـــەزیم
خـــۆفی غـــولامـــان، هیچ نیـــان پەریم
پەنـەم مـــــەواچان، جـــەلیـلی ڕەحـــــیم

واتاکەی:

(ئەجر و پاداشی ئێمە گەورەیە
من لە گەورەکانم، ئەجر و پاداشی ئێمە گەورەیە
ترسم لە مێرد منداڵان (یاران) نی‌یە
بە ئێمە دەڵێن جەلیلی ڕەحیم)

کەچی لە دوو بەیتێکی تردا موناجات لەگەڵ کردگاردا دەکا، لەمە هیچ پێچەوانەیێک ناکەوێتە ڕوو، چونکە کە خۆی بە گیانی خودا دادەنێ، هەر لەو کاتەدا گیانی خودا چۆتە لەشی گەلێ ئادەمزاد لە سەردەمی ئادەمەوە تا دەورەی سوڵتـان سەهاک، ئەم موناجاتە وەکو ئەوەیە کە بابا جەلیل لەگەڵ خۆی دا موناجات بکا، لەم لایەنەوە دەڵێ:

ڕیـازەت کـــــــــــــێـــــــــــشـــم،
ئـەزیـزم پەی تـۆ، ڕیـازەت کـــــــێـــــــشـم
بـزێ کــــــەر وە حــــــاڵ، دەروونـی ڕێشـم
گــوڵـم وە دەســـتـــان، پەی چێــشـــەن بێــشـم

واتاکەی:

(من خەریکی ڕیازەتم
عەزیزم لەبەر تۆ، من خەریکی ڕیازەتم
بەزەییت بە دەروونی زامدارم بێتەوە
گوڵم بە دەستەوەیە (ئیشارەتە بۆ ئەوەی خەریکی ریازەتە)

یارسانەکان لە بابەتی بابا جەلیلی دەودانی‌یان زۆرە لە ڕووی پلەو مەنزیلەیان، لە ناو ئاییینیاندا کەس وەکو مورشید و پێشڕەو و ڕێبەر و هەموو چینەکانی دیکە زۆرن، هەروەها

ئەم یارانەی یارسانان شیعری‌یان هەیە، زۆر و کەمی ئەم شیعرانە بەپێی مەنزیلەی ئایینەکەیان دەگۆڕێ.

***

ئەمە بەشێکی گرنگ بوو لەم کتێبەدا تایبەت بە شیعر و ئەدەبیاتی ئایینی یارسان بە دیالێکتی گۆرانی‌ی زمانی کوردی. بێ گومان دیالێکتی گۆرانی وەک زمانێکی سەرەکی کۆنترین شیعری پێ ووتراوە و تەنیا زمانی ئایینی یارسانەکان نەبووە، بەڵکو زمانی شیعری کوردی بووە بە هەموو بابەتەکانیانەوە، تا ئێستاش لەو ناوچە جوگرافی‌یانە بەردەوامە کە خەڵکی بەو دیالێکتە دەئاخەڤن.

# لیستی ناوی کەسان

**ب**



**پ**

## ش

## ع



## ف



## ڤ

**ن**



**و**



**ه**



**ی**

# لیستی ناوی جوگرافی

# بیبلیۆگرافیا

ناوی ئەو سەرچاوەو کەرەستانەی لەم لیستەیەدا هاتووە، مەرج نی‌یە لەم بەرگەدا هەموویان بەکار هاتبن، بەڵام بەشێکی گرنگن لە لێکۆڵینەوەی زانستی رۆشنبیری کوردی و نووسینەوەی مێژووی ئەدەب.

## بەزمانی کوردی


- ئەحمەدی خانی، فەرهەنگۆکی نۆبار، کۆمەڵێک دەستنووسی لە نامەخانەکانی ئەورووپا پارێزروان، یووسف زیائەددین پاشای خالیدی لە کتێبی «الهدیة الحمیدیة في اللغة الکردیة»، ئەستەمبوول، ١٣١٠ / ١٨٩٢ بڵاوی کردۆتەوە؛ رۆژهەڵاتناس ڤۆن لۆکۆک لە بەرلین لە ساڵی ١٩٠٣دا بەزەنگوگراف بڵاوی کردۆتەوە، لە دوای ئەوە لەلای خۆشمان چەند جارێکی دیکە چاپ کراوە.
- أمين فيضي، أنجمن أديبان كورد، چاپى ترجمان حقيقت، استانبول، ١٩٢٠ .
- چاپی دووەم، سلێمانی،١٩٨٢ .
- چاپی سێیەم، کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا،١٩٨٣ .
- "بانگی کوردستان"، هەموو ژمارەکانی ئەم کۆوارە لەلایەن جەمال خەزنەدارەوە بەرێگەی ئۆفسێت لە ساڵی ١٩٧٤ لە بەغدا بڵاو کراوەتەوە.
- تۆفیق وەهبی، دەستووری زمانی کوردی، بەغدا، ١٩٢٩ .
- تۆفیق وەهبی، خوێندەواری باو، بەغدا ١٩٣٣ .
- تۆفیق وەهبی، ئەشکەوتەکەی گوندک، وەرگێرانی لە ئینگلیزی‌یەوە بۆ کوردی بەکر دلێر، بەغدا، ١٩٥١ .
- جەمال نەبەز، کورتە مێژوویەکی کوردناسی لەئەڵمانیادا، کۆواری کۆڕی زانیاری کورد، بەرگی دووەم، بەشی یەکەم، بەغدا،١٩٧٤ .
- «دەنگی گێتی‌ی تازە» (بەغدا، ١٩٤٣-١٩٤٧).
- رەشید فندی، عەلی تەرەماخی ئێکەمین رێزمان نڤیس و پەخشان نڤیسێ کوردە، بەغدا، ١٩٨٥ .
- «رۆژی کورد»، هەموو ژمارەکانی ئەم کۆوارە لە لایەن جەمال خەزنەدارەوە بە رێگەی ئۆفسێت لە ساڵی ١٩٨١ لە بەغدا بڵاوکراوەتەوە.
- «رۆژی کوردستان»، هەموو ژمارەکانی ئەم کۆوارە لەلایەن جەمال خەزنەدارەوە بەرێگەی ئۆفسێت لە ساڵی ١٩٧٣ لە بەغدا بڵاوکراوەتەوە.
- «رۆژی نوێ» (کۆوار)، ژمارە (٧)، سلێمانی، ١٩٦٠ .
- «رۆناهی» هەموو ژمارەکانی لە شام دەردەچوون (١٩٤٢-١٩٤٥) لە ساڵی ١٩٨٥ لە ئۆپسالا لە سوید بە رێگەی ئۆفسێت لە چاپ دراون.

- ڕەفیق حلمی، شعر و أدبیاتی کوردی، بەرگ ١، بەغدا، ١٩٤١؛ بەرگ ٢، بەغدا، ١٩٥٦ .
- «ژین»ی ئەستەمبوول، ١٩١٩، هەموو ژمارەکانی لەلایەن ئەمین بۆز ئەرسەلانەوە لە ساڵی ١٩٨٥ لە ئۆپسالا لە سوید بڵاوکراوەتەوە.
- سەید محەمەدی سەمەدی، ژێ. کاف، چبوو؟ چی دەویست؟ وەچی لێ بەسەر هات، مەهاباد، ١٩٨١ .
- سۆن، ئی، ب، سەرەتای دەستووری زمانی کوردی، بەغدا، ١٩١٩ .
- صدیق بۆرەکەیی (صفی زادە)، مێژووی وێژەی کوردی، بەرگ ١ و ٢، انتشارات ناجی، بانە - کردستان، چاپخانەء چهر، تبریز، ١٣٧٥ .
- عبدالکریم هکزی، کومەلە شعری شاعرانی کورد، بەغدا، ١٩٣٨ .
- عەلائەدین سەجادی، مێژووی ئەدەبی کوردی، چاپی یەکەم، بەغدا، ١٩٥٢؛ چاپی دووەم، بەغد، ١٩٧١ .
- عەلی تەرەماخی، دەستووری زمانی عەربی بەکوردی، لێکۆڵینەوە و لەسەر نووسین و ئامادەکردنی بۆ چاپ مارف خەزنەدار، بەغدا، ١٩٧١ .
- علی کمال باپیر، گلدەستەی شعرای هاوعصرم، سلێمانی، ١٩٣٩ .
- غەفوور میرزا کەریم، کۆمەڵی زانستی لە سلێمانی، بەغدا، ١٩٨٥ .
- ڤیلچێڤسکی أو، کورد- تێبینی لە مێژووی نەژادی میللەتی کورد، مۆسکۆ- لینینگراد، ١٩٦١ (ئەم کتێبە لەلایەن د. ڕەشاد میرانەوە لە ڕووسییەوە گۆڕاوەتە سەر زمانی کوردی و لە سوید لە ساڵی بڵاوکراوەتەوە.
- «گەلاوێژ»، (بەغدا، ١٩٣٩ - ١٩٤٩).
- کتێبی پیرۆزی مەسیحییان (تەورات، ئینجیل، ئێنجیلی برنابا، کاری نێرراوەکان= اعمال الرسل).
- کەریم شارەزا، کۆیە و شاعیرانی، بەغدا ١٩٦١ .
- «کوردستان» ڕۆژنامەی یەکەمی کوردی کە لە ساڵی (١٨٩٨ -١٩٠٢) بڵاوکراوەتەوە، لە بەغدا لە ساڵی ١٩٧٢ لە لایەن د. کمال فوئادەوە بە ڕێگەی ئۆفسێت بڵاوکراوەتەوە.
- «کوردستان»، (ڕۆژنامە) ئۆرگانی حیزبی دیمۆکراتی کوردستانی ئێران، دەورەی یەکەم (مەهاباد ١٩٤٦)، دەورەی دووەم لە دەرەوەی وولات لە [باکۆ] بە تایبەتی ژمارەکانی ساڵی ١٩٥٥ .
- مارفی نۆدەیی (شێخ)، فەرهەنگۆکی ئەحمەدی، گەلێ جار چاپ کراوە، دوا چاپی لە سەرجەمی بەرهەمەکانی شێخ مارفی نۆدەیی کە ئەوقافی سلێمانی چاپی کردووە دەکەوێتە بەرچاو، بەرگی دووەم بەغدا، ١٩٨٤ .
- محمد أمین زکی، خلاصەیەکی تاریخی کورد و کوردستان، جلدی اول، لە زۆر قدیمەوە تا دوری نادرشا، بەغدا،١٩٣١؛ جلدی دوەم، تاریخی أماراتی کوردییە، بغدا، ١٩٣٧، هەردوو کتێب لە لایەن محەمەد عەلی عەونییەوە وەرگێڕاونەتە سەر زمانی عەرەبی و لە ساڵانی (١٩٣٦) و (١٩٤٥) لە قاهیرە بڵاوکراونەتەوە.

- محەمەد ئەمین هەورامانی، کاکەیی، بەغدا، ١٩٨٤ .
- محەمەد زەکی و میرزا محەمەد باشقە، «اولەمین قراءتی کوردی»، بەغدا ١٩٢٠ .
- محمدی مەلا کریم، حاجی قادری کۆیی، بەغدا، [ ١٩٦٠ ] .
- «نیشتمان»، (مەهاباد ١٩٤٣-١٩٤٤)، ئەم کۆوارە نۆ ژمارەی لێ دەرچووە، لەساڵی ١٩٨٥ لە ستۆکهۆڵم تەنیا شەش ژمارەی بە ڕێگەی ئۆفسێت لە لایەن جەمال نەبەزەوە بڵاوکراوەتەوە.
- «هاوار» هەموو ژمارەکانی کە لە شام دەردەچوون (١٩٣٤-١٩٤٣) لە ساڵی ١٩٧٦ لە بەرلین بەڕێگەی ئۆفسێت لەچاپ دراون.
- هەرەکۆل عەزیزان (جەلادەت و بەدرخان) ڕێزمانا ئەلفبایا کوردی، شام، ١٩٣٢ .

## بەزمانی عەرەبی

- ابراهيم احمد، الاكراد والعرب، ط٢ بغدا، ١٩٦١ .
- أديب معوض، الاكراد في لبنان وسوريا، بيروت، ١٩٤٥ .
- أكسينوفون «مسيرة العشرة آلاف القسم الخاص بكردستان» نقلها الى العربية صلاح الدين سعدالله، بغداد، ١٩٧٣ .
- أنور مائي، محاضرة عن الاكراد في الصين، بغداد، ١٩٥٩ .
- براون، تاريخ الادب في ايران من الفردوسي الى سعدي، ترجمة د. ابراهيم الشواربي، القاهرة، ١٩٥٤ .
- بلەج شيركو، القضية الكردية، القاهرة، ١٩٣٠ .
- توفيق وهبي، قواعد اللغة الكردية، الجزء الاول والجزء الثاني، بيروت ١٩٥٦ .
- جواهر لال نهرو، لمحات من تاريخ العالم، نقلتها الى العربية لجنة من الاساتذة الجامعيين، ط١ ، بيروت، ١٩٥٧ .
- شاكر خصباك، الكرد والمسألة الكردية، بغداد، ١٩٥٩ .
- طه باقر، ملحمة جلجاميش، بغداد ١٩٧٥ .
- طه حسين، الفتنة الكبرى،
- عبدالرقيب يوسف، الدولة الدوستكية في كردستان الوسطى، الجزء الاول، بغداد، ١٩٧٢؛ حضارة الدولة الدوستكية في كردستان الوسطى، الجزء الثاني، بغداد، ١٩٧٥
- عبدالسلام حلمي وعبدالمجيد لطفي، نظرات في الادب الكردي، بغداد، ١٩٤٥ .
- قورئان (کتێبی پیرۆزی ئایینی ئیسلام).

- كريم زندي، حركة كردستان وآذربايجان التحررية، السليمانية، ١٩٦٠ .
- محمد شيرزاد، نضال الاكراد، القاهرة، ١٩٤٦ .
- محمد القزلجي، التعريف بمساجد السليمانية ومدارسها الدينية، بغداد، ١٩٣٨ .
- معروف خەزنەدار، أغاني كردستان، بغداد، ١٩٥٦ .
- معروف خەزنەدار، مخطوطات فريدة ومطبوعات نادرة، الجزء الأول، بغداد، ١٩٧٨ .
- ملحمة جلجاميش، حققها ونقلها الى الانگليزية ن. ك. ساندرز، ترجمة محمد نبيل نوفل وفاروق حافظ القاضي، القاهرة، ١٩٧٠ أصل الكتاب
This is a translation of THE ERIO OF GILGAMESH, English version, by N.K. Sanders (penguin Books), 1960.
- مينورسكي، الاكراد- ملاحظات وانطباعات باللغة الروسية، الترجمة العربية، بغداد، ١٩٦٨ .
- ول ديورانت، قصة الحضارة، الجزء الأول، ط٣، القاهرة، ١٩٦٥، ترجمة الدكتور زكي نجيب محمود؛ الجزء الثاني القاهرة، ١٩٧١، ترجمة محمد بدران.
- يوسف ضياءالدين الخالدي، الهدية الحميدية في اللغة الكردية، أستانبول، ١٣١٠هـ [١٨٩٢].
- يوسف ملك، كردستان او بلاد الاكراد، بيروت، ١٩٤٥ .

## بەزمانی فارسی

- أسكندر تركمان، تاريخ عالم آراي عباسي، تهران، ١٣١٤، [١٨٩٦].
- بابا مردوخ روحانى (شيوا)، تاريخ مشاهير كرد، جلد أول، تهران، ١٣٦٤ [١٩٨٥].
- پور داود، سرودهاى مقدس پيغمبر ايران حضرت سپنتمان زرتشت قديمترين قسمتى است از نامه مينوى اوستا، بمبئ - هيندوستان، ١٩٢٠ .
- جليل دوستخواة، آوستا نامهء مينوي آيين زرتشت، چاپ اول، انتشارات مرواريد، تهران، ١٣٤٣ .
- ديوان بابا طاهر، به تصحيح وحيد دستگردى، تهران، ١٣٤٧ .
- رشيد باسمى، كردو پيوستگى نژادى وتاريخ او، تهران، ١٣١٦ .
- سيد محمد على خواجهالدين، سرسپردگان تاريخ و شرح عقايد دينى اهل حق، تبريز، ١٩٧٠ .
- شاهنامهء حقيقت (تاريخ منظوم بزرگان أهل حق)، اثر حاج نعمة الله جيحون آبادي مكرى متخلص به مجرم، متن مصحح بامقدمه ويادداشتها وتفاسير دكتر محمد

مکری، بخش أول متن شاهنامه، تهران، ١٣٤٥-١٩٦٦؛ بخش دوم فهرستها، ١٣٥٠-١٩٧١.
- شرف خان بن شمس‌الدين بدليسی، كتاب شرف نامه، جلد أول، با اهتمام أقل عباد ولاديمير ملقب وليامينوف- زرنوف در محروسهء بطربوغ در دار الطباع أكادميهء ايمبراطوريه، سنهء ١٨٦٠ عيسوی مطابق سنهء ١٢٧٦ هجری مطبوع كرديد؛ جلد دويم. سنهء ١٨٦٢ عيسوی مطابق سنهء ١٢٧٨ مطبوع كرديد (ئەوەی پێویستە لێرەدا بووترێ ئەوەیە، ئەم كتێبە چەند جارێک چاپە فارسی‌یەکەی چاپ و بڵاوكراوەتەوە، هەروەها بە لێکۆڵینەوە و ساغ كردنەوە وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی فرەنسی و عەرەبی و رووسی و كوردی و توركی و ئینگلیزی.
- صديق صفی زاده «بۆرەكەیی» بزرگان يارسان، تهران، ١٣٦١ .
- صديق صفی زاده «بۆرەكەیی»، نوشتەهای پراكنده دربارهء يارسان أهل حق، تهران، ١٣٦١ .
- كارنامكی أردشير پاپكان، ترجمەی احمد كسروی، تهران، ١٣٤٢ . [١٩٢٣].
- ماشاءالله سوری، سرودهای دينی يارسان، طهران، ١٣٤٤، [١٩٦٦م].
- محمد بن ابراهيم مشهور به خطيب وزيری، بەكوشش دكتر جواد مقصود، نشريەی شماره (١١٣)، أنجمن آثار ملی، تهران، ١٣٥٤ .
- محمد بن علی سليمان الراوندی، راحة الصدور وآية السرور در تاريخ آل سلجوق، بسعی وتصحيح محمد اقبال، بانضمام حواشی وفهارسی مرحوم مجتبی مينوی، تهران، ١٩٢١ .
- محمد معين، مزديسنا و تأثير آن در أدبيات ايران، تهران ١٣٢٦ش.

## بەزمانی توركی

- جلادت عالی بدرخان، مكتوب مصطفی كمال پاشا حضرتلرينه، طبرية، ١٩٣٣ .
- Nurî Dersîmi, Kurdistan Tarîhide Dersîm, Helep, 1952.

## بەزمانی ڕووسی

- ئەرشیفی ڕۆژهەڵاتناسان، ئامۆژگای ڕۆژهەڵاتناسی ئەکادیمیەی زانستی لە سانت پیترسبورگ.
- ئابۆڤیان خ.، سەرجەمی كارەكان، یەریڤان، ١٩٥٨ .
- ئابۆڤیان خ.، كورد، ڕۆژنامەی «قەفقاس»، ١٨٤٨، ژمارەكانی (٤٦-٥١).
- ئابۆڤیان خ.، ئێزیدیەكان، ڕۆژنامەی «قەفقاس»، ١٨٤٨، ژمارەكانی (٨،٩).
- بیرتیلس یی. ئێ.، مێژووی ئەدەبی فارسی- تاجیكی، كاری هەڵبژێراو، بەرگ١، مۆسكۆ، ١٩٦٠ .
- بیریزین، گوڵبژێرێک لە ڕاپۆرتی ساڵانەی گەشتی ماجستێرا (كۆواری وەزارەتی

ڕۆشنبیری میللی)، ١٨٤٥، ژمارە (٤و١٠).
- بیریزین، ئێزیدیەکان (کۆواری لێکۆڵینەوە لەزەوی و گەشت)، مۆسکۆ، ١٨٥٤، بەرگ ٣.
- پالاس پ.س. فەرهەنگی بەراووردی هەموو زمان و دیالێکتەکان، بەرگ ١-٢، سانت پیترسبورگ، ١٧٨٧، بەرگی یەکەم (٤١١ل)، بەرگی دووەم (٤٩٦ل) ووشە کوردی‌یەکان لە جەدوەلی ژمارە (٧٧)دا تۆمار کراوون.
- دیتیل ڤ، پیشاندانی گەشتی سێ ساڵەی ڕۆژهەڵات، (کۆواری ئامۆژگای ڕۆشنبیری میللی)، سانت پیترسبورگ، ١٨٤٧، بەشی (١)، فەسل (٤).
- دیتیل ڤ، کورد لە تێبینی‌یەکانی‌دا، (نامەخانەی خوێندنەوە)، سانت پترسبورگ.، ١٨٥٣ ، بەرگ (١١٩)، ژمارە (٥)، بەشی (٧).
- دیتیل ڤ، مێژووی گەشتێکی ڕۆژهەڵات، (نامەخانەی خوێندنەوە) سانت پیترسبورگ، ١٨٤٩، بەشی (٩٨)، فەسل(١)، ژمارە (٥و٦).
- «ڕۆژهەڵاتی شۆرشگێڕ» (کۆوار)، ١٩٣٣، ژمارە ٣-٤ .
- ڕۆستۆپچین ف.، «تێبینی لە بابەت کوردەوە»، بڵاوکراوەی لێکۆڵینەوەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، ژمارە ١٣-١٤، تاشقەند، ١٩٣٢ .
- ڕوودینکۆ م.ب.، کۆکراوەکانی ئەلیکساندەر ژابا «دەسنووسی کوردی»، (کەشکۆڵی ڕۆژهەڵات)، کارەکانی نامەخانەی گشتی‌ی سالتیکۆڤ- شدرین، ژمارە (٥)، لینینگراد، ١٩٥٧ . ڕووسی.
- ڕوودنیکۆ م.ب.، وەسفی کۆمەڵە دەسنووسەکانی کوردی لە لینینگراد، بڵاوکراوەکانی ئامۆژگای ڕۆژهەڵاتناسی‌ی ئەکادیمیەی زانستی، مۆسکۆ، ١٩٦١ .
- ژووکۆفسکی ڤ. ئا.، کەرەستە بۆ لێکۆڵینەوە لە دیالێکتەکانی فارسی، بەشی١، سانت پیترسبورگ، ١٨٨٨ .
- کوردۆییڤ ق.ک.، کارەکانی لێرخ لە کوردناسی‌دا، کۆکراوەی «ووتار لە بابەت مێژووی ڕۆژهەڵاتناسی‌ی ڕووسی‌یەوە»، بڵاوکراوەی ژمارە (٤)، مۆسکۆ، ١٩٥٩ .
- لێرخ پ.، لێکۆلینەوە لە کوردی ئێران و باپیریان لە خالیدی‌یەکانی سەروو، سانت پیترسبورگ، کتێبی یەکەم. ١٨٥٦، کتێبی دووم ١٨٥٧، کتێبی سێ‌یەم ١٨٥٨ .
- عەلییێڤ گ.ی.، پێشەکی‌ی کتێبی «باباتاهیر بۆ ئاسمان و بۆ زەوی»ی دووبەیتەکانی باباتاهیر، گۆڕینی دیمیتری سیدیخ، مۆسکۆ، ١٩٧١ .
- مار ن. ی. جارێکی تر لە بابەت ووشەی «چەلەبی»یەوە (هەندێ مەسەلەی تەئسیری کولتووری نەتەوەی کورد لە مێژووی ئاسیای ناوەڕاست)، «بڵاوکراوەی کۆمەڵەی ئەرکیۆلۆجی‌ی ئیمپراتۆریەتی ڕووسی/ لقی قەفقاس». ١٩١٢، بەرگ (٢٠).
- میکیشین ک، کورد لە ناوچەی سمۆلێنسکی، بڵاوکراوەی «هەنگی باکووری»، ١٨٥٥، ٢٣ی کانوونی یەکەم، ژمارە (٢٨٣).
- مینۆرسکی ڤ.، کەرەستە بۆ لێکۆڵینەوە لە مەزهەبی ئێرانی «ئەهلی هەق یا عەلی‌ی ئێلاهی»، بەش (١)، مۆسکۆ، ١٩١١ . (کردەوەکانی ئامۆژگای لازارێڤ، بڵاوکراوەی ژمارە ٣٣).

- مینۆرسکی ڤ.، گەشتێ بۆ میرنشینی ماکۆ لە تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٠٥ «کەرەستە بۆ لێکۆڵینەوە لە ڕۆژهەڵات»، سانت پیترسبورگ، ١٩٠٩، بڵاوکراوە ژمارە (١).
- مینۆرسکی ڤ. گەشتێک بۆ مەراغە و ناوچەکانی ڕووباری جاغات و تاتاو لە سەرەتای ئاغستۆسی ١٩٠٦ «دەنگوباسی بارەگای جەنگی قەفقاس». تفلیس، ١٩٠٧، دەورەی دووەم، ژمارە (٢٠).
- هالسهاوزن ا، ناوچەی قەفقاس (تێبینی لە بابەت وەزعی خێزانی و ژیانی کۆمەڵاتی ی ئەو نەتەوانەی لە نێوان زەریای ڕەش و قەزوین دەژین)، بەشی دووەم. سانت پترسبورگ، ١٨٥٧ .
- یێگیازاروڤ س، ووتارێکی ئەتنۆگرافی کورت لە بابەت کوردەکانی ناوچەی یەریڤانەوە، بڵاوکراوەکانی کۆمەڵەی جوگرافیی ئیمپیراتۆریەتی رووس (لقی قەفقاس)، تفلیس، ١٨٩١، کتێبی، بڵاوکراوەی ژمارە (٢).

## بەزمانی ئینگلیزی

- Baldry H.C, Ancient Greek Literature in its living context, New-york, 1967.
- Ch’en Show-yi, Chinese Literature, A historical introduction, New-york, 1961.
- Douglas W.O., Strange land and Friendly people, NewYork,1951.
- Feng Yuan-chun, A short history of classical chinese literature, Pekin, 1958.
- Fossum, L.O. A paractical, Kurdish Grammar, Menneopolis 1919.
- Ivanow W., The truth- worshippers of Kurdistan, Ahli Haqq Texts, Leiden-Holland, 1953.

تێکستی ئینگلیزی ئەم کتێبە لەگەڵ گۆڕینی فارسی بڵاوکراونەتەوە، بنوارە (و.ایوانف، مجموعهء رسائل واشعار اهل حق، تهران، ١٩٦٠م – ١٣٣٨ه ش).

- Jardine K.F, Bahdinan Kurmandji, a grammar of the Mosul division and surrounding districts of Kurdistan, Baghdad, 1922.
- Minorsky V., Kurdes-Kurdistan, Encyclopedie de l’Islam, Paris, 1927, vol. II (-K), p.1196-1222.
- Minorsky V,. The Gûrân, A Bulletin of the Oriental and African Studies, University of London, 1943, vol, XI, pt1.
- Pritchard J.B., Ancient Near Eastren Textes, Princeton, 1960.
- Rhea S.A,. Brief grammer and vocabulary of the kurdish language of the Hakkari district, Gournal of Ameican Oriental society, New York, 1872, vol.XI, No:10.
- SafrastiOn A., Kurds and Kurdistan, London, 1948.
- Soane E.B., Grammar of the Kurmanji or kurdish language, Lon-

don,1913.
Soane E.B., Mesopotamia and kurdistan in disguise, London, 1912;
- Soane E.B, Notes on The tribes of southren Kurdistan, Baghdad,1918.
- Taufiq Wahby, The Remnants of Mithraism in Matra and Iraqi Kurdistan and its Traces in Yazidism, London, 1962.
- Yang. T. Cyter, “The Iranian Migration into Zagros”, IRAN vol. v. 1967.

## بەزمانی فرەنسی

- Beidar, L’abbe Poul, Grammair kurde, Paris, 1926.
- Blochet E., Catalogue des Manuscripts, tome II, Paris 1912.
- Cagnac G. petite histoire de le litterature latine, (P.U.F), Paris, 1948.
- Chodsko A., Etuddes Philologiques sur la langue Kurde (dialecte de suleimanie), Journal Asitque, 1857, 5 ser, vol. IX.
- Croiset A.et M., La Litterature Greque, 5 vol. nouv. ed.,Paris. 1951.
- Flaceliene R., Histoire litteraire de la Grece, Paris, 1962.
- Ghellinck J. de, La litterature latine au Moyen- Age, 2 vol. (Bloud et Gay), 1939.
- Glasenapn H.de., les litterature de l’Inde, des origines a l’epoque contemporaine (Payot), Paris, 1963.
- Jaba A., Recueil de notices et recits kourdes, servant a la connaissance de la langue,de la litterature et des tribus du Kourdistan, Spb., 1860.
- Kaltenmark- Ghaequier O., la litterature Chinoise, Paris, 1948.
- Lescot R., Textes Kurdes, paris, 1940.
- Lescot R., Textes Kurdes, Meme Alan, Beyrouth, 1942.
- Minorsky V., Notes sur la secte des Ahle-Haqq “Revue de Monde Musulman”, paris, 1920, vol. XL-XLI, 1921, vol. XLIV-XLV.
- Pirenne J., la Civilisation sumerienne, Lausanne, 1952.
- Poullain Ph., La Litteratue Latine (P.U.F), “Ques aisje”. nouv. ed., 1960.
- Renou L., La litterature de l’Inde, (P.U.F), Paris, 1951.
- Renou L., La poesie religieuse de l’Inde, (P.U.F), Paris, 1942.

## بەزمانی ئەڵمانی

- Bittner M, Die heiligen Bächer der jeziden oder felsandbetter, wien, 1913.

- Hartmann M., Der Kurdische Diwan des Scheich Ahmad von Cezireh ibn ‘Omar ganannt Mala’i Cizri, Berlin, 1904, XI., 222 taf.
- Hornle G., Schneider “Kurz e Beschreibung des Kurden volkes und ihres Landes”, Baseler Magazin für die neueste Geschichte der evangelischen Missions und Bibelsellschaften, 1837.
- Kamal Fuad, Kurdische Handschriften, Wiesbaden, 1970.
- Makas H., Kurdische studien, Heidelberg, 1900; Kurdische Texte im kurmanji Dialekt aus der gegend von Mardin leningran, 1926.
- Makas H., Kurdische texte im kurmanji - Dialecte, Peteresburg. Leningran, 1926.
- Mann O., Die Mundarten der Mukri-Kurden, teil I, Berlin 1906.
- Muller F., Kurmanji Dialekt der kurdensprache, wien, 1864.
- Prym E., Socin A., kurdische sammlungen, im Dialekte des Tur Abdin, St-Petersbourg, 1887.
- Prym E., Socin A., kurdische sammlungen, im Dialekte des Tur Abdin, und Bohtan, St-Petersbourg, 1890.
- Pavrot F., Reize Zum Ararat, T. I. II, Berlin, 1843.
- Socin A., Die sprache der kurden Grundiss der iranischen philologie, Erster Band,Strassbourg, 1901.
Wagner M., Reise nach Persien dem Landen der kurden, Leipzig, 1852.

### بەزمانی ئیتالی

-P. Maurizio Garzoni, Grammatica e vocabolario della lingua kurda. Roma, 1787.

## کتێبە بڵاو کراوەکانی دانەر

١- العدل الاجتماعي (وەرگێڕان لە کوردییەوە بۆ عەرەبی بە ناوی «مفخر» بڵاو کراوەتەوە، بەغدا، ١٩٤٥).
٢- أغاني كردستان، بغداد، ١٩٥٦ (بە زمانی عەرەبی).
٣- کێش و قافیە لە شیعری کوردی دا، بەغدا، ١٩٦٢.
٤- مێژووی ئەدەبی کوردی نوێ، مۆسکۆ، ١٩٦٧ (بە زمانی ڕووسی).
- وەرگێڕانی عەرەبی بە ناوی «موجز تاريخ الادب الكردي المعاصر» لە لایەن دوکتۆر عەبدولمەجید شێخۆ لە سووریا (حەڵەب) لە ساڵی ١٩٩٣ بڵاو کراوەتەوە.
٥- الاكراد - ملاحظات وانطباعات، تأليف ڤلاديمير مينورسكي باللغة الروسية، پيتروغراد، ١٩١٥، ترجمة وتعليق وتقديم، بغداد ١٩٦٨ (بە زمانی عەرەبی).
- چاپی دووەمی لە بێرووت لە ساڵی ١٩٨٧ بڵاو کراوەتەوە.
٦- دوازدە سوارەی مەریوان و پازدە چیرۆکی تری کوردی، مۆسکۆ، ١٩٦٨ (بە زمانی ڕووسی).
٧- بووکە شووشە، چیرۆکێکی کوردییە، بەغدا، ١٩٦٩.
٨- ئەڵەمان کوردی و چەند چیرۆکێکی تری کوردی، بەغدا ١٩٦٩.
٩- عەبدوڵڵا بەگی میسباح - ددیوان، شاعیری گەورەی خاکی موکریان، بەغدا، ١٩٧٠.
١٠- زمان و ئەدەبی کوردی، بۆ پۆلی پێنجەمی قوتابخانەی ئامادەیی، چاپی یەکەم، بەغدا، ١٩٧١ لەگەڵ دوو دانەری تر.
١١- دەستووری زمانی عەرەبی بە کوردی، دانانی عەلیی تەرەماخی سەدەی هەڤدەمی زایین، لێکۆڵینەوە و ساغ کردنەوە و پێشەکی، بەغدا، ١٩٧٧.
١٢- دیوانی نالی و فەرهەنگی نالی، لێکۆڵینەوە و ساغ کردنەوە، بەغدا، ١٩٧٧.
١٣- مخطوطات فريدة ومطبوعات نادرة، دراسات كردية، الجزء الأول، بغداد، ١٩٧٨.
١٤- تاريخ الاستشراق والدراسات العربية والكردية في المتحف الآسيوي ومعهد الدراسات الشرقية في لينينغراد (١٨١٨ - ١٩٦٨)، مقدمة وتعليق وترجمة عن الروسية، بغداد ١٩٨٠.
١٥- الرحالة الروس في الشرق الاوسط، ألفه باللغة الروسية ب. م. دانتسيغ، مقدمة

وتعليق وترجمة عن الروسية، بيروت، ١٩٨١.
١٦- نالی له دەفتەری نەمری دا، بەغدا، ١٩٨١.
١٧- له بابەت مێژووی ئەدەبی کوردییەوە، بەغدا، ١٩٨٤.
١٨- کوردیادە، داستانێکی شیعر ئامێزە، چاپی یەکەم، لەندەن، ١٩٨٥.
- چاپی دووەم، هەولێر، ١٩٩٨.
١٩- گەشتێک بۆ ئەرزەڕۆم، نووسینی ئەلێکساندر پووشکین، پێشەکی و لێکۆڵینەوە و وەرگێڕان لە ڕووسییەوە بۆ کوردی، سۆللەنتونا - سوید، ١٩٩٥.
٢٠- ئەدەبی رووسی و کێشەی پاستیرناک، هەولێر، ١٩٩٩.
٢١- رذاذ الذاكرة، اجتهادات فكرية وأدبية وثقافية في مقابلات صحفية، دمشق، ١٩٩٩.
٢٢- مێژووی ئەدەبی کوردی، بەرگی یەکەم، هەولێر، ٢٠٠١.

# ناوەڕۆک

## کۆتایی

بەرگی یەکەمی ئەم کتێبە کۆتایی هات، ناوەڕۆکی بریتی‌یە لە پێشەکی‌یەکانی
پێویست بە مێژووی ئەدەب و نووسینی مێژووی ئەدەبی کوردی لە سەرەتاوە
تا فەسڵی دووازدەم کە بەناوی «شیعر و ئەدەبیاتی یارسان»ەوەیە
ئەم فەسڵە تا سەدەی شازدەمی خایاندووە بەشێک
لە بابەتەکانی دیکەی «مێژووی ئەدەبی کوردی»
بە گشتی دەکەوێتە بەرگی دووەم کە تۆماری
مێژووەکەیە لە سەدەی (١٥)ەمەوە تا (١٨)م.

***

سوپاس و پێزانین

سوپاس بۆ هەمەوو ئەو مامۆستا و قوتابی‌یانەی یارمەتی‌یان داووم هەر یەکەیان بەپێی توانای زانیاری و هونەری خۆی بۆ ئامادەکردنی ئەم بەرهەمەی لەبەردەست دایە بەتایبەتی حەمە کەریم هەورامی، ئەسکەندەر جەلال، بنیاد خەزنەدار.

# تاريخ الأدب الكردي

يقع كتـاب «تاريخ الأدب الكردي» الوسيط في عدة أجزاء، يتناول تاريخ هذا الأدب منذ ظهوره في نهاية الألف الأول من ميلاد المسيح وحتى أواسط القرن العشرين. وأما الجزء الأول الذي بين أيدينا فهو يشتمل على فصول متنوعة كتمهيد ومقدمات لابد من وجودها في مثل هذه التصانيف، والمقدمات تلك تتناول التعريف بمواطن الكرد وجغرافية بلادهم وكذلك فيها سرد موجز عن تاريخهم والأحداث التي حددت مصيرهم كأمة والحال التي يعيشونها في الوقت الحاضر.

ويتناول الكتاب كذلك التعريف باللغة الكردية وأديان الكرد وحياتهم الأجتماعية والثقافية التي تنعكس في الكتب والمخطوطات والصحافة والنوادي والمنظمات الأجتماعية.

وقد وردت في الجزء معلومات موجزة عن بدايات الأدب في العالم القديم الشرقي والأغريقي، لما قبل التاريخ ولما بعده، ثم يتطرق الى التعريف بالكتب السماوية كنصوص أدبية ممتازة.

وكانت العناية ببدايات الأدب الكردي من ضرورات منهج البحث لذلك كان من الواجب سرد تاريخ النصوص وتحليل محتواها من حيث الشكل والمضمون، ثم كان عرض حياة الرائد الكردي الأول في الأدب القومي بابا طاهر الهمداني (٩٣٧-١٠١٠) ودراسة رباعياته من حيث الشكل والمضمون.

والفصل الأخير من الجزء الأول خصص للأدب الديني عند طائفة أهل الحق الذين نسميهم بـ(يارسان)، وفيه معلومات مفيدة عن الطائفة وأساليب شعرهم التي أميطت اللثام عنها من خلال النماذج الرائعة التي كانت من أبداعات شعرائهم من أمثال پيرشاليار، وشاه خوشين، والسلطان سهاك، وبابا يادگار، وعالي قلندر وغيرهم كثيرين.

ويتناول الجزء الثاني من تاريخ الأدب الكردي الذي نحاول أن يصدر في أقرب فرصة ممكنة القرون الثلاثة التي تسبق القرن التاسع عشر.

أربيل ٢١ مارت ٢٠٠١ — معروف خزنەدار

# The History of Kurdish Literature

The concise “History of Kurdish Literature” that is of some volumes, deals with the history of Kurdish literature since its rise at the end of the first millenia A.D till the mid–twentieth century.

The first volume has various chapters such as a prologue and some introductions which are necessary for such a work. The introductions make acquaintance with Kurdish land and the geography of their country. They also present a brief relation of their history and the events specified their fate as a nation, in addition to their way of life nowadays.

The book also deals with Kurdish language, the religions of Kurds, and their cultural and social life as mentioned in books, manuscripts, media, clubs and social organizations.

In this volume, mention has been made of the beginnings of the literature in Greek and eastern ancient world, pre and post history, then celestial books have been quoted to be excellent literary texts.

It was methodologically necessary to attach enough importance to the beginnings of Kurdish literature,the fact that led to the relation of the history of the texts and analyzing them both in form and content, then the presence of the biography of the first Kurdish vanguard in national literature, Baba Tahir–Hamadani (937-1010) followed by the study of his-quatrains.

The last chapter of this volume is devoted to the religions literature of Ahli–Haq sect known as “Yarsan”. The chapter presents good information about this sect and the style they adopted in their poetry clarified by distinguished texts written by their great poets such as: Peer Shalyar, Shah Khushin, Sultan Suhak, Baba Yadgar, Ali Qalander…. etc.

The second volume of the history of Kurdish literature, that may appear as soon as possible, deals with the period from 17$^{th}$ to 18$^{th}$ centuries.

Arbil 21 March 2001 Marouf Khaznadar